# هەولێر لە نێوان ساڵانی
# (١٩١٨ - ١٩٢٦)دا



ئەهرۆ محەمەد عەبدولقادر



# هەولێر لە نێوان ساڵانی (١٩١٨ -١٩٢٦)دا

## تۆژینەوەیەك لە بارودۆخی رامیاری

**نامەیەکە:**

**پێشکەشی ئەنجوومەنی کۆلێژی ئەدەبیات کراوە لە زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر وەك بەشێك لە پێداویستییەکانی پلەی ماستەر لە مێژووی نوێ و هاوچەرخدا لە ساڵی ٢٠٠٨زاینی.**




**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **هەولێر لە نێوان ساڵانی (١٩١٨-١٩٢٦)دا**
- **نووسینی:** نەهرۆ محەمەد عەبدولقادر
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** رێمان
- **نرخ:** ٥٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم**
- **تیراژ: ٧٥٠** دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٢٦)ی ساڵی ( ٢٠١٢) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٣٦)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# هێما كورتكراوەكان

## یەكەم: هێما كوردییەكان:

س.پ : سەرچاوەی پێشوو

هـ.س : هەمان سەرچاوە

و : وەرگێڕان

ب : بەش، بەرگ

ب.ش : بێ شوێنی چاپ

ب.س : بێ ساڵی چاپ

چ : چاپ

ل : لاپەڕە

ژ : ژمارە

س : ساڵ

## دووەم: هێما عەرەبییەكان:

ص : الصفحة

م.س: المصدر سابق

م.ن : المصدر نفسه

ج : الجزء، الجلد

مج : المجلد

ط : الطبعة

ت : الترجمة

ع :عدد

ق :قسم

س : السنة

د.م : دون مكان الطبع

د.ت: دون تاريخ الطبع

ر : سنة رومية

**سێیەم: هێما ئینگلیزی و تورکیەکان:**

وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی :F.O

وەزارەتی فڕۆکەوانی بەریتانی :Air

وەزارەتی داگیرگاکانی بەریتانی : C.O

سەرچاوەی پێشوو :Op.cit

هەمان سەرچاوە Ibid

بەش(Volume) :(Vol

چاپ Pub (Published):

لاپەڕە P age

لاپەڕە S Sayfa

# ناوەڕۆك

## پێشکەشە بە

**دایك و باوك و خوشك و براکانم**

**هاوسەر و جگەرگۆشەکانم کە زۆر ماندوم کردوون**

**توێژەر**

# سوپاس و پێزانین

- سوپاس و ستایشی بێ پایەن بۆ خودای گەورەو دلۆڤان، کە توانست و دەرفەتی پێدام بۆ ئامادەکردنی ئەم توێژینەوە.

- سوپاسێکی نەپساوە بۆ بەرێز (پ.ی.د.سەعدی عوسمان حوسێن هەروتی) کە ئەرکی سەرپەرشتی کردنی ئەم توێژینەوەی گرتە ئەستۆ و بەسەرنج تێبنیەکانی برستی زیاتر بە توێژینەوەکە بەخشی.

- پێزانینیم بە هەموو ئەو مامۆستا بەرێزانەی کە هەر لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی تا خوێندنی باڵا وانەیان پێ گوتم.

- سوپاسی تایبەتی بۆ ئەو مامۆستا بەرێزانەی کە بەسەرنج و تێبینی و هەواڵ پرسینیان بەسەریان کردمەوە بەتایبەتی(پ.د. موحسین محەممەد، پ.د. ئەرسن موسا، پ.د. عەبدولفەتاح بۆتانی، پ.ی.د. ئیسماعیل شوکر، پ.ی.د. دلێر ئیسماعیل حەقی شاویس، پ.ی.د عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، د.حکیم ئەحمەد مام بەکر، د.قادر محەممەد حەسەن، د.محەممەد کاکەسوور، د.سروە ئەسعەد، د. نازناز محەممەد مەلاقادر، د. عەبدوڵڵا حەداد، م.دڵشاد مەحمود، م. کامەران محەممەد حاجی.

- سوپاس بۆ ئەو بەرێزانەی کە بە شێوەیەك لە شێوەکان هاوکاریان کردووم ( بنکەی ژین بەتایبەتی هەردوو بەرێزان، رەفیق ساڵح و سدیق ساڵح، ئاژانسی هەواڵی پەیامنێر، دەزگای بەدرخان، تاریق جامباز، مومتاز حەیدەری، عوسمان موفتی، ئیحسان موفتی، محێدین تەها، محەممەد تەها، مولود بێخاڵی، میرئال زیلانی، ئەرسەلان رەحمان، رێباز حاجی، عەگید خورشید، جوامێر محەممەد، م.سوزان گەردی.

- سوپاس بۆ هاورێیانم لە قوتابیانی قۆناغی خوێندنی باڵا، بەتایبەتی (ئیسماعیل بازیار، شوان حەمەدەمین تەها، محەممەد سەباح ، ستار شێخ).

-سوپاس بۆ (پ.ی.د.عزالدین محەممەد ئەمین ئیسماعیل) کە لە پوختەی عەرەبی و، (م.هێرش خلیل رواندزی) کە لە پوختەی ئینگلیزیەکە یارمەتیان دام.

- رێزو پێزانینی بێ سنوورم بۆ کارمەندە بەرێزەکانی هەریەك لە کتێبخانەکانی ( زانکۆ و گشتی) هەولێر، سلێمانی، کەرکوك، دهۆك، هەروەها کتێبخانەی کۆلیژی ئەدەبیات و بەشی مێژوو.

# پێشەکی

ئەو تۆژینەوەیە، باسی بارودۆخی ڕامیاری هەولێر دەکات، لە ساڵانی نێوان (١٩١٨-١٩٢٦)دا، هەولێکە بۆ لێکۆڵینەوە لە خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگی مێژوویی، کە ناوچەکە بە گشتیی و هەولێر بە تایبەتی پیایدا تێپەڕی. لەو ماوەیەدا هەولێر لەگەڵ ناوچەکانی دیکەی باشووری کوردستان بە قۆناغێکی هەستیار و چارەنووسساز تێپەڕبوو، تیایدا کۆتایی بە دەسەڵاتی چەند سەدەی عوسمانییەکان هێنراو هێزێکی نوێی داگیرکار هاتە ناوچەکە، کە خۆی لە دەسەڵاتی بەریتانی دەدۆزیەوە. لە ئەنجامی سیاسەتەکانی ئەو دەسەڵاتەو ئەو کاردانەوانەی لێی کەوتەوە، هەولێرو ناوچەکانی دەوروبەری بە ڕەوشێکی مێژوویی گوزەریان کرد، کە بە تەواوی شوێن پەنجەی لەسەر هەلومەرجی داهاتووی شارەکە بەجێهێشت.

دەستنیشانکردنی ئەو بابەتە لە ڕاستیدا بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە دەگمەنی تۆژینەوەی ئەکادیمی تایبەت بەم ماوەیەی مێژووی هەولێر. ئەگەرچی چەند وتارو نووسینێك لەم بوارەدا نووسراون، کە بەشێکی مێژووی هەولێر، یان لایەنێکی مێژووەکەیان خستۆتەڕوو، بەڵام هێشتا زۆر لایەنی مێژووی هەولێر، بە شاراوەیی ماوەتەوە، یان ڕەهەندەکانی بە تەواوی ئاشکرا نەبوون. بۆیە ئەو تۆژینەوەیە هەوڵ دەدات بە پشت بەستن بە سەرچاوەی ڕەسەن، ئەو کەلێنانە پڕبکاتەوە و وێنەیەکی گشتیی بارودۆخی هەولێر بکێشێ لە ماوەی دوای یەکەمین جەنگی جیهانی تا یەکلایی بوونەوەی کێشەی موسڵ. کە لە ڕاستیدا بە ماوەی گواستنەوە دادەنرێت لە نێوان سەردەمی عوسمانی و داسەپانی دەسەڵاتی حکوومەتی عێراق لە باشووری کوردستان دا.

سنووری جوگرافی تۆژینەوەکە تەنیا شاری هەولێرو دەوروبەرەکەی دەگرێتەوە، نەك تەواوی لیوای هەولێر، هەربۆیە لێتۆژ خۆی بەدوور دەگرێت لە باسکردنی وردەکاری ڕووداوی دەڤەرەکانی سەر بە هەولێر، وەك کۆیەو ڕەواندز، مەگەر ئەو ڕووداوانە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە شارەکە هەبێت، کە لەم بارەدا باسیان لێوە دەکات.

تۆژینەوەکە لە چوار بەش پێکدێت؛ بەشی یەکەم تەرخان کراوە بۆ پوختەیەکی بارودۆخی گشتیی هەولێر بەر لە ساڵی ١٩١٨، تیایدا هەوڵ دەدرێت لە سەرەتادا پێگەی جوگرافی شارەکە دیاری بکرێت، لەگەڵ ئاماژەدان بە ڕەوشی ئاوهەواو و پێکهاتەی

خاکەکەی و ژمارەی دانیشتووان، دوادیکەش ڕەوشی ئاوەدانی شارەکە، کە هەموو ئەوانە لە تەوەری یەکەمدا خۆیان دەبیننەوە.

هەرچی تەوەری دووەمی ئەو بەشەیە، بە شێوەیەکی خێرا بارودۆخی هەولێر لە ڕووی سیاسییەوە بەر لە داگیرکاری بەریتانی دەخاتەڕوو، تیایدا چۆنییەتی هاتنی دەسەڵاتی عوسمانی بۆ ناوچەکە، سیاسەتەکانی و ململانێی لەگەڵ هێزەکانی ناوچەکە، کاریگەرییەکانی بۆ سەر هەولێرو کۆتاییەکانی ڕۆژگاری عوسمانی لە هەولێر تا هاتنی دەسەڵاتی بەریتانی، باسیان لێوەدەکرێت. ئاماژەدان بە لایەنی کارگێڕی شارەکە و دابەشبوونی یەکە کارگێڕییەکان، تەوەریەکی دیکەی ئەو بەشە لەخۆدەگرێت، تیایدا بە دیاردەکەوێت، کە هەولێر پێگە و گرنگی خۆی لە دەستداوەو کراوەتە قەزایەکی سەر بە کەرکووك. هەروەها ڕەفتاری فەرمانبەرانی عوسمانی لە شارەکە تیشکی دەخرێتە سەر. هەر لە چوارچێوەی ئەو بەشەدا لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی تەوەریەکی دیکە دەبێت، کە تیایدا ئابووری هەولێر و ڕەوشی کشتوکاڵ، دابەشبوونی زەوییەکان، پەیوەندی جوتیار و خاوەن زەوی، ئاژەڵداری، بازرگانی و پیشەگەری لە شارەکە باسیان لێوەدەکرێت. لە دوای ئەوەش خستنەڕووی ڕەوشی کۆمەڵایەتی، پێکهاتەی ئاینی و ئەتنیکی و چینەکان. هەروەها هۆزەکان و دیاردیکەین بنەماڵەکانی شارەکە، گرنگدیکەیـن ئەو لایەنانە دەبن، کە لە چوارچێوەی دوا تەوەری ئەو بەشە دەخرێنەڕوو.

لە بەشی دووەمیشدا کە لە ژێر ناوی (داگیرکردنی هەولێر لەلایەن بەریتانیاو هەڵوێستی دانیشتووان)ە، باس لە هاتنی بەریتانییەکان بۆ هەولێرو پرۆسەی سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر شارەکە دەکرێت. ئەو بەشە سێ تەوەرە لە خۆدەگرێت، لە تەوەری یەکەم؛ چۆنییەتی هاتنی دەسەڵاتی بەریتانی بۆ هەولێر و کشانەوەی هێزەکانی عوسمانی دەخرێتەڕوو. هەروەها باس لە پیادەکرنی سیاسەتەکانی ئیدارەی بەریتانیا لە شارەکە دەکرێت، کە بەمەبەستی سەپاندنی دەسەڵاتەکەی گرتبویەبەر. دیسانەوە ئەو ڕێوشوێنانە بەدیاردەخرێن، کە بەریتانییەکان لە هەمبەر هۆزەکانی ناوچەکە و کەسایەتییە دیارەکانی هەولێر بەکاریان هێناوە. لە تەوەری دووەمیش هەڵوێستی دانیشتووانی هەولێر بەرامبەر داگیرکاری بەریتانی ئاماژەی بۆ دەکرێت، لەگەڵ ئەو جموجووڵانەی کە بۆ دژایەتی کردنی بەریتانییەکان سەریان هەڵدا، لەوانە ژمارەیەك لە نەیاری ئیدارەی بەریتانی لە دەوری گروپەکەی (ڕەشید ئاغا) و (عەلی پاشا دۆغرەمەچی) کۆبوونەوە، بۆ دژایەتی کردنی

بەریتانییەکان. هەروەها باس لە بارگرژییەکانی نێوان ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لەگەڵ بەشێك لە دزەییەکان دەکرێت، لەگەڵ تیشك خستنەسەر هێرشکردنە سەر قافڵەی ئینگلیز لە هەولێرو دواتر لە سێدارەدانی ئەنجامدەرانی ئەو هێرشە، لە لایەن دەسەڵاتی ئینگلیزەوە. لەلایەکی دیکە ئەو بارگرژیانەی، کە لە ساڵی ١٩٢٠دا ناوچەکەی گرتووەتەوە لە تەوەری سێیەمی بەشی دووەم باس دەکرێن، کە بەهۆی بەرخودانی هۆزەکانی خۆشناو ، سورچی و گەردییەکان دروست بوون، لەگەڵ نائارامییەکان لە ڕەواندزو کۆیە، دواتر لەلایەن ئەو هۆزانەوە هەولێر بە توونددی گەمارۆ دەدرێت و هەڕەشە لەسەر ئیدارەی بەریتانی و خودی ئەفسەری سیاسیی لە هەولێر دروست دەبێت. هەروەها هەوڵ دەدرێت باس لە چۆنییەتی ئارام بوونەوەی ڕەوشەکەو گەڕانەوەی دەسەڵاتی بەریتانی بۆ ناوچە ئازاد کراوەکان بکرێت. لەگەڵ ئاماژەدان بە کەسایەتی و ئەو هۆزانەی، کە پشتگیری و بەرگریان لە مانەوەی دەسەڵاتی بەریتانی دەکرد.

دوای ئەوانە لەژێر ناونیشانی (هەڵوێستی هەولێر لە بەردەم پرۆسەی بە عێراق کردندا)، بەشی سێیەم دەست پێدەکات، لێتۆژ هەوڵ دەدات باس لە سێ تەوەر بکات، تەوەری یەکەم تەرخانکراوە بۆ هەڵوێستی هەولێر لە هەمبەر حکوومەتی کاتی عێراق و دانانی (مەلیك فیسەل)، کە لە ڕێگەی راپرسیەوە دانراوەو چۆنییەتی ساتوسەودایيکردنی ئیدارەی بەریتانی لە شارەکەش روونکراوەتەوە. ئەو سەردانەش باس دەکرێت، کە (مەلیك فەیسەڵ) بۆ یەکەمین جار بۆ شاری هەولێر ئەنجامیدا، کە دەکرێت بڵێین هەنگاوێك بوو بۆ بەرقراربوونی دەسەڵاتی عێراق لە شارەکە. پێکهێنانی ئەنجوومەنی دامەزراندن، وەك یەکەمین دامەزراوەی یاسادانان و چۆنییەتی ئەنجامدان و بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکان لە هەولێر بەشێکی دیکە دەبێت، کە لە تەوەری دووەمی ئەو بەشە باسیان لێوەدەکرێت. لەگەڵ ئاماژەدان بە ئەندامانی هەولێر لەو ئەنجوومەنە و ڕۆڵیان لەو لیژنانەی، کە لە ئەنجوومەنەکە پێکهاتبوون. هەروەها هەڵوێستی نوێنەرانی هەولێر سەبارەت بە کۆمەڵێك پرسی گرنگی ئەو سەردەمە باسیان لێوە دەکرێت؛ وەك کێشەی موسڵ و ئاژاوەکەی شاری کەرکوکی ساڵی ١٩٢٤. لە تەوەریەکی دیکەی هەمان بەشدا باس لە پێگەی هەولێر لە کێشەی موسڵ دەکرێت، تیایدا هەنگاوەکانی هەر یەك لە لایەنی بەریتانی و عێراق لەلایەك و هەوڵەکانی تورکیا لەلایەکی دیکە بۆ ڕاکێشانی سۆزی دانیشتووان باس دەکرێن.

هەروەها  چۆنییەتی هاتنی لیژنەکە و کارەکانی لە هەولێرو هەڵوێستی کەسایەتی و هۆزەکانی هەولێر، سەبارەت بەم پرسە لەم تەوەرەدا دەخرێنە ڕوو.

بەشی چوارەمی ئەو تۆژینەوەیە لەژێر ناونیشانی (پێگەی هەولێر لە بزاڤی رزگاریخوازی کوردیدا)یە، سێ تەوەرە لەخۆدەگرێت، لەدوای یەکەمین جەنگی جیهانی چەندین کۆمەڵەو ڕێکخراوی کوردی نهێنی و ئاشکرا سەریان هەڵدا، کە هەریەکەیان بە شێوازێك هەوڵی دەستخستنی مافەکانی دەدا. لە تەوەری یەکەمی ئەو بەشە هەوڵدراوە رۆڵی کەسایەتییەکانی شاری هەولێر لەم کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییانە بخرێتەڕوو. لە چوارچێوەی سنووری تۆژینەوەکەدا باس لە ڕۆڵی هەولێر لە کۆمەڵە و ڕێکخراوە عێراقیەکان دەکرێت. هەروەها چالاکی جوولەکەکانی هەولێر بۆ پاڵپشتی و پشتگیری لە بزاڤی جوولەکەی جیهانی دەخرێتەڕوو. سەرهەڵدانی بزووتنەوەکانی (شێخ مەحمود)و پەیوەندی هەولێر بەم بزووتنەوانە تەوەریەکی دیکە دەبێت، کە لەم بەشەدا باسی لێوە دەکرێت. هەروەها ئاماژە بە هەڵوێستی کەسایەتییەکانی هەولێر بەرامبەر بە بزووتنەوەکانی شێخ دەدرێت، لەوانە (عەلی مەحمود کاکەخانی دزەیی)، جگە لەمەش رۆڵی (مەلافەندی) و (ئەحمەد عوسمان) دەخرێتەڕوو، کە لە هێورکردنەوەی بارگرژییەکانی نێوان شێخ و ئیدارەی بەریتانی و عێراق بینیوویانە. هاتنی (سمکۆ ئاغای شکاك) بۆ ناوچەی بەحرکەی سەر بە هەولێر، تەوەری سێیەمی ئەو بەشە پێکدەهێنێت، کە تیایدا دیدار و گفتۆگۆکان لەگەڵ (سمکۆ) و ئەو پیلانەی لە دژی (سمکۆ) هەبووە دەخرێنەڕوو. هەر لە هەمان تەوەرەدا باس لە هەوڵەکانی (ئۆزدەمیر پاشا) دەکرێت لە ناوچەکە، کە بە مەبەستی گەڕانەوەی دەسەڵاتی تورکیا خستبوویەگەڕ. هەروەها باس لە هەوڵەکانی دەکرێت بۆ ڕاکێشانی سۆزی سەرۆك هۆزەکانی ناوچەکە، کە بە هۆی ئەو پەیوەندییانەوە لەلایەن ئیدارەی بەریتانی دوو لە دیاردیکەین سەرۆکەکانی دزەیی دوور دەخرێنەوە.

بۆ ئەنجامدانی ئەو تۆژینەوەیە چەندین سەرچاوەی ڕەسەن و بەڵگەنامە بەکارهاتوون، بەڵام گرفتی نەبوونی ئاسایش ڕێگر بوو لە بەردەم سوود وەرگرتنی زیاتر لەو بەڵگەنامانەی، کە لە بەغدا هەن، بەتایبەتی کە هەندێکیان تالان کراون. سەرەڕای ئەوەی لێتۆژ نەیتوانی سەردانی دەرەوەی وڵات بکات، بەتایبەتی دەستی بە ئەرشیفی بەریتانی بگات، کە بێ گومان خزمەتێکی زیادیکەی بە تۆژینەوەکە دەگەیاند.

سەرچاوەکانی ئەو تۆژینەوەیە هەمەچەشن و فرە زمانن. بێگومان بەڵگەنامە فەرمییەکان لە سەرووی ئەو سەرچاوانە دێن لە ڕووی بایەخی مێژووییەوە، لەوانە (دفتر سجل الاساسي طابو لواء اربيل)، کە زانیاریی باشی سەبارەت بە ئاستی ئاوەدانی هەولێر تێدایە، کە بۆ یەکەمین جارە بەکار دەهێنرێت. هەروەها سوود لە چەندین بەڵگەنامەی بەریتانی وەرگیراوە، بەتایبەتی بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی، کە سەرچاوەی گرنگ و پڕبایەخن، بەشێکیان بۆ یەکەمین جارە بەکاردەهێنرێن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بە وردی مامەڵە لەگەڵ زانیارییەکانی نێو ئەو بەڵگەنامانە بکرێت. لەنێو ئەو بەڵگەنامانەدا دەکرێ ئاماژە بە هەندێکیان بکەین، لەوانە (کاپتن مۆری) یاریدەدەری ئەفسەری سیاسیی لە هەولێر لە دووتوێی ڕاپۆرتێکدا لە ساڵی ١٩١٩دا، باسی لە هۆزی دزەیی و ئەو بارگرژییە کردووە، کە لە ساڵی ١٩١٩دا لە نێوان دەسەڵاتی بەریتانی و دزەییەکان هاتۆتە ئاراوە. هەروەها لە ڕاپۆرتێکی دیکەدا، کە ئەفسەری سیاسیی هەولێر (کاپتن های) لەساڵی ١٩٢٠دا بەرزی کردۆتەوە، ڕەوشی شارەکە بەشێوەیەکی گشتیی خراوەتەڕوو. زانیارییەکانی نێو ئەو ڕاپۆرتە گرنگ و پڕ بایەخن.

جگە لەمانە لە هەندێك بەڵگەنامەی مەڵبەندی نیشتیمانی پاراستنی بەڵگەنامەکان لە بەغدا (المركز الوطني لحفظ الوثائق) وەرگیراوە، لەوانە دەقی ڕاپۆرتێکی (صبیح نەشئەت)، کە کوردێکی دانیشتووی هەولێرە و تیایدا زانیاریی لەسەر هەوڵ و کۆششەکانی بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەی موسڵ لە بەرژەوەندیی عێراق دەخاتەڕوو. سوودیش لە بەڵگەنامەی (دار الكتب و الوثائق )ی موسڵ وەرگیراوە.

سەرباری ئەوانە چەندین پەرتووکی بەڵگەنامەیی بەکارهێنراون، وەك پەرتووکی (د.خليل علي مراد، مختارات من كتاب الموصل و كركوك في الوثائق العثمانيية). کە چەندین بەڵگەنامەی عوسمانی لەخۆگرتووە، سەرەتای داگیرکاری بەریتانی بۆ هەولێر و هەڵوێستی دانیشتووان دەخەنەڕوو، بەڵام ئەو زانیارییانە دەبێت بە ئاگاییەوە وەربگیرێن، چونکە زۆر بە لایەنگرییەوە باس لە ڕووداوەکان دەکەن. هەروەها کتێبی (عبدالفتاح البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية)، دەوڵەمەندە بە بەڵگەنامەی گرنگ و هەندێك لەو بەڵگەنامانە پەیوەستن بە هەولێر و سوودی باشی بە تۆژینەوەکە گەیاندووە. بەتایبەتی لە تەوەری پارت و ڕێکخراو و کۆمەڵەکان، کە زانیاریی دانسقەی سەبارەت بە ئەندامانی هەولێر لەو کۆمەڵانە لە خۆگرتووە. لەگەڵ پەرتووکەی (سەلمان

عەلی، کوردستانی عێراق لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا)، ئەوەش چەندین بەڵگەنامەی تێدایە، زانیاریی باش لە بارەی هەولێر دەخاتەڕوو. هەندێ لە کتێبە بەڵگەنامەکانی بەریتانیش بە زمانی ئینگلیزی بەکارهێنراون، کە تیایدا چەندین بەڵگەنامە لە خۆدەگرێت، هەندێکیان ڕاستەخۆ پەیوەندییان بە هەولێرەوە هەیە، وەك (Iraq Administration Reports1914 – 1932).

هەروەها سوود لە تۆمارە حکومییەکان وەرگیراوە وەك: (موسوعة مذكرات المجلس التأسيسي العراقي)، کە یەکێکە لە چاپکراوە حکومییە دانسقەکان، تیایدا ڕۆڵی ئەندامانی ئەنجوومەنەکەی تێدا تۆمار کراوە، نوێنەرانی هەولێریش لە ئەنجوومەنی ناوبراو ڕۆڵیان هەبووە، هەڵوێستیان سەبارەت بە دوا پێشهاتەکانی ئەو کات خراوەتەڕوو. هەروەها سوودیش لە ساڵنامەکانی عوسمانی وەرگیراوە، کە زانیاریی بایەخ داری لەبارەی ڕەوشی هەولێر لە کۆتایی سەردەمی عوسمانی لەخۆگرتووە.

گۆڤار و ڕۆژنامەکانی هاوچەرخی ئەو تۆژینەوە، لایەنێکی دیکەی سەرچاوەکان پێکدەهێنن، کە بایەخێکی یەکجار بەرچاویان هەیە، چونکە لە کاتی خۆیدا باسیان لە ڕووداوەکان کردووە. لەوانە لە هەموویان لەپێشەوە تر، هەفتەنامەی (موصل) ، کە لە کۆتاییەکانی ماوەی فەرمانڕەوایەتی عوسمانی لە موسڵ دەرچووە. زۆرجار ڕووپەڕی ئەو ڕۆژنامەیە بۆ هەواڵی هەولێر تەرخان کرابوو، هەربۆیە ئەو ڕۆژنامەیە بایەخێکی گرنگی هەیە. هەروەها ڕۆژنامەی (العراق)، کە بەریتانییەکان لە دوای داگیرکردنی بەغدا دەریان کرد، بە هەمان شێوە زانیاریی لەسەر ڕەوش و پەرەسەندنەکانی هەولێر بڵاوکردۆتەوە. لەوانە یەکەم سەردانی مەلیك بۆ هەولێر و چۆنییەتی پێشوازیکردنی و ئەو وتارەی کە لە شارەکە پێشکێشی کرد. بە هەمان شێوە ئەو ڕۆژنامانەی لەو سەردەمە لە سلێمانی دەردەچوون، زۆر جار هەواڵیان لەسەر هەولێر بڵاودەکردەوە، لەوانە ڕۆژنامەکانی (ژیان ، ژیانەوە، بانگ کوردستان و ڕۆژی کوردستان).

پاش ئەوانە یاداشتەکان بەشێکی دیکە لەو سەرچاوانەی کە سوودیان لێ وەرگیراوە، دیاردیکەینیان یاداشتەکانی (ڕەفیق حلمی)یە، کە باس لە هەوڵەکانی ئینگلیز لە هەولێر لە دژی (شێخ مەحمود) و چۆنییەتی گەڕانەوەی شێخ لە موسڵ لە دوای کوشتنی (شێخ سەعید)ی باوکی دەکات و زانیاریی لەسەر هەڵوێستی دانیشتووانی هەولێر دەخاتەڕوو. هەروەها (یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی حەفید)یش

باس لە هەڵوێستی هەولێر لە هەمبەر کوشتنی باوکی (شێخ مەحمود)و چۆنییەتی هاتنەوەی شێخ بۆ سلێمانی و تێپەڕبوونی بە هەولێردا دەکات. ئاماژەش بە ڕۆڵی (ئەحمەد عوسمان)ی موتەسەڕیفی هەولێر دەدات لە چارەسەرکردنی کێشەی نێوان (شێخ مەحمود) و لایەنی بەریتانی و حکوومەتی عێراق. لەپاڵ ئەوانە یاداشتەکانی (ئەحمەد خواجە) لە دووتوێی کتێبەکەی (چیم دی) دا، کە دەربارەی هەڵوێستی هەولێر لەبەرامبەر (شێخ مەحمود) و هاتنی نوێنەری کۆمەڵەی زانستی لە سلێمانییەوە بۆ هەولێر زانیاریی لەخۆگرتووە، ئەوەش بایەخی خۆی هەبوو. هەروەها سوودیش لە (یاداشتی عزەدین فەیزی) وەرگیراوە، کە تائێستا بڵاونەکراوەتەوە.

لەپاڵ ئەوانە، کتێب و یاداشتەکانی ئەفسەرانی سیاسیی بەریتانی لە ناوچەکە، بایەخی تایبەتی خۆیان هەیە، چونکە ئەوان هاوسەردەمی ڕووداوەکان بوون، هاوکات بەرپرسی ئەو یەکە کارگێڕیانە بوون، کە لە هەولێر دامەزرابوون، وەك (دەبلیو.ئار.هی، سنتان في کوردستان) و (کاپتن لاین، بیرەوەرییەکانی لاین ). بەڵام دەبێت لێتۆژ بەئاگاییەوە سەودایان لەگەڵدا بکات، چونکە نووسینەکانیان زیاتر لە دیدی خۆیان و بە ئاراستەی بەرژەوەندیی خۆیان نووسیووە. سەرەڕای ئەوەش یاداشتەکەی (های) زۆر بە وردی پرژاوەتە سەر ڕووداوەکانی ساڵانی یەکەمی داگیرکاری بەریتانی(١٩١٨ -١٩٢٠) و چۆنییەتی کارەکانیان و هەڵوێستی کەسایەتی و هۆزەکان و ئەو نائارامییەی هەولێریش دەخاتەڕوو، کە بەخۆیەوەی بینی. دوادیکەش (کاپتن لاین) دەبێتە تەواوکەری ڕووداوەکان، چونکە تا کۆتایی کێشەی موسڵ لە هەولێر دەمێنێتەوە. ناوبراو زانیاریی زۆر باش لەبارەی چۆنییەتی دەنگدان بۆ (فەیسەڵ) و هاتنی (مەلیك فەیسەڵ) بۆ هەولێرو هەڵوێستی (لاین) بەرامبەر بە هاتنەکەی (سمکۆی شکاك) و هەولێر و کێشەی موسڵ و دوایین پێشهاتەکانی ئەو ماوەیە دەخاتەڕوو. ئینجا (ئارنۆڵد ولسن)، کە لەساڵی ١٩٢٠دا وەك حاکمی گشتیی بەریتانیا لە عێراق بۆ یەکەمین جار سەردانی هەولێری کرد، لە کتێبی ( الثورة العراقية)دا، زانیاریی باشی لە هەمبەر ئەو هاتنەو دیدارو کۆبوونەوەکانی لەگەڵ کەسایەتییە دیارەکانی شارەکە باس کردووە، لەوانە ئەو چاوپێکەوتنە دووقۆڵییەی کە لەگەڵ (ئەحمەد عوسمان)ی و (خورشید ئاغای دزەیی) ئەنجامی داوە.

لەوانەش زیاتر هەوڵدراوە هەندێك لە بۆشاییەکانی نێو تۆڤینەوەکە، لە ڕێگەی ئەنجامدانی چەند چاوپێکەوتنێك پڕ بکرێنەوە، کە لەگەڵ ئەوانە ئەنجام دراون، کەسوکاریان

هاوچەرخی ڕووداوەکان بوون و ڕۆڵیان تیایدا هەبوو، ئەوەش لەبەرئەوەی ئەوانەی هاوچەرخی ڕووداوەکان بوون لە ژیاندا نەماون. دەکرێت بڵێین زۆرێك لەو زانیارییانە لەو ڕێگەیەوە دەتوانرێ لە فەوتان دەربازیان بێت، بەڵام لەهەمان کاتیشدا دەبێت بەوردی سەودایان لەگەڵدا بکرێت.

سەرەڕای ئەوانە هەندێك دەستنووس، کە تائێستا چاپ نەکراون و بڵاونەکراونەتەوە سوودیان لێوەرگیراوە، لەوانە (حەسەنە شەل و پەتی قەنارە) کە لەلایەن (جەلال خدر) نووسراوە، زانیاریی باشی لە بارەی کەسایەتی (حەسەنە شەل) و سووتاندنی قافڵەی ئینگلیز لە هەولێر و چۆنییەتی لە سێدارەدانی لەگەڵ دوو لە هاوڕێکانی لەلایەن بەریتانییەکانەوە تێدایە.

نامەی بڵاونەکراوەی زانکۆیی (دکتۆرا و ماستەر) بەشێکی دیکەی ئەو سەرچاوانەن، کە بەکارهێنراون، لەوانە (خليل الاتروشي، كوردستان الجنوبية(العراق) في سنوات الاحتلال و الانتداب البريطانيين). هەروەها (عمار يوسف عبدالله العگيدي، السياسة البريطانية تجاه عشائر العراق ١٩١٤ -١٩٤٥ کە تیایاندا باس لە نائارامییەکانی ساڵی ١٩٢٠ی هەولێر دەکرێت).

سەرچاوە کوردییەکانیش بەشێکی دیکەی کۆی ئەو سەرچاوانە پێکدەهێنن، کە لە تۆژینەوەکەدا سوودی باشیان لێوەرگیراوە، لەوانە ئەو کتێبەی بە بۆنەی سەد ساڵەی دامەزراندنی شارەوانی هەولێر دەرچووە بە ناوی (هەولێر)، چونکە زانیاریی بایەخداری سەبارەت بە شارەکە لە خۆگرتووەو ناکرێت ئەوانەی باس لە مێژووی ئەو شارە دەکەن دەستبەرداری بن. هەروەها پەرتووکی (هادی رشید چاوشلی، هەولێر لەگەڵ کاروانەی فەلك)یش زانیاریی باشی سەبارەت بە ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی شارەکە تێدا باس کراوە. سێ بەرگەکەی (هەولێرم وادیوە و.. وا بیستوە)ی (مەولود بێخاڵی)یش، کە باس لە دیاردیکەین بنەماڵەکان و پیشەکارەکان و هەندێ ڕووداوە سیاسییەکانی هەولێر دەکات بایەخی خۆی هەیە، بە تایبەتی کە نووسەر زانیارییەکانی پاڵپشت بە دیمانە و ئەزمونی دەوڵەمەندی خۆی نووسیووە.

هەروەها پەرتووکە عەرەبییەکان وەك دانراوەکانی مێژوونووسی عێراق (عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی) لە دەوڵەمەندکردنی ئەو تۆژینەوەیە سوودیان لێوەرگیراوە، لەوانە (احداث عاصرتها)، (تاريخ الاحزاب السياسية العراقية)، (تاريخ العراق السياسي الحديث)،

(تاريخ الوزارات العراقية)، (العراق في دوري الاحتلال و الانتداب)، كه هەموو ئەوانە زانياريى بايەخداريان لەسەر هەڵوێستی هەولێر سەبارەت بە پێشهاتە سیاسییەکان تێدایە، لەوانە دانانی (مەلیك فەیسەڵ) و کێشەی موسڵ و ئەنجوومەنی دامەزراندن و چەند بابەتێکی دیکەی ئەو قۆناغەی مێژووی هەولێر. بێگومان پەرتووکەکانی (د.كمال مظهر احمد)یش وەکو (دور الشعب الكردي في الثورة العشرين العراقية)، (كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى)، (كركوك وتوابعها)، زانياريى بايەخداريان تێدایە سەبارەت بە ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٢٠ و ڕەوشی کوردستان و هەولێر لەماوەی یەکەمین جەنگی جیهانیەوە. لە پەرتووکی سێیەمیان پاڵپشت بە چەند بەڵگەنامەیەك باسی پەیوەندییەکانی هەولێری بە بزووتنەوەکانی (شێخ مەحمود) کردووە. بەرهەمەکانی (زوبێر بیلال ئیسماعیل)یش بە تایبەتی (اربيل في ادوارها التاريخية) کە باس لەماوە جیاجیاکانی مێژووی شارەکە دەکات، تا هاتنی دەسەڵاتی بەریتانی لە چەندین جێگە بەکارهاتووە. بە هەمان شێوە پەرتووکەکانی (هادی رەشید چاوشلی) لەوانە (تراث اربيل التاريخي)، کە تیایدا هەڵوێستی دانیشتووان لەهەمبەر ئیدارەی بەریتانی و ڕەوشی هەولێر دیاری دەکات، زۆر بەکار هاتووە.

جگە لەمەش لێتۆژ سوودی لە چەندین سەرچاوەی ئینگلیزی وەرگرتووە، کە بایەخیان لە سەرچاوەکانی دیکە کەمتر نییە، لەوانە:

)A.L.Haldane, The Insurection Mesopotamia, Mudros TO Lausanne: Britishs Frontiers in West Asia)“ (J.C Hurewitz,Diplomacy in the Near and Middle East ).

هەروەها چەند سەرچاوەیەکی عوسمانی سوودیان لێوەرگیراوە، بەتایبەتی بۆ باسی ڕەوشی هەولێر لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا، لەوانە:(شمس الدين سامي، قاموس الاعلام) . الدستور(مجموعة القوانين و التنظيمات العثمانيية المنشورة باللغة العربية باسم الدستور). ئەو سەرچاوەیە زانیاریی باشی لەبارەی ئیدارە و لایەنی کارگێری دەوڵەتی عوسمانی لەخۆگرتووە.

وتار و تۆژینەوەکانی نێو گۆڤارەکانیش سوودی بەرچاویان بەم تۆژینەوەیە بەخشیوە، بەتایبەتی وتارەکانی گۆڤاری هەولێر، کە (١٧) ژمارەی لێ دەرچووە، تیایدا زانیاریی مێژوویی گرنگ لەبارەی شارەکە بڵاوکراوەتەوە، لەوانە: (سەید بەرزۆ ئەلنەقیب

ئەلڕوفاعی، خانەوادەی هەولێر)، (د.عەبدوڵا حەداد، مەلا عەلی ئەفەندی هەولێری و کۆمەڵەی تەعالیساڵی ١٩١٨). بەڵام دەبێت لێتۆژی ئاکادیمی بە ئاگەییەوە سەودایان لەگەڵدا بکات، چونکە هەندێکیان لە زێدەڕۆیی بێ بەش نین. هەروەها سوودیش لە هەندێ سەرچاوە وەرگیراوە، کە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراونەتەوە. سەرەڕای ئەوانە چەندین سەرچاوەی دیکە لەم تۆژینەوەیە بەکار هاتوون، کە لە لیستی سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ کراوە.

# تەوەری یەکەم

# هەلومەرجی جوگرافی

هەولێر[١] لە ناوەڕاستی دەشتاییەکی فرەواندا هەڵکەوتووە، کە دەکەوێتە نێوان هەردوو زێی گەورە و بچوکەوە، نێزیکەی (٨٧) کیلۆمەتر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری موسڵ و (٩٦) کیلۆمەتر لە باکووری شاری کەرکووك و (٧٦) کیلۆمەتر لە کۆیە دوورە[٢]. ئەو شارە کە لە کۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانی قەزایەکی پێکدەهێنا، سنوورەکەی بەم شێوەیە دیاری دەکرا. لە لای باکووری قەزای ڕەواندز بوو، کە ڕووباری بەستۆڕە هێڵی نێوان هەردوولا بوو، لە باشووری ڕۆژهەڵاتیش هەریەك لە قەزاکانی کۆیەو ڕانییە هەبوون، لە باکووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش لە نێوان موسڵ و هەولێر زێی گەورە هێڵی جیاکەرەوە بوو، لەباشووری ڕۆژئاواش ناحییەی پردێ (ئاڵتوون کۆپری) هەبوو[٣].

هەولێر لەڕووی پێگەی ئەستڕۆنۆمییەوە، دەکەوێتە سەر هێڵی درێژی ("٥٨ ٥٦°٤٣) و ("٥٦ ٣١ °٤٤)و بازنەی پانی ( "٥٣ ٧ °٣٦ و ("٢٣ ١٤ °٣٦)[٤]، کە ئەوەش کاریگەری باشی کردۆتە سەر کەش و هەواکەی لە ڕووی بەرهەمهێنانی

(١) - سەبارەت بە ڕەگوڕیشەی ناوی هەولێر بۆچوونی جیاواز هەیە، لەم بارەیەوە بڕوانە: دائرة المعارف الاسلامية، مج١، القاهرة، ١٩٣٣، مادة: اربيل( بسترك)، ص٥٧٠" جمال بابان، اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، ط٢، بغداد ،١٩٨٩، ص ١٧.

(٢) - هاشم خضر الجنابي، مدينة اربيل/ دراسة في جغرافية الحضر، ط١، موصل ١٩٨٧، ص ١٧- ٢٠" عبدالباقي عبدالجبار امين، التجديد الحضري لقلعة اربيل/ دراسة اجتماعية- اقتصادية و عمرانية، ط١، مطبعة جامعة الموصل، موصل،١٩٨٥، ص٥٧.

(٣) - شمس الدين سامي، قاموس الاعلام، مج ٢، مهران مطبعة سي، استانبول ١٣٠٦ رومي/ ١٨٨٩م، ص ٨٢١" سالنامة ولايت الموصل، ١٣١٢هـ،موصل ولايتي مطبعة سنده باصلمشدر، ص ٣١٩" فەیسەڵ دەباغ (وەرگێڕان)، کوردستان لە چاپکراوە عوسمانلییەکاندا، چ١، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل١٧.

(٤) - هونه ر عبدالله كاك احمد، تغير استعمالات الارض في مدينة اربيل (١٩٨٥ -٢٠٠٤) رسالة ماجستير، كلية الاداب/ جامعة صلاح الدين- اربيل، ٢٠٠٦، ص ٧.

کشتوکاڵەوە[1]. بە شێوەیەکی گشتیی ئاو و هەواکەی لەژێر کاریگەری ئاو و هەوای دەریای ناوەڕاست دایە[2]، کە هاوینی وشك و گەرمە و باران بارینیش وەرزیەو زیاتر لە نیوەی زستانی ساڵدا دەبارێت[3].

خودی شارەکەش بریتیە لە دەشتاییەکی مام ناوەند، ڕووەکەی بەرزونزمی تێدایەو ناسراوە بە دەشت، کە ناوچەیەکی گوازراوەیە لە نێوان ناوچەی چیا سادەکان لە باکوورو ناوچەی دەشتە تەختەکان لە باشووری ڕۆژئاوا[4]، بەواتایەکی دیکە بەشی باشوورو ڕۆژئاوای شارەکەش هەر بە دەشت دەورە دراوە[5].

ئەو دەشتە کە لە باکوورەوە دۆڵی بەستۆڕە و لە ڕۆژهەڵاتەوە دۆڵی شەلغەو لە باشووریەوە زێی بچوك دەورەیانداوە، لە باکووری ڕۆژئاواو ڕۆژئاوایشیەوە زێی گەورە هەیە. (٣٠٠ — ٥٠٠ م) لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزەو درێژییەکەیشی (٨٥) کیلۆمەترو پانییەکەی (٣٥) کیلۆمەترەو ڕووبەرەکەشی نزیکی (١٩٩٠٠٠٠) دۆنمە[6].

دەشتی هەولێر لە حەوزێکی فرەوان پێکهاتووە، کە داپۆشراوە بە نیشتەنی زبر و قوڕ و چەو و لم، ڕووەکەشی بەرز و نزمە و دۆڵێکی تەسکیشی هەیە بۆ دابەشکردنی ئاو لە نێوان

---

(١) - هاشم الجنابی، م.س، ص ٢٠.

(٢) - ازاد محمد امين النقشبندي، مناخ اقليم كردستان العراق، متين"مجلة"،ع (٦٤)، دهوك، ١٩٩٧، ص ١٠١.

(٣) -سلێمان عەبدوڵڵا ئیسماعیل، تایبەتمەندییەکانی باران لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ١١٩.

(٤) - فاطمە قادر مصطفی، شیکردنەوەیەکی جوگرافی بۆ دابەشبوونی دانیشتوان و کاریگەری لەسەر نەخشەی بنەڕەتی شاری هەولێر، نامەی ماستەر، کۆلیژی ئاداب/زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٩.

(٥) - كوردن هستز، الاسس الطبيعة لجغرافية العراق، ت:جاسم محمد الخلف، ط١، بغداد، ١٩٤٨، ص ٣٧.

(٦) - محمد عبدالله اللهوني، التحليل الجغرافي للاستيطان الريفي في اقليم كوردستان/ دراسة تطبيقيه لمحافظة اربيل، اطروحة دكتوراه، كلية الاداب/ جامعة صلاح الدين- اربيل، ٢٠٠٢، ص ص ٥٣ — ٥٥.

زێی گەورە و بچووكدا[1]. ئەو ناوچە دەشتاییە دەرفەتی فرەوانكردن و ئاوەدانكردنەوەی شارەكە دەڕەخسێنیٚ، هەروەها خودان ئاوی ژێر زەوی و پێدەشتێكی كشتوكاڵی بەپیتە[2].

بەرزاییەكانی قەرەچوغ، كە زنجیرەیەكە لە زورگ و تەلان، دەكەوێتە رۆژئاوای ئەو دەشتە، نێزیكەی (٥٠) كیلۆمەتر لە خاڵی بەیەك گەیشتنی زێی بچووك و ڕووباری دجلە دوورە. بەرزیەكەیان دەگاتە (٨٧٤,٥) مەتر لەسەر ئاستی دەریا، دواتر بەرەبەرە ئەو زنجیرەیە بەرەو باكووری ڕۆژهەلاّت شۆڕدەبێتەوە، تا دەگاتە نێزیكەی (٣٠٠) مەتر لەسەر ئاستی دەریا لەلای شارۆچكەی گوێڕ، كە دەكەوێتە سەر زێی گەورە. لە ڕۆژهەلاّتی (قەرەچوغ)یش لە ڕووی لێژ بوونەوە، ناوچەكە دەبێتە دوو بەش" بەشی باكوور بەرەو زێی گەورە شۆڕ دەبێتەوە و پێی دەگودیكەیت (دەشتی شەمامك)، بەشەكەی باشووریش پێی دەگودیكەیت (دەشتی كەندێناوە). هەردوو بەشەكەش بە چەند زورگ و بەرزاییەكی بچووك لە دەشتی هەولێر جیادەبنەوە، پێیان دەگودیكەیت (زوورگەزراو). (دەشتی كەندێناوە)ش دەكەوێتە نێوان (قەرەچوغ) و (زوورگەزراو)، كە (٢٣) كیلۆمەتر پانی و (٥٠) كیلۆمەتر درێژیەكەیەتی، بەلاّم تەپۆلكەكانی (زوورگەزراو) زنجیرەیەكن لە باسك و تەلان، لەلای باشووری ڕۆژئاوا (كەندێناوە) لە دەشتی هەولێر جیادەكەنەوە. لەلای ڕۆژهەلاّتیشەوە دۆڵی (بەستۆڕە)و (چیای دێدەوان) سنووری ئەو دەشتەن، (چیای دێدەوان) بەرزییەكەی (١٢٤٥) مەترە لە ئاستی ڕووی دەریا و لە باكووریشەوە هەردوو چیای پیرمام و سەفین كە (١٤٧٥) مەتر لە ئاستی رووی دەریا بەرزن، سنووری ئەو دەشتەن[3].

شاری هەولێر لە دوو بەشی سەرەكیی پێكهاتووە، قەلاّو خوارەوەی قەلاّیە، كە ئەوەی دوایی (كورتەك)ی پیٚ دەگوترا[4]. قەلاّ دیاردیكەین و دێریندیكەیەن هێمای شاری هەولێرە، دەكەوێتە نزیك ناوەڕاستی شارەكە، تێكڕای بەرزیەكەی لە ئاستی ڕووی دەریاوە

(١) - شاكر خصباك، العراق الشمالي/ دراسة لنواحيه الطبيعية و البشرية، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٣، ص٤٢.

(٢) - خليل اسماعيل محمد، اربيل/ دراسات ديموغرافية — اقتصادية، اربيل، ٢٠٠٣، ص ٨٦.

(٣) - د.هاشم الجنابي، م.س، ص ١٧.

(٤)- فەیسەڵ دەباغ، چەند زانیارییەكی دەگمەن لەبارەی ویلایەتی موسڵ لە ساڵانی ١٨٨٧ -١٨٩٤دا، هەولێر"گۆڤار"، ژ(٤)، پایزی ١٩٩٩، ل ١٢٦.

نێزیکەی (٤٣٥)مەترە، لە ئاستی ڕووی شارەکەش (٢٥) مەتر بەرزە[١]. قەڵا لە سێ گەڕەکی سەرەکیی ( سەرای، تۆپخانە، تەکییە)پێکهاتووە[٢]:

١- سەرای: ناوەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە زۆرینەی دامەزراوە فەرمییەکانی دەوڵەتی لێبوو[٣]، ژمارەی ماڵەکانی ئەو گەڕەکە بەپێی ئاماری ١٩٢٢ لە (١٧٦) ماڵ پێکهاتووە[٤] و تا ساڵی ١٩٢٩ نێزیکەی (٣٢٨) یەکەی نیشتەجێبوونی تێدابوو[٥].

٢ – تۆپخانە: لەساڵی ١٩٢٢ لە (١٣٢) ماڵ پێکهاتووە[٦]، بەڵام لە ساڵی ١٩٢٩دا زیادی

---

(١) - ساكار بهاألدين عبدالله ال مدرس، الانماط السكنية في مدينة اربيل/ دراسة تحليلية في جغرافية المدن، رسالة ماجستير، كلية الاداب/ جامعة صلاح الدين- اربيل ، ٢٠٠٣، ص ١٣" سەرچاوەیەکی دیکە بەرزییەکەی لە ئاستی دەریاوە بە ٤٤٥م و لە ئاستی شارەکە ٢٦.٢٥م داناوە بڕوانە: عبدالباقي الحيدري، م.س، ص٦٤" سەرچاوەیەکی دیکەیش بەرزی شارەکە بە (٤٠٩)م لە ئاستی ڕووی دەریاوە داناوە. ازاد جلال شريف، مناخ منطقة اربيل/ دراسة مقارنة في المناخ المحلي، اطروحة دكتوراه، كلية الاداب/ جامعة صلاح الدين- اربيل، ١٩٩٨، ص٩٥. بەڵام پێ دەچێت بۆچونی یەکەم (ساکار بەهادین) ڕاست بێت، چونکە ناوبراو ئامێری پێشکەوتووی (GPS)ی بۆ ئەم بوارە بەکارهێناوە.

(٢) - بڕوانە: تاریق جامباز و نەژاد بەرزنجی، لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی ئاماری دانیشتووانی قەڵاتی هەولێر ١٩٢٢ سەرای – تەکیە – تۆپخانە،، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٦ " موصل"جريدة" (ولايتك هفتةده بردفعة نشراولنور جريدة رسمية سيدر)، نومرو(٧٤٠)، ٧محرم سنة ١٣٢٢هـ – ١١ مارت سنة١٣٢٠ر" نومرو(٧٣٥)، ٢ذي الحجة سنة ١٣٢١ هـ – ٥شباط ١٣١٩ر" نومرو(٧٥٣) ١جمادي الاول سنة ١٣٢٢ هـ– ١تموزسنة ١٣٢٠ر.

(٣) - شێرزاد قادر، ناو لە شاری هەولێر، باسێکە بڵاوکراوەتەوە لە پەرتووکی: هەولێر/ لە یادی سەد ساڵەی دامەزراندنی شارەوانی هەولێر ١٨٨٥ -١٩٨٥، چ١، بەغدا، ١٩٨٥، ل ١٢٨ " جلال عبدالجبار المختار، اربيل كما عرفتها.( دەستنووسێکە دانە ڕەسەنەکەی لە لایەن مەولود بێخاڵی پارێزراوە و لێتۆژێش دانەیەکی لەبەر گرتووە( ص٧.

(٤) - تاریق جامباز و نەژاد بەرزنجی، س.پ، ل ل ٦٣- ٨٨.

(٥) - بەڕێوەبەرایەتیی تۆمارکردنی خانووبەرەی هەولێر/١، دفتر سجل الاساسي طابو لواء اربيل، محلة سراي.

(٦) - تاریق جامبازو نەژاد بەرزنجی، س.پ، ل ل ١٤٠- ١٦٢.

کردووە بۆ (١٦٠) ماڵ[١].

**٣ – تەکییە: لە ساڵی ١٩٢٢دا (٢١٢)ماڵی لەخۆگرتووە[٢] و لە ساڵی ١٩٢٩ لە (٢٥٢) خێزان پێکهاتووە[٣].**

گەڕەکەکانی خوارەوەی قەڵا (کورتەك)یش، بریتی بوون لە: خانەقا، عەرەب، تەعجیل[٤]و سەعدوناوە:

**١ – خانەقا: یەکەم گەڕەکی خوارەوەی قەڵایە، کە دروست کرابێت، مێژووی بۆ سەردەمی ئەتابەگییەکان (١١٢٨ -١٢٣٣ز) [٥] دەگەڕێتەوە، ناوەکەشی بۆ خانەقایەك دەگەڕێتەوە کە کەوتۆتە ڕۆژئاوای گەڕەکەکە[٦].**

**٢- عەرەب: سنووری ئەو گەڕەکە لە پشت باڵەخانەی موتەسەڕیفییەی کۆنەوە[٧] دەستی پێدەکرد، تا بازاڕی گەورە بەدرێژایی، بەڵام بە پانی لە لێواری مزگەوتی (شێخی چۆلی)ەوە دەهات تا گەڕەکی تەعجیل[٨].**

---

(١)- بەڕێوەبەرایەتی تۆمارکردنی خانووبەرەی هەولێر/١، دفتر سجل الاساسي طابو لواء اربيل، محلة توبخانة.

(٢) - تاریق جامبازو نەژاد بەرزنجی، س.پ، ل ل ٩٤- ١٣٢.

(٣) - بەڕێوەبەرایەتی تۆمارکردنی خانووبەرەی هەولێر/١، دفتر سجل الاساسي طابو لواء اربيل، محلة تەكية.

(٤) - موصل"جريدة"، نومرو(٧٠٠)، ٢٩ صفر سنة ١٣٢١هـ – ٣ مايس سنة ١٣١٩ ر" نومرو (٧٤٠)، ٧محرم سنة ١٣٢٢ هـ – ١١ مارت سنة ١٣٢٠ر" نومرو(٧١٥)، ٢جمادي الاخر سنة ١٣٢١هـ – ١٤ ايلول سنة ١٣١٩ر" نومرو(٨٠٢)، ٢٦ رمضان سنة ١٣٢٣هـ -١٠ تشرين ثاني سنة١٣٢١ر.

(٥) - لە بارەی سەردەمی ئەتابەگییەکان لە هەولێر بڕوانە: د.محسن محمد حسين، اربيل في العهد الاتابكي ٥٢٢-٦٣٠هـ/١١٢٨ -١٢٣٣م/ اوضاع اربيل السياسية اقتصادية و العسكرية و الادارية والثقافية في العهد الاتابكي، مطبعة سعد، بغداد، ١٩٧٦م.

(٦) -د.هاشم الجنابی، م.س، ص ٧٥.

(٧) - موتەسەڕیفیەی کۆن ئێستە باڵەخانەی قائیمقامیەتی هەولێرە، کە لە بەرامبەر پارێزگای هەولێر دایە.

(٨) - مولود بێخاڵی، س.پ، ب١، ل ٤٦.

٣ —تەعجیل: دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای قەلاّ بە ئاراستەی باشووری گەڕەکی عەرەب[١]، یان نێوان گەڕەکی سەعدوناوەو گەڕەکی عەرەب. زۆرینەی دانیشتووانی جوولەکەو هەندێکیان ئیسلام بوون، هەربۆیە بۆ دووبەش دابەشکرابوو: تەعجیلی ئیسلام و تەعجیلی جولەکان، وە تاکو سالّی ١٩٢٩ تەعجیلی ئیسلام (١٧٢) مالّ و تەعجیلی جولەکانیش (١٥٤) مالّ بوو[٢].

٤ ـ سەعدوناوە: دەکەوێتە تەنیشت گەڕەکی تەعجیل، دانیشتووانەکەی زۆرینەیان بە کاری کورەچێتییەوە خەریك بوون[٣]، لە سالّی ١٩٢٩ ناوی لە تۆماری بنەڕەتی تاپۆی هەولێر هاتووە، (٨٤) یەکەی نیشتەجێبوونی تێدابوو[٤].

سەبارەت بە ژمارەی دانیشتووانی هەولێر، لە ڕاستیدا ئامارێکی ڕاست و دروست لەبەردەستدا نییە، بۆیە دەبێ پەنا ببەینە بەر ئەو مەزەندە و خەملاّندنانەی، کە لە ماوەی جیاجیا کراون" بە پشت بەستن بە هەندێ زانیاریی گەڕیدەو سەرچاوەی تر، ژمارەی دانیشتووانی هەولێری لە سالّی ١٨٣٧ لەنێوان (٤٥٠٠ — ٥٠٠٠)کەس داناوە، لە سالّی ١٨٤٧دا ژمارەکە گەیشتووەتە (٥٠٠٠ — ٦٠٠٠) کەس[٥]. بە گوتەی هەندێکی دیکە لە سالّی ١٩١٦دا ژمارەی دانیشتووان خۆی لە (١٠٠٠٠) کەس دەدا[٦]، کە بەم پێیەش گەشەی دانیشتووان لە سالّی ١٨٤٧ تا سالّی ١٩١٦ بەڕێژەی ١.٥٪ لە سالێکدا زیادییکردووە [٧]. ئەفسەری سیاسیی بەریتانی (کاپتن های) لەماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆی

---

(١) - محمد عبدالغفور، فولکلور اربیل او تراثها الشعبي، کاروان"مجلة"، ع(٦١) کانوون الاول، ١٩٨٧،ص ١٣٧.

(٢) - بەڕێوەبەرایەتی تۆمارکردنی خانووبەرەی هەولێر/١، دفتر سجل الاساسي طابو لواء اربیل، محلة تعجیل الاسلام" دفتر سجل الاساسي طابو لواء اربیل، محلة تعجیل الیهود.

(٣) - شێرزاد قادر، س.پ ، ل ١٣١.

(٤) - بەڕێوەبەرایەتی تۆمارکردنی خانووبەرەی هەولێر/١، دفتر سجل الاساسي طابو لواء اربیل محلة سعدوناوە.

(٥) - د.خلیل اسماعیل ، م.س، ص ١٠٨.

(٦)- ساکار بهاالدین ، م.س، ص٥١" عبدالباقي عبدالجبار امین، م.س، ص٧٣.

(٧) - د.عمادەدین عومەر حەسەن، پێداویستەکانی ئاو بۆ شاری هەولێر تا سالّی ٢٠٢٥، هەولێر"گۆڤار"،ژ(٥) زستانی ٢٠٠٠، ل ٧.

له هەولێر( ١٩١٨ — ١٩٢٠) دانیشتووانی هەولێری بە (١٤) هەزارکەس خەملاندووە[١].
دیارە ئەو خەملاندنەش لە ڕاستیەوە نزیکە، چونکە سەرچاوەیەکی دیکە بە پشت بەستن بە تۆمارەکانی خانووبەرە، ژمارەی دانیشتووانی لە ساڵی ١٩١٩دا بە (١٤٥٠٠) سەر داناوە[٢]. بەپێی سەرچاوەیەکی دیکەش ژمارەی دانیشتووانی شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٢٧ بەوانەی ناویان نووسراوە و ئەوانەی خۆیان لە ناونووسین دزیوەتەوە، نێزیکەی (٢٥) هەزار کەس بوون[٣].

له بارەی ئاستی ئاوەدانی هەولێر لە (ساڵنامەی موسڵ)ی ساڵی١٣٣٠ك (١٩١١ — ١٩١٢ز) دا هاتووە، کە لەم شارەدا (١٢) مزگەوت و (٥) مەدرەسەی ئاینی و (٤) تەکیە وخانەقاو (٥) قوتابخانەی سەرەتایی(سبیان مکتبلری)، (١) قوتابخانەی ناوەندی (روشدییە) و سەرای حکوومەت و بەندیخانەیەك هەبوو. هەروەها (١٨٢٢) خانوو و (٦٣٧) دوکان[٤] ، (٦)خان ، (٣) گەرماو ، (٢٣) حەسار، (٨) باغ ، (١٥٤٦) بێستان ، باخچە هەبوون[٥].
هەرچەندە ئەو ئامارانە لەوانەیە وورد نەبن، بەلاّم بۆ وێناکردنی ئاوەدانی هەولێر، لە ماوەی تایبەت بەم تۆژینەوەیەدا بەکەڵکن.

(١) - دبليو.ار. هي، سنتان في كردستان، ت: فؤاد جميل، ج١، ط١، بغداد، ١٩٧٣، ص ٤٢.
(٢) - هاشم الجنابي، م.س، ص ٢٧.
(٣) - هادی رشید چاوشلی، هەولێر لەگەڵ کاروانەی فەلك، چ١، بەغدا، ١٩٨٧، ل ل ١٢ — ١٣.
(٤) - لەساڵی١٩٢٩ژمارەی دوکانەکان بەرزبووەتەوە، بۆ ٧٤٧ دوکان. بەڕێوەبەرایەتی تۆمارکردنی خانووبەرەی هەولێر/١،دفتر سجل الاساسي طابو لواء اربيل، سوق اربيل.
(٥) - موصل ولايتي سالنامة رسميسيدر، ١٣٣٠هـ/ ١٩١١- ١٩١٢م ، ص ٢٧٨.

# تەوەری دووەم

## پوختەیەکی مێژووی هەولێر بەر لەساڵی ١٩١٨

هەولێر هەرچەندە شارێکی دێرین و کۆنە[١] و لە چاخەکانی ناوەڕاستیشدا، بە تایبەتی لە سەدەکانی دوازدە و سێزدەهەمی زاینیدا شارێکی گەشاوەبووە و ڕۆڵێکی شارستانی بەرچاوی هەبوو[٢]، بەڵام لە سەردەمی عوسمانییەکان ئەو بایەخەی نەما" سەرەتای پەیوەندی هەولێر بە دەوڵەتی عوسمانی دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی دوای شەڕی چاڵدێران[٣]. لە دوای ئەو شەڕەدا، کاتێك میرە کوردەکان شکستی دەوڵەتی سەفەوییان وەك دەرفەتێك قۆستەوە و ئەو ناوچانەیان گەڕاندەوە ژێر ڕکێفی خۆیان، کەپێشتر لێیان زەوتکرابوو،

(١)- لە بارەی قۆناغەکانی مێژووی کۆنی هەولێر بڕوانە: طه باقرو فؤاد صفر، المرشد الى مواطن الاثاروالحضارة، الرحلة الخامسة، بغداد، ١٩٦٦" زبير بلال اسماعيل، اربيل في ادوارها التاريخية، النجف، ١٩٧٠" د.جمال رشيد، دراسات كردية في بلاد سوبارتو، ط١،بغداد، ١٩٨١.

(٢) - لەم بارەیەوە بڕوانە: د.محسن محمد، م.س.... " علي عادل حسين، اربل في الفترة (٦٣٠- ٨٧٤هـ/ ١٢٣٣ - ١٤٦٩م)/ دراسة سياسة حضارية، اطروحة دكتوراه، كلية الاداب/جامعة صلاح الدين- اربيل، ٢٠٠٦" احمد عبدالعزيز محمود، الامارة الهذبانية الكردية، ط١، اربيل، ٢٠٠٣.

(٣) - ئەو شەڕە بوو کە لە نێوان سوپای عوسمانی بە سەرۆکایەتی سوڵتان سەلیمی یەکەم و سەفەوییەکان بە سەرۆکایەتی شا ئیسماعیلی یەکەم لە ٢٣/ ٨ / ١٥١٤ لە دەشتی چاڵدێران ڕوویدا، کە تیایدا عوسمانییەکان سەرکەوتنی گەورەیان بەدەستهێنا. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:د. سعدي عثمان حسين هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية/ دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان ١٥١٤ - ١٨٥١م، ط١، مؤسسة موكرياني للبحوث و النشر في اربيل، مطبعة خاني (دهۆك)، ٢٠٠٨، ص ص ٣٩- ٤٣.

(سەیدا بەگی کوڕی شاعەلی) میری سۆرانیش هێزەکانی سەفەوی لە هەولێر و کەرکووك بە دەرنا[1].

لەبەرئەوەی سۆرانیش لەنێو ئەو میرنشین و ناوچە کوردییانە دابوو، کە لە دوای شەڕی ناوبراو دەسەڵاتی عوسمانیان قبوڵکرد[2]، بۆیە دەتوانین بڵێین هەولێریش لەم ماوەیەدا خۆی لە نێو سنووری دەوڵەتی عوسمانیدا بینیوەتەوە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین ئەو قبوڵکردنە بەپێی ڕێککەوتنێك بوو، کە گرنگدیکەی بنەماکانی بریتی بوون لە پاراستنی سەربەخۆیی ناوخۆیی و حوکمی پشتاوپشت لە قەوارە و میرنشینە کوردییەکاندا[3].

سوڵتان (سلێمانی قانوونی ١٥٢٠-١٥٦٦) دوای داگیرکردنی بەغدا لە ساڵی ١٥٣٤ لە گەڕانەوەیدا بە هەولێردا تێپەڕی و (عزەدین شێر)ی میری سۆرانی کووشت، کە لە هەولێردا فەرمانڕەوابوو ، شارەکەشی خستە ژێر فەرمانی (حوسێن بەگی داسنی)، کە میرێکی ئێزیدی بوو[4]. ئەو پێشهاتە لێدان بوو لەهەستی دانیشتووان و هەنگاوێك بوو بۆ چاندنی تۆی دووبەرەکی، هەروەها پێشێلکارییەکی ئاشکرای ڕێککەوتننامەی کوردی - عوسمانیش بوو.

---

(١)- هامـەر، دولـت عثمانيـه تـاريخي، مترجمي:محمـد عطـا، ج٤، كتـﺌون بتروسـيان مطبعـه سـي، استانبول١٣٣٠ر، ص ١٥٥" الامير شرفخان البدليسي، شرفنامه، ت: محمد جميل الملا احمد الروزبيـاني، ط٢، اربيل، ١٩٨٨، ص ٤٥٨" محمد امين زكي، خلاصة تاريخ الكرد و كردستان، ت:محمد علـي عـوني، ج١، ط٢، بغداد، ١٩٦١، ص ص١٦٥-١٦٦.

(1) Uzuncarsili,Ismail Hakki: Buyuk Osmanli Tarihi,Cilt2,Ankara 1995, S 27 Edward S. Greasy, History Of the OttomanTurks,London 1878,New Published Khayats, Beirut, 1961,P 57.

(٣) - سەبارەت بە خاڵەکانی ئەو ڕێککەوتنە و هۆکارەکانی بەستنی بڕوانە: د. سعدي عثمان ، كوردستـان و الامبراطورية... ، ص ص ٦٣ -٦٨.

(٤) -شـرفخان البدليسـي، م.س، ص ٧٥" حسـين حزنـي موكريـاني، مـوجز تـاريخ امـراء سـوران، ت:محمـد ملاعبدالكريم، بغداد، د.ت، ص ٨.

دواتر زۆری نەبرد دووبارە میرێکی سۆران بە ناوی (میر سەیفەدین کوڕی حوسێنی کوری پیربۆداق) فەرمانڕەوایەتی شاری گرتەدەست[(١)]، بەڵام ئەو ڕەوشە درێژەی نەکێشاو عوسمانییەکان لەساڵی ١٥٥٩ ناوبراویان گرت و لە سێدارەیان دا[(٢)]. ئەوجارەیان شارەکەیان رادەستی (حوسێن بەگی میری ئامێدی) کرد، لە بەرامبەر ئەو خزمەتەی، کە ناوبراو پێشکەش بە عوسمانییەکانی کردبوو[(٣)].لە ساڵی ١٥٧٠دا گەڕیدەی هۆڵندی (لیۆنهارت ڕاوولف) سەردانی شارەکەی کردووە و ئاماژە بەوە دەکات، کە فەرمانداندەیەکی تورك فەرمانڕەوایەتی شارەکە دەکات و چەند کەسێکی لە سێدارە داوە[(٤)]. ئەوەش مانای ئەوەیە، کە هەولێر لەو ماوەیەدا لە دەست هێزە خۆماڵییەکان نەماوە.

لەساڵی ١٦٣٨ز دا سولڵتان مورادی چوارەم (١٦٢٣ — ١٦٤٠) سوپایەکی پێکهێنا، بۆ وەرگرتنەوەی بەغدا لە دەستی سەفەوییەکان، کە لەساڵی ١٦٢٣ داگیریان کردبوو، دانیشتووانی هەولێر بەتایبەتی هۆزەکانی دەوروبەر ڕۆڵێکی بەرچاویان لە هەڵمەتی وەرگرتنەوەی بەغدا بینی، کە بە سەرکەوتوویی ئەنجامدرا[(٥)].

---

(١) - عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، مج٤، بغداد، ١٩٤٩، ص ٤٣"د.عمادعبدالسلام رؤوف، ادارة العراق/ الاسر الحاكمة ورجال الادارة والقضاء في العراق في القرون المتاخرة، دارالحكمة طباعةوالنشر- بغداد، ١٩٩٢، ص ٢٧٣.

(٢) - جمال نەبەز، الامير الكردي مير محمد الراوندزي الملقب ب( ميره كۆره)، ت: فخری سلاحشۆر، ط٢، اربيل، ٢٠٠٣، ص٤٥.

(٣)- كاوه فريق احمد شاولي ئاميدي، امارة بادينان ١٧٠٠ -١٨٤٢/ دراسة سياسية اجتماعية ثقافية، ط١، اربيل،٢٠٠٠، ص ٣٤.

(٤) - ليونهارت راوولف، رحلة المشرق ( الى العراق و سوريا و لبنان و فلسطين)، ت: سليم طه التكريتي، بغداد، ١٩٧٨، ص٢٠٠.

(٥) - زبير بلال، تاريخ اربيل/ دراسة تاريخية عامة لاربيل و أنحائها منذ أقدم العصور حتى الحرب العالمية الاولى،ط٢، مطبعة الثقافة، اربيل، ١٩٩٨، ص ١٦٢.

له سەدەی هەژدەم هەولێر ڕووبەڕووی شالآوی ئێرانییەکان بووە، ئـەویش لەسـەروبەندی هێرشە سەربازییەکانی (نادرشا) [1] بۆ ناوچەکە، شارەکە لە (١٧٣٢ -١٧٣٣) داگیرکرا[2]، هەرچەندە ئەوە زۆر درێژەی نەکێشا، بـەڵام دواتـر (نادرشـا) لـە سـاڵی ١٧٤٣، دووبـارە گەمارۆی هەولێری دا و داگیری کردەوە[3] و لەشکرەکەی دەسـتدرێژی زۆریـان کـردە سـەر خەڵکی شارەکە[4]. بەڵام داگیرکاری (نادرشا) ئەوجارەشیان درێژەی نەکێشا، عوسمانییەکان دەسەڵاتیان بۆ شارەکە گەڕاندەوەو پێگەیەکی سەربازییان تێدا دامەزراند[5].

لە هەندێك کاتدا دەسەڵاتدارانی هەولێر، شان بە شانی میرانی بابان لە دژی دەسـەڵاتی عوسمانی ڕاپەڕیون، بۆیە دەبینین لەکاتی هێرشی والی بەغدا بۆ سەر بابان، (قـۆچ پاشـا)ی سەرداری هەولێر و (عوسمان پاشا) برای، کە سەرداری کۆیە بوو، هـەردووکیان لـە میرانـی سۆران و هاوپەیمانی (سەلیم پاشا)ی میری بابان بـوون، لـە دژی عوسمانییـەکان وەسـتان و پەنایان بۆ قەڵای هەولێر برد، بەم هۆیەوە شارەکە لەلایەن عوسمانییەکان دووچاری گـەمارۆ و وێرانکاری بووەوە[6].

---

(تر) — لە سەروبەندی ئەو نائارامیەی کە ئێرانی گرتەوە، نادرشـا لـە بیسـتەکانی سـەدەی ١٨ دەرکـەوت و دەسەڵاتێکی نوێی بە ناوی ئەفشارییەکان دامەزراندو لە ساڵی ١٧٣٦ز خۆی کردە شای ئێـران، ئـەو ماوەیـە چەندیین شەڕو شۆڕی بەخۆ بینی و دواتر لە ساڵی ١٧٤٧ نادرشـا کـوژرا، بـۆ زانیـاری زیاترلـە بـارەی ئـەم کەسایەتیە بڕوانە: میرزا مهدي خان استرابادي، جهانكشاي نـادري، تهـران، ١٣٣١هـ" Lokhart,L,Nadir Shah/Acritical Study Based Mainly Upon Contemprory Sources,(Londan;1938).

(٢) - زبير بلال، اربيل في ...، ص ١٦٤.

(٣) - ياسين خير الله العمري الخطيب الموصلي، غايـة المرام في تـاريخ محاسـن بغـداد دار السـلام، مطبعـة دار البصري، بغداد، ١٩٦٨، ص ص ١٨٠ — ١٨٣" ستيڤن هيمسلى لونگريك، اربعة قرون مـن التـاريخ العـراق الحديث، ت:جعفر الخياط، ط٥، دار الرافدين للطباعةو النشـرو التوزيـع، بـيروت- لبنـان، ٢٠٠٤، ص ١٨٣" عباس العزاوي، تاريخ العراق...، مج٥، ص ٢٦٧.

(٤) - رسول حاوي الكركوكلي، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء، ت:موسى كاظم نـورس، بـيروت، د.ت، ص٥٠" سهيل قاشا، حملات نادر شاه على العراق في وثائق سريانية، كـاروان "مجلـة"، ع(٧٥)، اربيـل، أيار ١٩٨٩، ص ١٥٣.

(٥) - زبير بلال، اربيل في ...، ص ١٦٤.

(٦) - سعدي عثمان حسين، أمارة بابان في النصف الاول من القرن الثامن عشر، اربيل، ٢٠٠٠، ص ٥٨.

دیاره سەردەمانێك هەولێر خراوەتە سەر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی بابانەکان، بەتایبەتی (سلێمان پاشای بابان)، کە لە ساڵی ١٧٦٤دا دەسەڵاتی بەسەر هەولێردا شکاوە[١]. لە هەندێ کاتیشدا ناوچەکانی هەولێر دووچاری هێرشی (عەبدولرەحمان پاشا)ی بابان بوونەتەوە[٢]، تەنانەت لە ساڵی ١٨١٨ ناوبراو دەسەڵاتیشی گەیاندۆتە هەولێر[٣].

لەبەر ئەوەی لەو ماوەیەدا هەولێر بە زۆری سەر بە دەسەڵاتی بەغدا بوو[٤]، بۆیە هێزەکانی شارەکە لە زۆرینەی هێرشەکانی والی بەغدا بەشدارییان کردووە، بۆنموونە لە ساڵی ١٨٠٥ (موتەسەلیم)ی[٥] هەولێر لەسەر داوای والی بەغدا، بە هەماهەنگی هێزی موسڵ هێرشی کردە سەر (عەبدولڕەحمان پاشای بابان)[٦]. هەروەها کاتێکیش (سلێمان پاشای بچووك)ی والی بەغدا (١٨٠٨ — ١٨١٠) هێرشیکردە سەر ناوچەی شنگار و جەزیرەی بۆتان، هێزی هەولێر بەشدار بوو[٧]. دوای ئەوەی (داود پاشا) (١٨١٦ — ١٨٣١ز) لەساڵی ١٨١٧ بووە، والی بەغدا بە دوو هەزار سوار (ئەحمەد پاشا)ی برای ناردە هەولێرو (عوسمان بەگ)ی بابانی ناچارکرد هەولێر بەجێ بهێڵێت، بەپلەی میری میران بووە

---

(١)- رسول الکرکوکلي، م.س، ص ١٤٦" سعدي عثمان، کوردستان الجنوبیة...، ص ١٥٨.

(٢) - ستیڤن لونگریك، اربعة قرون...، ص ٢٨٠.

(٣) -محمدامین زکی، تاریخی وولاتی سلێمانی، بەغدا،١٩٣٩، ل ١٢٤.

(٤) - لە تەوەرەی داهاتوو ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

(٥) - موتەسەلیم وشەیەکی عەرەبییە بە مانای بریکار یاخود نوێنەری والی دێت، لە شوێنێك کە لە جیاتی ئەو حوکم دەکات. محمد امین العمري، منهل الاولیاء ومشرب الاصفیاء من سادات الموصل الحدباء،حققه و نشره: سعیدالدیوه جي ،ج٢، مطبعة الجمهوریة، موصل ،١٩٦٨، ص ٢٦٣.

(٦)-- یاسین خیرالله العمري، غرائب الاثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر، الموصل،١٩٤٠، ص ٦٩" رسول الکرکوکي، م.س، ص٢٤٢" محمد امین زکی، تاریخی وولاتی سلێمانی، ل ٧٥.

(٧) - عثمان بن سند الوائلي البصري، مطالع السعود/ تاریخ العراق من سنة ١١٨٨ الی سنة ١٣٤٣ هـ/ ١٧٧٤ — ١٨٢٦ م، تحقیق: د.عماد عبدالسلام رؤوف و سهیله عبدالمجید القیسي، دار الحکمة، الموصل، ١٩٩١،ص ٢٦٩.

موتەسەلیمی شارەکە[1]. هەبوونی هێزی عوسمانی لە شارەکە لـە سـاڵی ١٨٢٠ لەلایـەن (ریچ) دووپات کراوەتەوە[2].

لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی بابانەکان لە هـەولێر، زۆرجـار لەسـەر کۆکردنـەوەی بـاج لەگەڵ هۆزەکانی هەولێر پێکدادان ڕوویداوە، پێکدادانیان لەگەڵ دزەییەکان[3] ڕووکـارێکی دیاری ئەو لایەنە بوو[4]. بەڵام لە هەندێك کاتدا هەماهەنگی و هاوکاری لە نێوانیان بەدی دەکرا[5]. دەکرێت بڵێین ململانێی نێوان عوسمانی و ئێرانییەکان و والی بەغـدا و بابانـەکان لەلایەك، بابانەکان و هۆزەکانی هـەولێر و کێشمەکێشـمەکانی نێـوان بابانـەکان و سـۆران لەلایەکی دیکەوە، کاریگەری خراپی لەسەر بارودۆخی هەولێر هەبوو.

لەسـەردەمی فەرمانڕەوایـەتی (مـیر محەمـەد ڕەوانـدزی) (١٨١٣ -١٨٣٦)، کـە بـە دیاردیکەین مـیری میرنشـینی سـۆران دادەنرێـت[6]، سـنووری ئـەو میرنشـینە لـە ڕێـی فرەوانخوازییەکانی ئەو میرە بە ئەندازەیەکی دیار فرەوان بوو، بە جۆریك شاری هەولێریشـی

---

(١) - م.ن، ص ٣٢٩.

(٢) - کلۆدیوس جمیس ریچ، گەشتەکەی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و: محەمەد حەمـە بـاقی، چ١، ئێـران — تەوریز، ١٩٩٢، ل ٣٤٠.

(٣) - دزەییەکان لە دیاردیکەی‌ن هۆزەکانی دەشتی هەولێر بوون، کە لە ناوچەکانی قەرەچوغ و کەنـدێناوە و بەپیدیکەی‌ن ناوچەکانی هەولێر بڵاوبوونەتەوە، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی ژمارەیان خۆی لە ٣٠ هەزار دەدا، ٦٠٠ سوارو ٤٤٠٠ چەکداری پیادەیان هەبوو، دیاردیکەی‌ن سەرکردەکانیان احمد پاشا، ئیبراهیم دزەیی، و پـیرداود ئاغـا و خورشـید ئاغـا بـوو. دبلیـو هـی، م.س،ج١، ص ١٠١ و ص ٢٠٣-٢٠٨" Civil Commissioners Office Baghdad, Tribbes Of Southern Kurdistan(Bettween The Greaterzab, and The Dialah) June,1919, p2…

(٤) - هۆشیار عەبدوڵلاٚ،دزەیی و ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر، هـەولێر"گۆڤار"،ژ(٨)، پـایزی ٢٠٠٠، ل١٢٢.

(٥) - جەمال بابان، ئاورێك لە مێژووی دزەیی، کاروان "گۆڤار"، ژ (٢٧)، بەغدا، ساڵی سـێیەم، کـانوونی یەکەمی ١٩٨٣، ل ل ٨٢ — ٨٣.

(٦) - لە بارەی ماوەی فەرمانڕەوایی میر محەمەدو فراوانخوازییەکانی بڕوانە: جمـال نەبـەز، م.س، د. جلیلـی جەلیل، کوردەکانی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی، و: د. کاوس قەفتان، بەغدا، ١٩٨٧، ل ل ١٣٣ — ١٦٣.

لەخۆ گرت[1]. بەڵام دواتر لە ئەنجامی هێرشی عوسمانییەکان و داگیرکردنەوەی ناوچەکە، هێزەکانی والی بەغدا عەلی رەزاپاشا(١٨٣١-١٨٤٢) لە رێگەی پردێ (ئاڵتون کۆپری)ەوە هەولێریان داگیرکردەوە و لەساڵی (١٨٣٦) کۆتایی بەدەسەڵاتی (میر محەمەد) هێنرا دوابەدوای ئەوەش شارەکە لەژێر دەسەڵاتی راستەخۆی عوسمانییەکان مایەوە، تا ئەوکاتەی لە (١٠)ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ لەلایەن هێزەکانی بەریتانی داگیرکرا[2].

لەلایەکی دیکەوە هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری لە زۆرێك لەو بزاڤ و راپەرینانە بەدەر نەبوون، کە لەم ماوەیەدا بەرپابوون، وەك راپەرینی (شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری) [3]، کە لە ساڵی ١٨٨٠دا بەرپابوو، بەپێی بەڵگەنامەکان هەولێر بووەتە پێگەیەکی رێکخستنەکانی ئەو راپەرینە و بۆ چەند جارێك بە بەشداریی سەرکردەو سەرۆك هۆزەکانی باشووری کوردستان، گەورە سەرکردەکانی راپەرین کۆڕو کۆبوونەوەکانیان لە هەولێر سازداوە[4]. ئەو راپەرینە لە رەواندز تا کەرکوك بە هەولێریشەوە پاڵپشتی لێ دەکرا[5]، بۆیە ئەو پێشهاتە لەلایەن دەزگا هەواڵگری و سیخوڕییەکانی دەوڵەتی قاجاریەوە بەئاگاییەوە چاودێری دەکراو

---

(١) - ستیڤن لونگریك، اربعه قرون...، ص ٣٤٣" صديق الدملوجي، امارة بهدينان الكردية او امارة العمادية، تقديم و مراجعة: عبدالفتاح علي البوتاني، ط٢،اربيل، ١٩٩٩، ص ٣٩.

(٢) - دبليو هي، م.س، ج١، ص ص ١٤٣-١٤٤. عبدالجبار قادر غفور، اربيل في السالنامات العثمانية، كاروان"مجلة"، ع(٩١)، السنة التاسعة، كانون الاول ١٩٩٠، ص ١١٩.

(٣) - شێخ عوبەیدوڵڵا کوڕی سەید تەها کوڕی احمد شیهابەدینە، ئاکنجی گوندی نەهری بوو، لەناوچەی شەمزینان لەساڵی ١٨٣٠ لە دایك بووە، خاوەن پێگەیەکی ئاینی گرنگ بوو، لەساڵی ١٨٨٠ جارِی شۆڕشی دا لە دژی دەسەڵاتی قاجاری لە ئێراندا، دوای شکست هێنانی هەوڵەکانی، لە لایەن عوسمانییەکانەوە بۆ حیجاز دوور خرایەوە، لە ساڵی ١٨٨٣ لەوێ مرد. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محەمەد حمە باقی، شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵا نەهری لە بەڵگەنامەکانی قاجاری، چ١، دەزگای موکریانی هەولێر، ٢٠٠٠" د.جلیلی جەلیل، راپەڕینی کوردەکانی ساڵی١٨٨٠،و:د.کاوس قەفتان، بەغدا،١٩٨٧.

(٤) - محەمەد حەمە باقی، س.پ، ل ٢٣٥.

(٥) - نەجاتی عەبدوڵڵا، شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لەبەڵگەنامەی فەرەنسیدا (١٨٧٩-١٨٨٢)، سلێمانی، ٢٠٠٤ ،ل ٤٢.

بەدواداچوون بۆ کۆبوونـەکانی هـەولێر دەکـرا[1]. بەڵگەنامەیـەکی قاجـاری ئامـاژە بـەوە دەکات، کە زۆرینەی سەرۆك هۆزو پیـاو مـاقوڵانی هـەولێر سـوێندو تـەڵاقیان خـواردووە هەموو بەیەکەوە بەیەك دڵ و یەك دەنگ پشتگیری لە داواکارییەکانی ڕاپەڕین بکـەن، کـە بە سەرۆکایەتی (شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری) بەرزکرابووە، هەموو سـەرۆك هۆزەکـانیش لـە کۆبوونەوەکەی هەولێردا نامـەیان بـۆ سـوڵتانی عوسمـانی نووسـیووە و داوای یارمـەتییان لێکردووە[2].

یەکێ لە ڕووداوەکانی دیکەی هەولێر لـەم ماوەیـەدا دەسـتگیرکردنی (کاکـل ئاغـا)ی سەرۆك هـۆزی گـەردی[3] بـوو، لـە سـاڵی ۱۹۰۳ لەلایـەن دەسـەڵاتدارانی عوسمـانی لـە هەولێر[4]. لە بەرامبەردا هێزێکـی (۵۰۰) سـوارە لـە گەردییـەکان، بەسـەر بەندیخانـەی قەڵاتیان داداو (کاکل ئاغا)یان دەرباز کرد[5]، لەگەڵ ئەوەی عوسمانییەکان تۆمەتی ڕێگری دەدەنە پاڵ (کاکل ئاغا) و هۆزی گەردی[6]، بەڵام سەرچاوەی دیکە، گرتنی (کاکـل ئاغـا) بۆ شەڕوپێکدادانی نێوان گەردی و دزەییەکان دەگێڕنەوە، گوایا سەرۆك هۆزەکـانی دزەیـی

---

(۱) - بڕوانە: نامەی ژمارە: (۸۹)، ۱۸ی رەبیعی دووەمی ۱۲۹۸ك — ۱۸۸۱ /۳/۱۹ز، بۆ: عەلائولدەولـە — ئەمیر نیزام. لە: محەمەد حەمەباقی، ڕاپەڕینی هەمزا ئاغای مەنگوڕ لە بەڵگەنامەی قاجاریـدا، ۱۸٥٤ — ۱۸۸۱، چ۱، هەولێر، ۲۰۰۷، ل ۱۲٤.

(۲) - نامەی ژمارە ۹۰، ل ۲٦۲، ۲۷ی رەبیعی دووەم ۱۲۹۸ك- ۱۸۸۱/۳/۲۸، بۆ عەلائولدەولە- ئـەمیر نیزام، لە: هـ.س، ل ل ۱۲٦ - ۱۲۸.

(۳) - گەردی هۆزێکی گەورەیە، لە ڕۆژهەڵات و باکوور و باشووری کوردستان بڵاوبوونەتەوە، لە ناوچـەکانی هەولێر بەتایبەتی ( بەحرکە و کۆیە) نیشتەجێن، جگە لەمەش لە ناوچەکانی مێرگەسوور و بارزان هەن، کاکل ئاغا ئەوکات سەرۆکی هۆزەکە بووە، دواتر جەمیل ئاغا و لە دوای ئەویش بایز ئاغا سەرۆکایەتی ئەم هۆزەی کردووە. مارك سایکس، القبائل الكرديه في الامبراطورية العثمانية، ت:د.خليل علي مراد، تقديم و مراجعة و تعليق: د.عبدالفتاح علي البوتـاني،ط۲، دار الزمـان للطباعـة و النشـر، دمشـق- سـوريا، ۲۰۰۷، ص ٤۲" عباس العزاوي، عشائر العراق، ط۱، مكتبه الصفاو المروى —لندن، ۱۹٤۸، ص ۱۲۳ — ۱۲۸.

(٤) - موصل"جريدة" ، نومرو(۷۰۸)، ۲۸ ربيع الاخر سنة ۳۳۱ — ۱۰ تموز ۳۱۹، ص۱.

(۵) - مەلامحمد علی علیاوەیی، غەم ڕەوێن، دەست نـووس، لـە لای د.عەبـدوڵڵا عـەلیاوەیی پـارێزراوە، ل ۲۹۵.هادي الجاوشلي، تراث اربيل التاريخي، ط ۱، موصل، ۱۹۸۵، ص ص ۲۷-۲۸.

(٦) -- بڕوانە: موصل"جريدة" ، نومرو(۷۰۸)، ۲۸ ربيع الاخر سنة ۳۳۱ — ۱۰ تموز ۳۱۹، ص ۱.

بەهۆی نزیکییان لە عوسمانییەکان خۆیان لە دەستگیرکردن دەرباز کردوە، بەڵام (کاکل ئاغا) دەستگیرکراوە[١]، دەکرێت ئەوەش بە نیشانەیەکی گەندەڵی و سیاسەتی چەوتی کاربەدەستانی عوسمانییەکان لە هەولێر دابنرێت.

کودەتای ئیتحادوتەرەقی لەساڵی ١٩٠٨دا وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، کاریگەری بۆسەر هەموو دەڤەرەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتە هەبوو[٢]، هەر بۆیە کاریگەری بۆ سەر ناوچەکانی باشووری کوردستان و هەولێریش وەك بەشێك لەو ناوچەیە هەبوو[٣]. ئیتحادییەکان وەك زۆرینەی شارەکانی دیکە دیارە لە هەولێریش چالاکی و رێکخستنیان هەبوو، بەپێی گوتەی ( کاپتن های)، دیاردیکەین ئەندامیشیان لە شارەکە (عەلی پاشا دۆغرەمەچی) بوو[٤]. لەگەڵ ئەوەشدا وردەکارییەکان سەبارەت بە رێکخستن و کارەکانی ئەو پارتە لە شارەکە نازانرێ لە چ ئاستێکدا بوو.

ئیتیحادییەکان لەگەڵ هاتنیان بۆ سەر دەسەڵات، بەرە بەرە لە هەموو ئەو بەڵێن و ئامانجەیان پاشگەزبوونەوە کە پێشتر جاڕیان دابوو، بەڵکو سیاسەتی تورکچیەتی و توندڕەوی نەتەوەییان پیادەکرد. هەولێریش لە ئەنجام و شوێنەوارەکانی ئەو سیاسەتە بێ بەش نەبوو.

کاتێك هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عوسمانی لە مانگی تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨ ئەنجامدرا[٥]، تێبینی دەکرێت هیچ نوێنەرێکی هەولێر لەم ئەنجوومەنە نەبوو، لەکاتێکدا کەرکوك و سلێمانی نوێنەری خۆیان هەبوو[٦]. هەروەها لە هەڵبژاردنی دووەمیش، کە لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٢ ئەنجامدرا، دیسانەوە هەولێر

---

(١) - مەلامحمد علی علیاوەیی، غەم ڕەوێن، دەست نووس، لە لای د.عەبدوڵڵا عەلیاوەیی پارێزراوە، ل ٢٩٥" هۆشیار عەبدوڵڵا، دزەیی و ....، ل ١٢٦.

(٢)- بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د.ارنست رامزور، ترکیا الفتاة وثورة ١٩٠٨،ت: صالح احمد العلي، منشورات دار مکتبة الحیاة، بیروت، ١٩٦٠.

(٣) - لازاریف، کێشەی کورد (١٨٩٦ — ١٩١٧)، و: د.کاوس قەفتان، ب١، بەغدا، ١٩٨٩، ل٢٢٧.

(٤) - دبلیو. هی، م.س، ج١، ص٢٠٠.

(5) -M.S.Anderson,The Great Powers and The Near East 1774 -1923,(London - 1970),P 150.

(٦) - مصطفی نورالدین الواعظ، الروض الازهر في تراجم ال السید جعفر، موصل، ١٩٤٨، ص ٢٣٧.

هیچ نوێنەرێکی نەبوو[1]. ئەوەش ئەو ڕاستییە بەرجەستە دەکات کە لەسەردەمی ئیتیحاتییەکانیش هەولێر بایەخی ئەو تۆی پێ نەدراوە.

سەرەڕای ئەوەش دەتوانین بڵێین ئەو بزاڤە ڕۆشنبیری و سیاسییەی، کە لەوماوەیەدا دەوڵەتی عوسمانی و کوردستانیشی گرتبووە، ڕەنگدانەوەیەکی ئەوتۆی بۆ سەر هەولێر نەبووە، بۆیە هەندێ لە کەسایەتییەکانی هەولێرو دەوروبەری لە دەرەوەی هەولێر چالاکیان نواندووە. بە هۆی نەبوونی ڕۆژنامە و گۆڤار لەم شارەدا، هەندێ لە نووسەرانی هەولێر لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی کەرکووك نووسینەکانیان بڵاوکردۆتەوە و کاریان کردووە لەوانە ( یوسف ناجی ئەربیلی)، لە گۆڤاری (معارف)[2]، کاریکردووە[3]. جگە لەمەش هەندێ کەسایەتی هەولێری لە ئەستەنبۆڵ دەوریان لەم مەیدانەدا هەبوو، لەوانە (ئەحمەد حەیدەری)[4] و (مەعروف جیاووك)[5]، ئەوەی دوایی دوای کودەتای ئیتیحادو تەرەقی

(١) - ابراهيم خليل احمد، ولاية الموصل/ دراسة في تطوراتها السياسية ١٩٠٨-١٩٢٢، رسالة ماجستير، كيلة الاداب/ جامعة بغداد، ١٩٧٥، ص ص ٧٦-٧٧.

(٢) - (معارف) گۆڤارێکی ئەدەبی هونەری بوو، بە زمانی تورکی بە هەشت لاپەڕە دەردەچوو، یەکەم ژمارەی لە ٢٤ی نیسانی ١٩١٣ دەرچوو، پازدە ڕۆژ جارێك دەردەچوو، خاوەنەکەی محەمەد جوادو دامەزرێنەرەکەی قودسی زادە احمد مەدەنی بوو، سێزدە ژمارەی لێ دەرچووە، لە ٣٠ /١٩١٣/١١ وەستاوە. ڕووبار عەبدولڕەحمان، لاپەڕەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی تورکمان لە کەرکووك، "بارش" گۆڤار، ژمارە (١٢)، هەولێر، نیسانی ساڵی ٢٠٠٣، ل ١٠٤.

(٣) - هـ.س، ل ١٠٤.

(٤) -ئەحمەد حەیدەری کوڕی سیبغەتوڵڵا حەیدەری هەولێرییە، لە بارەی کەسایەتی ناوبراو بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە( ئامادەکردن و لێکۆڵینەوە)، گۆڤاری ڕۆژی کورد/ گۆڤاری جڤاتی هێڤی قوتابیانی کورد١٩١٣ — ئەستەنبوول،چ١، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ١١٧.

(٥) — معروف چ چیاووك کوڕی عەلی ئەسغەر کوڕی حاجی مولود ئەفەندییە، لەساڵی ١٨٨٥ لە بەغدا لە دایك بووە، خەڵکی دێی سرێشمەی سەربە ناحیەی ڕەواندزە، بڕوانامەی لە کۆلیژی ماف بەدەستهێناوە، لە ساڵی (١٩٢٨ — ١٩٣٠) ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران بوو بە نوێنەرایەتی لیوای هەولێر، چەندین پلەو پایەی کارگێڕی وەرگرتووە، لە٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٥٨ مردووە، بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی کارو چالاکییەکانی بڕوانە: معروف جیاوگ، نيابتي في ١٩٢٨ — ١٩٣٠، بغداد، ١٩٣٧“ کەریم شارەزا،

ساڵی ١٩٠٨ چۆتە ناو ( كۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی كورد- كرد تعاون و ترقی جمعیەسی)[١]و گەلێك وتاری لە ڕۆژنامەكانی ئەو كات نووسیووە، هەروەها لەساڵی ١٩١٢ گۆڤارێكی بە ناوی (حقوق) دەركرد، كە یەكێك لە لێتۆژەوان بە یەكەم ڕۆژنامەی كوردی باشووری كوردستانی دادەنێت، هەرچەندە بە زمانی كوردیش نەنوسراوە، بەڵام تیایدا داكۆكی لە مافە نەتەوەییەكانی كورد كراوە[٢].

لەسەروبەندی یەكەمین جەنگی جیهانی لەگەڵ هەڵگیرسانی بزاڤی (شێخ عەبدولسەلامی بارزانی)[٣] هەندێ لە خەڵكی هەولێر بەشداریی‌ان لەم بزاڤەدا كرد، (مستەفا هەولێری) یەكێك لە فەرماندەكانی بزوتنەوەكە بوو[٤]، هەروەها (ئەحمەد حەیدەری)یش ڕایەڵی

---

كەسایەتیە ناودارەكانی هەولێر/ مافپەروەر و كارگێڕی و نووسەر و كوردپەروەر مەعروف جیاوگ ١٨٨٥ – ١٩٥٨، هەولێر "گۆڤار"، ژ(٢) بەهاری ١٩٩٩، ل ١٨٣.

(١) - ئەم كۆمەڵەیە لە دوای كودەتای ئیتحادو تەرەقییەكان لە ساڵی ١٩٠٨ لەسەر دەستی كۆمەڵێك كەسایەتی رووناكبیری كورد دامەزرا. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:د.جەبار قادر، چەند بابەتێكی مێژووی كورد، چ١، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ١٠.

(٢) - د. ئیسماعیل شوكر رەسول، مەعروف چیاوگ ١٨٨٥ – ١٩٥٨/ چەند لاپەڕەیەكی شاراوەی مێژووی گەلی كوردە، چ١، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ١٠.

(٣) - شێخ عەبدولسەلام كوڕی شێخ محەمەد كوڕی شێخ عبدولسەلام كوڕی شێخ عەبدوڵڵا كوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی كوری شێخ تاجەدینە، لەساڵی ١٨٦٨ لەدایك بووە، بە هۆی ئەو جموجۆڵەی لە ناوچەی بارزان هەیبوو، دوای سەركوت كردنی ئەو بزووتنەوەی كە بەرپای كردبوو لە١/١١ی ساڵی ١٩١٤ لە لایەن عوسمانیەكان لە سێدارەدرا. لە بارەی بزووتنەوەكە بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية/ انتفاضة بارزان الاولى( ١٩٣١ – ١٩٣٢)، كردستان، ١٩٨٦ " كاميران عبدالصمد احمد الدوسكي بهدينان في اواخر العهد العثماني (١٨٧٦ -١٩١٤)ط١، مؤسسة موكرياني للبحوث و النشر، اربيل، ٢٠٠٧، ص ص ١٣٧- ١٧٩.

(٤) - د. أسماعيل شكر، اربيل...، ص٤١.

پەیوەندی نێوان (شێخ عەبدولسەلام) و (شێخ مەحمود) بوو[١]، جگە لەمە دزەییەکانیش بەشێکیان هاوسۆزو بەشداریی بزووتنەوەکە بوون[٢].

لەگەڵ دەستپێکردنی یەکەمین جەنگی جیهانی لە مانگی ئابی ساڵی ١٩١٤دا، دەوڵەتی عوسمانی نەفیر عامی ڕاگەیاند[٣]، بەمەش بەڵاو وەیشومە هەولێری وەك تەواوی ناوچەکانی دیکەی کوردستان گرتەوە[٤]، ڕەفتاری سەربازان و فەرمانبەرانی عوسمانی لە کوردستان لەوە دەچوو، کە لەسەر خاکی دوژمنەکەی بێت[٥]، ئەوەبوو سەربازەکان کەوتنە وێزەی دانیشتووانی ناوچەکە، بەبیانووی دابینکردنی کەلوپەل و خۆراك بۆ سەربازانیان هەرچی دانەوێڵەی خەڵکەکە هەبوو کۆیانکردەوە، بەم شێوەیە خەڵکیان بە برسییەتی هێشتەوە[٦]. تەنانەت لەکاتی گەڕانیان، سەربازەکان دیواری ماڵانیان دەپشکنی نەوەك خەڵکەکە لە نێوان دوو دیواردا دانەوێڵەیان شاردبێتەوەو دواتر بە قوڕ سواقیان دابێت[٧]. هەروەها لەوماوەیەدا بارودۆخی ئاسایش لە دەڤەرەکەدا لە

(١) - عەبدوڵلا زەنگەنە، گۆڤاری رۆژی کورد...، ل ١١٧"چاوپێکەوتن لەگەڵ مومتاز حەیدەری، هەولێر، ١٠ /١/ ٢٠٠٦. ناوبراو لە ١٩٣٨/٣/٨ لە شاری هەولێر لە دایك بووە، یەکێکە لە کەسایەتییە دیارو ڕۆشنبیرەکانی شاری هەولێر. ئێستە لە گەڕەکی ئازادی شاری هەولێر نیشتەجێیە.

(٢) - بی رەش، بارزان و حرکە الوعی القومی الکردی (١٨٢٦ — ١٩١٤)،د.م، ١٩٨٠، ص ١٢٨.

(٣) -محمد طاهر العمري، تاريخ مقدرات العراق السياسة، مج ١، موصل، ١٩٢٤، ص ١٣٢.

(٤) - بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ڕەوشی کوردستان لەم ماوەیەدا، بڕوانە: د.کمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ط٢، بغداد، ١٩٨٤.

(٥) - جليلي جليل و أخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ت: عبدي حاجي، بيروت، ١٩٩٥، ص ٩٠.

(٦) - مولود بێخاڵی، هەولێرم وا دیوەو وا بیستووە، ب٣، هەولێر، ٢٠٠٥، ل١٥٢" ئیحسان ڕەشاد موفتی، گرانیە گەورەکانی کوردستان لە بەغدا بە ساڵی برسیمە و لە هەولێر بە لیرە ناسرا، بەدرخان "مانگنامە"، ژ(٩٠)، ٢٠٠٨/٢/٢٢،ل١٨-١٩" چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نورەدین دەباغ، هەولێر، ٢٠٠٧/٩/٣. یەکێکە لە تەمەندارانی شاری هەولێر، لە بنەماڵەی دەباغەکان، تائێستە لە ژیانداماوە" چاوپێکەوتن لەگەڵ کەنعان موفتی، هەولێر، ٢٠٠٧/٩/٢٥، یەکێکە لە نەوەکانی موفتی شاری هەولێر، ماوەیەك بەڕێوەبەری شوێنەواری هەولێر بوو، ئێستەش بەڕێوەبەری گشتییە لە وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان.

(٧) - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نورەدین دەباغ.

ئاستێکی باشدا نەبوو، بە جۆرێك دزیکردن لەپەرە سەندن دابوو[1]، تەنانەت کـاروانی خەزێنەکانی دەوڵەت لەژێر پاسەوانییەتیەکی تووند دەگوازرانـەوە، نـەبادا دووچـاری ڕێگران ببنەوە[2]. سەرەڕای ئەوانە، عوسمانییەکان لەشارەکە گرنگی زۆریان بە توانای لاوان دەداو دەستیان کرد بە تۆمارکردنی ناویان، لە یەکێك لـە کارەکانیـان بـەر لـە هەڵگیرسانی جەنگ ناوی هەزار و( ٥٠٠ ) کەسیان لە هەولێر تۆمارکرد[3].

لەگەڵ جاڕدانی (سەفەر بـەلگ)[4]یـش، دەسـتیان بـە ڕەشـبگیری کردوجەندرمـەکانی عوسمانی خەڵکییان راپێچی بەرەکانی جەنگ کـرد، هەرکەسـێکیش سەرپێچـی بکردبایـە دووچاری سزای تووند دەبووە. بە هۆی ملکەچ نەبوونی هەندێك لە دانیشـتووانی شـار بـۆ بەشداریی کردن لە بەرەکانی جەنگ، ژمارەیەکیان لەبەرچاوی خەڵك لە سێدارە دران[5].ئەو ڕەفتارە لە زۆرینەی شارەکانی دیکە پیادەکرا، لەوانە لە شاری موسڵ[6]، ئەو سیاسـەتەش وایکرد، زۆرێك لە لاوانی شار بەمەبەستی خۆدزینەوە لە جەنگ، ماڵ و حاڵیان جێ بهـێڵن و ڕوو لە ناوچە شاخاوییەکان بکەن، بۆ ئەوەی خۆیان لە بەڵاو وەیشوومەی جەنگ بـە دوور بگرن[7]. بەم شێوەیە جەنگ شوێنەواری بەسەر شاری هەولێردا دیاربوو، تەنانەت لە کـاتی

---

(١) - موصل"جريدة"، نومرو(٦٦٢) ربيع الاول سـنة ١٣٢٠هــ ٦ حزيـران سـنة ١٣١٨ر " نـومرو(٦٦٣) ربيع الاول سنة ١٣٢٠هـ –اغسطوس ١٣١٨ر.

(٢) - موصل"جريدة"، نومرو(٧٨٩) ٢٨ ربيع الاول سنة ١٣٢٣هـ – ١٩ مايس سنة ١٣٢١ر.

(٣)- موصل"جريدة"، نومرو(٧٧٤) ٢٦ ذي الحجة سنة ١٣٢٢هـ – ١٧ شباط سنة ١٣٢٠ر.

(٤) - ئەو پرۆسە ڕەشبگیریە بوو، کە دەوڵەتی عوسمانی لەمیانەی جەنگی یەکەمی جیهانی پیادەی کرد، کە تیایدا هەرچی گەنج و توانادار هەبوو، بەشێوەیەکی زۆرە ملێ راپێچـی بـەرەکانی شـەڕی کـردن. سەرپێچـی کارانیش دووچاری سزای قورس دەبوونـەوە، زۆرجـاریش رووبـەڕوی لـە سـێدارەدان دەبوونـەوە، کـە ئەمـەش بەسەفەر بەلگ دەناسرێت. طاهر احمد حەویزی، مێژووی کۆیە، ب٢، چاپخانەی نمیر-بەغدا، ١٩٨٤، ل ١١٧.

(٥) - د. عەبدوڵڵا حەداد، لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی/ ژیاننامە و شیعرەکانی میهری محەمەد شەریف موەزین زادەی هەولێر(١٩٠٣ -١٩٤٣)،چ١، چاپخانەی کریستال، هەولێر، ١٩٩٧، ل٣٣.

(٦) -جاسم محمد العدول، الموصل في العهد الاتحادي/(١٣٢٦ -١٣٣٦هـ/١٩٠٨ -١٩١٨)، موسوعة الموصـل الحضارية، ط١، مج٤، دارالكتب للطباعة و النشر-جامعة الموصل، ١٩٩٢، ص ١٢١.

(٧) - د.كمال مظهر، كردستان في سنوات...، ص ٢٢٨.

جەنگدا مزگەوتی گەورەی بازاڕی قەیسەری شاری هەولێریان کردبووە نەخۆشخانە، سەربازە زامدارو نەخۆشەکانیان تێدا چارەسەر دەکرد[١].

هەرلەماوەی جەنگداو لەساڵی ١٩١٦ هێزەکانی ڕووسیا ڕەواندزیان داگیرکرد[٢]، وە دەستدرێژی زۆریان کردە سەر خەڵکی ناوچەکە[٣]. لەم سەروبەندەدا ( ئیحسان پاشا)ی فەرماندەی ئۆردوی شەشەمی عوسمانی لە ناوچەکە هاتە شاری هەولێرو هانی پیاوماقوڵان و سەرۆك هۆزەکانی دا، بۆ ئەوەی پەیوەندی بە سوپای عوسمانییەوە بکەن، بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی سوپای ڕووسیا[٤]. بۆیە هۆزەکانی هەولێر لەم چوارچێوەیەدا پەیوەندییان بە سوپای عوسمانی کرد، کە ئەو کات لە چیای کۆڕەك بوون[٥]، لەم چوارچێوەیەدا (ئەحمەد پاشای دزەیی) هێزێکی لە هەولێر بۆ بەشدارییکردن لە شەڕی ڕووس پێکهێنا، لە بەرەکانی شەڕدا (پیرۆت برایم)ی خەڵکی گوندی قوشاغلوی دەشتی هەولێر کوژرا[٦]. هەروەها هەندێ خەڵکی هەولێر لە گەرمەی جەنگی جیهانیدا لەژێر فەرماندایەتی (شێخ مەحمود) بەشدارییان لەشەڕی شوعەیبییەدا[٧]، کرد[١].

---

(١) - د.عەبدوڵڵا حەداد، گەشتێك بەناو لاپەڕەکانی مێژووی وەقف و مزگەوتی حاجی داود (مزگەوتی گەورەی بازاری هەولێر)، هەولێر "گۆڤار"، ژ(١٧)، هاوینی ٢٠٠٦، ل ٦٤.

(٢) - شكري محمود نديم، الجيش الروسي في حرب العراق ١٩١٤ — ١٩١٧، بغداد، ١٩٦٧، ص ١٥.

(٣) - بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: احمد حەمەد ئەمین هۆمەر، ڕەواندز/ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ٣١ -٣٠" عبدالله رسول پشدەری، یاداشتەکانم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٩٢، ل ٤٢" مەمدوح مزوری، مێژووی ڕەواندز، چ١، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٢٧٧.

(٤) - بشير اسماعيل چيچو، اربيل أيام زمان، خبات "جريدة"، ع(٨٢٠)، اربيل، الجمعة ١٩٩٧/٤/٤، ص ١٥" چاوپێکەوتن لەگەڵ احمدی کوڕی خدری پاشای کوڕی احمد پاشا، هەولێر، ٢٠٠٧/١١/٢٣. ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٢ لە دایك بووە، تا دووی ناوەندی خوێندووە، ئێستە لە گەڕەکی ئازادی شاری هەولێر نیشتەجێیە.

(٥)- کامەران احمد حەمەد ئەمین، کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەییدا ١٨٩٠-١٩٣٢،چ١، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٠٢.

(٦) - هۆشیار عەبدوڵڵا، س.پ، ل ٢٠٠" چاوپێکەوتن لەگەڵ احمدی کوڕی خدری پاشای کوڕی احمد پاشا.

(٧) - سەبارەت بە شەڕی شوعەیبیە بڕوانە: شكري محمود نديم،حرب العراق (١٩١٤— ١٩١٨)،ط٨، بغداد، ١٩٧٤، ص٣٠.

نووسەرێك باس لەوە دەكات كە دوای پێشڕەوی كردنی هێزەكانی بەریتانیا لەناوچەكانی باشوورو ناوەڕاستی عێراق لە ساڵی ١٩١٧، دەستەیەك لە توركەكان هانی هەندێك لە هۆزەكانی دەوروبەری هەولێریاندا، بەمەبەستی هێرشكردنە سەر مەسیحییەكانی عەنكاوە[٢]، گوایا بە هەوڵ و كۆششی(مەلا فەندی)[٣] كەسایەتی دیاری ئاینی و كۆمەڵایەتی شارەكە، توانرا ئەو هەوڵە پوچەڵبكرێتەوە[٤]. بەڵام پێدەچێ ئەو زانیارییە لە ڕاستیەوە دووربێت، بە تایبەتی كە هیچ بە ڵگەنامە و سەرچاوەیەك لە ئارادا نییە بۆ سەلماندنی. لەگەڵ ئەوەشدا بەریتانییەكان لەپێشڕەوییكردن بەردەوام بوون، لە (١٠)ی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨دا هەولێریان داگیركرد[٥]، بەمەش هەولێر و دەوروبەری پێیان نایە قۆناغێكی نوێوە.

---

(١) - سروه اسعد صابر، كوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل (١٩١٤ – ١٩٢٦)، ط١، اربيل، ٢٠٠١، ص ٣٧.

(٢) - عەنكاوە گوندێك بوو لە باكووری هەولێر، نزیكەی ٥كیلۆمەتر لە شارەكە دوور بوو، دانیشتوانەكەی كریستیانن و ئەو كات نزیكەی ٢٥٠٠ كەس بوون. دبلیو. هي، م.س،ج٢، ص ١٥٩. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:حنا عبدالاحد روفو، لمحة عن عنكاوة ماضيهاو حاضرها،ط١، مطبعة وزارة الثقافة، اربيل، ١٩٩٦.

(٣) - مەلا ئەبو بەكری كوڕی حاجی عومەری كوڕی مەلا ئەبوبەكری سێیەمە (١٨٦٣ – ١٩٤٢)، خاوەن پێگەیەكی كۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی بوو، پەیوەندییەكی بەتینی لەگەڵ كاربەدەستە باڵاكانی عێراقی هەبوو، چەند جارێك (مەلیك فەیسەڵ) سەردانی كردووە، لەبەر گرنگی پایەوپێگەكەی، ژمارەیەكی ڕۆژنامەی (فتى العراق) تایبەت كراوە بە چلەی مردنی. فتى العراق "الجريدة"، ع (٥٤٥ – ٥٤٤)، ا شباط ١٩٤٣" محمد أمين زكي، مشاهير الكردو كردستان، نقله الى العربية: محمد علي عوني، ج١، بغداد،١٩٤٧، ص ٨٣" حميد المطبعي، موسوعة اعلام العراق في القرن العشرين، ط١، ج١، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٥، ص ١٢.

(٤) - حنا عبدالاحد رفو، م.س ص ص ١٧-١٨ .

(٥) - دبليو هي، م.س، ج١، ص ص ١٤٣-١٤٤.

# تەوەری سێیەم
# هەلومەرجی کارگێڕی هەولێر

کاتێ لە ئەنجامی پەرەسەندنەکانی دوای شەڕی چالّدێران چەندین دەڤەرو میرنشینی کوردی هاتنە چوارچێوەی دەولّەتی عوسمانی- وەك پێشتر باسمان کرد- هەولێر بەشێك بوو لە میرنشینی سۆران[١]، ئەویش سەر بە ویلایەتی دیاربەکر بوو[٢]. بەلاّم ئەو هەلومەرجە کارگێڕییە زۆر بەردەوام نەبوو، چەندین گۆڕانکاری بەسەردا هات، بۆیە دەبینین لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەم هەولێر یەکێك لەو (٢٠) سەنجەقە[٣] بوو، کە ئیالەتی[٤] شارەزووری لێ پێکهاتبوو[٥]. تا کۆتاییەکانی سەدەی ناوبراویش هەر وەك یەکێك لە سەنجەقەکانی ئەو ئیالەتە ماوەتەوە، کە مەلّبەندەکەی شاری کەرکووك بوو[٦]، بەلاّم لەماوەی هەردوو سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم هەولێر لە ڕووی پاشکۆیەتی کارگێڕییەوە چەند جارێك دەستاودەستی کرد[٧].

بە گشتیی تێبینی ئەوە دەکرێ، سەنگ و بایەخی شارەکە لە ڕووی کارگێڕییەوە لەو ماوەیە لە دابەزین دابوو، بەجۆرێك لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بووەتە قەزایەکی

---

(١) - محمد امین زکی، خلاصە تاریخ...، ص ص ١٦٥ -١٦٦.

(2) - Uzuncarsili,Op.Cit...,Cilt2,SS 275-276.

(٣)- سەنجەق ووشەیەکی تورکیە بە مانای (لیوا)یان(ئالاّ) دێت.

(٤) - دەولّەتی عوسمانی بە شێوەیەکی فەرمی زاراوەی ئیالەتی لە سالّی (١٠٠٠ ك/ ١٥٩١ز) لە بری ویلایەت بەکارهێنا، بەلاّم دواتر سەرلەنوێ زاراوەی ویلایەت لە سالّی ١٨٦٤ بەکار هاتووە. دائرة المعارف الاسلامیة (الترجمة العربیة)، مج٥، مادة ایالة (خلیل اینالجق)، ص ٢٦٤.

(٥) - د.سعدي عثمان، کوردستان الجنوبیة في القرنین السابع عشرو الثامن عشر،منشورات مکتبة سۆران- اربیل، مطبعة سیما(السلیمانیة)، ٢٠٠٦، ص ص ٩١-٩٧.

(٦) - سالنامە ولایت موصل ١٣١٢ هـ، موصل ولایتي مطبعە سندة باصلمشدر، ص٣١٦.

(٧)- بۆ نمونە بڕوانە: د.سعدي عثمان، کوردستان الجنوبیة...، ص ص١١٢ — ١٥٨.

سەربە سەنجەقی شارەزوور لە ویلایەتی موسڵدا[1].ئەو سەنجەقە لە ساڵی ١٨٩٢دا ناوەکەی گۆڕاوە بۆ سەنجەقی کەرکووك، بێ ئەوەی ئەوە مانای هیچ گۆڕانکارییەکی کارگێڕی گەیاندبێت[2] . ئیتر تا کۆتایی سەردەمی عوسمانی هەلومەرجی کارگێڕی هەولێر بەم شێوەیە ماوەتەوە، واتە موسڵ ویلایەتێك بوو، سەنجەقەکانی (موسڵ و کەرکووك وسلێمانی) لەخۆگرتبوو، هەولێریش قەزایەك بوو سەر بە سەنجەقی کەرکووك لە پاڵ قەزایەکانی: ڕەواندز، سەلاحییە(کفری)، کۆیە، ڕانییە[3].

لەو ماوەیەدا دەتوانین سنووری قەزای هەولێر بەم شێوەیە دیاری بکەین" لە باکوور قەزای ڕەواندز، کە ڕووباری بەستۆڕە هێلی نێوان هەر دوولا بوو، لە باشووری ڕۆژهەڵاتی هەریەك لە قەزاکانی کۆیەو ڕانییە، لە باکووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش لە نێوان موسڵ و هەولێر، زێی گەورە هێڵی جیاکەرەوە بوو، لە باشووری رۆژئاواش ناحییەی ئاڵتوون کۆپری(پردێ) بوو[4]. قەزای هەولێر ناحییەکانی سوڵتانییە و دزەیی و هەروەها شەمامکی لەخۆدەگرت لە پاڵ ناوەندی قەزاکە، بەم شێوەیەی خوارەوە، لە ساڵنامەی موسڵی ساڵی (١٩١٢)دا هاتووە[5]:

| گوندەکان | ناحییە و بەش | ناوی شوێن |
|---|---|---|
| ٧٠ | - | گوندەکانی دەوروبەری هەولێر |
| ٤٨ | ١ | ناحییەی سوڵتانییە |

(١) -شمس الدين سامي، م.س، مج٣، ص ص ٢٨٨٨ ،٢٨٨٩.

(٢) - بڕوانە دەقی بەڵگەنامەیەکی عوسمانی تایبەت بەم بڕیارە لە :د.خليل علي مراد (ترجمة و تعليق)، مختارات من كتاب الموصل و كركوك في الوثائق العثمانية، السليمانية، ٢٠٠٠، ص ٦٤.

(٣) - موصل ولايتي سالنامة رسميسيدر، ١٣٢٥هـ/١٩٠٧م، عزتلو صفوت بك معرفتيله ترتيب و دردنجي دفعه اوله رق موصل مطبعه سنده طبع اولنمشدر، ص ٧٧" د.عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات و مباحث في تاريخ الكورد و العراق المعاصر، ط١، دهوك،٢٠٠٧، ص ١٠١.

(٤) - سالنامة ولايت الموصل، ١٣١٢هـ، موصل ولايتي مطبعة سنده باصلمشدر، ص ٣١٩.

(٥)- سالنامة ولايت الموصل ١٣٣٠هـ، ص ٢٨١.

| ناحییەی دزەیی | ١ | ٦٠ |
|---|---|---|
| هۆبەی ئەولاكی شەمامك | ١ | ١٢٢ |
| گشتیی | ٣ | ٣٠٠ |

سەبارەت بەپێكهاتەی ئیدارەی شارەكە لە كۆتایی فەرمانڕەوایەتی عوسمانی، قائیمقام سەرۆكی ئەو یەكە كارگێڕییە بوو[١]، كە لایەن والی موسڵەوە دیاری دەكرا[٢]، بەڵام هەندێك جار دەسەڵاتی ناوەند (ئەستەنبۆل) قائیقامی بۆ دیاری دەكرد[٣]. قائیمقام دەبوو فەرمانی سەروخۆی جێبەجێ بكات، كە لە كەركووكەوە بۆی دەهات[٤]، بەرپرسی یەكەمی كاروبارەكانی پەیوەست بەو قەزایە بوو[٥]. لە هەندێك كاتی تایبەت قائیمقامی هەولێر كاروباری كەركووكی بەڕێوە دەبرد، بۆ نموونە: لە كاتی دەست لەكاركێشانەوەی (مەحمود بەگی) موتەسەڕیفی كەركووك، لە ساڵی ١٩٠٥ (مستەفاپاشا)ی قائیمقامی هەولێر بە وەكالەت بۆ ماوەیەك كاروباری كەركوكیشی بەڕێوەبرد[٦]. هەندێك جار كەسانی هەولێری

---

(١) - موصل ولايتي سالنامة رسميسيدر، ١٣٢٥هـ/١٩٠٧م،ص ٢١٨" د.أبراهيم خليل العلاف، التشكيلات الادارية في اربيل في أواخر العهد العثماني، الموقع الاكتروني: ".WWW.gilgamish.org/viewarticle.php?id=1583&pg=history&art=mp عبدالله محمد حداد، معلومات نادرة عن اربيل قبل قرن، مجلة"كاروان"،ع (٥)، شباط ١٩٨٣، ص ٩٦.

(٢) - د.خليل عەلی موراد، ئیدارەی هەولێر لە دوا سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییەوە (١٨٣٦ – ١٩١٨)، باسێكە لە چوارچێوەی ئەنسكلۆپیدیای هەولێر، كە بڵاونەكراوەتەوە. ل ٢.

(٣) - مەهدی محەمەد قادر، هەولێر لە ساڵانی یەكەمین شەڕی جیهانیدا (١٩١٤ – ١٩١٨)/ لێكۆڵینەوەیەكە لەبارەی باروودۆخی كۆمەڵایەتی و ئابووری و كارگێڕی، زانكۆ( گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتیەكانی زانكۆی سەلاحەدین- هەولێر ، ژ( ٣٣) ، ٢٠٠٨، ل ٩٢ .

(٤) د.خليل عەلی موراد، ئیدارەی هەولێر... ل، ٢.

(٥) - الدستور(مجموعة القوانين و التنظيمات العثمانية المنشورة باللغة العربية باسم الدستور)،ت: نوفل نعمة الله نوفل،ج١، بيروت،١٣٠١هـ/١٨٨٣م، ص ٣٨٩" هەروەها بڕوانە: د.ابراهيم العلاف، م.س.

(٦) - موصل "جريدة"، نومرو(٦٦٢)، ربيع الاول سنة ٣٢٠ – ٦ حزيران سنة ٣١٨.

پۆستی قائیمقامی هەولێریان وەرگرتووە، (عەبدولا پاشا)[١] یەك لەوانە بوو[٢] ، مووچەکەی (١٧٥٠) قرش[٣] بوو[٤]. هەروەها ناوبراو بەپێی فەرمانێکی (سولتان عەبدولحەمید) لە ساڵی ١٨٩٠ ڕێزی لێنراو و پلەی پاشایەتی وەرگرت، لەگەڵ مەدالیای (خادم الحرمین الشریفین) کە ئەوەش بالاّدیکەی‌ن مەدالیای عوسمانی بوو لەو سەردەمەدا[٥].

لە قەزاکان ئەنجوومەنی قەزا هەبوو، کە ئەنجوومەنیکی هەمیشەیی بوو[٦]. ئەو ئەنجوومەنە لە دوو دەستە پێکهاتبوو[٧]، لە دەستەی یەکەم قائیمقام و جێگری قائیمقام و موفتی و بەڕێوەبەری دارایی و نووسەر، ئەندامی سەرەکیی بوون، دەستەی دووەمیش لە چەند ئەندامێکی دیکە پێکهاتبوون، کە بۆ ئەنجوومەنەکە هەڵدەبژێردران، ژمارەیان زۆرجار

---

(١) - سەید عەبدوڵلا پاشا کوڕی سەید عەباس ئاغا ( ناسراو بە سەید عەبدوڵلا پاشای نەقیب)، نەقیبی پیاوماقوڵانی هەولێربوو، پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ لەگەڵ دەسەلاّتدارانی عوسمانی هەبووە، چەندین پلەی کارگێڕی وەرگرتووە، هەروەها چەندین دیاری لە لایەن عوسمانییەوەکانەوە پێ بەخشراوە، لە کاتی هاتنی دەسەلاّتی بەریتانی نەیارێکی سەرسەخت بووە لە شارەکەدا، لە ساڵی ١٩٢١ مردووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مصطفی اربیلي، شخصیات لاتنسی/ السید عبدالله باشا الاحمدلي نقیب الاشراف في اربیل. موقع الاکتروني: www.alturkmani.com/shagsayat/shachsayatlatuunsa.htm

(٢) - موصل ولایتي سالنامەء رسمیسیدر ١٣٠٨هـ، مکتوبي ولایت سعادتلو حسن توفیق افندي معرفتیلە ترتیب اولنمشدر، ص ١٣١" سالنامەء ولایت موصل ١٣١٠ هـ ، ص ١٨٨.

(٣) - دراوێکی زیوی عوسمانی بوو، بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٦٨٨ز لێدرا، دوو جۆری هەبوو: ساغ و جرك(خراپ). غانم محمد علي، النظام المالي العثماني في العراق (١٢٥٥ -١٣٣٣هـ/ ١٨٣٩- ١٩١٤م)، رسالة ماجستیر، کلیة الاداب/ جامعة الموصل، ١٩٨٩، ص ١٦٥. ١٠٠قرش دەیکردە یەك لیرەی زێڕ. عباس العزاوي، تاریخ النقود العراقیة(لما بعد العهود العباسیة من سنة ٦٥٦هـ/١٢٥٨م الی ١٣٣٥هـ/١٩١٧ م، طبع شرکة التجارةو الطباعة، بغداد، ١٩٥٨، ص ١٣٨.

(٤) - جمیل موسی النجار، الادارة العثمانیة في ولایة بغداد (١٨٦٩ – ١٩١٧)،ط٢، بغداد، ٢٠٠١، ص ١١٧.

(٥) - مصطفی اربیلي، م.س.

(٦)- - الدستور،المادة(٦١)، ص ٤١٠.

(٧) - سالنامەء ولایت موصل ١٣٠٨هـ، ص ١٣١.

لە چوار کەس تێپەڕی نەدەکرد[١]، ئەو ئەنجوومەنە، کە سالّی چوار جار کۆدەبووە، بۆ تاوتوێکردنی ڕەوشی شارەکە، زیاتر دەزگایەکی ڕاوێژکاری بوو[٢]. هەروەها دەبوو وردبینی لە داهات و تێچوونی پڕۆژەکان و کاروباری دارایی بکات[٣].

لە ڕووی یەکە کارگێڕییەکانیش، (قەزا) بۆ چەند ناحییەك دابەش دەبوو، سەرۆکی ناحییەکە بەرپرسی ڕاپەڕاندنی کارەکانی بوو[٤]، هەر ناحییەکیش لە ژمارەیەك گوند پێکهاتبوون، بەرپرسی ئەو گوندانە پێیان دەگوترا (موختار)، کە بەرپرسی کارگێڕی ئەو گوندەبوو، ئەوەش دواهەمین زنجیرەی پەیکەری ئیدارەی ویلایەتی بەرجەستە دەکرد[٥].

هەرچی ئەنجوومەنی شارەوانییە، ئەوەیش یەکێك بوو لەو ڕێکخستنە کارگێڕیانەی لە دواماوەی فەرمانڕەوایەتی عوسمانییەکان لە هەولێر دا هەبوو[٦]، کە بۆ ڕۆژگاری (مەدحەت پاشا)ی والی بەغدا (١٨٦٩ — ١٨٧٢) دەگەڕێتەوە[٧]. ئەنجوومەنی ناوبراو بەمەبەستی ڕاپەڕاندنی کاروبارە خزمەتگوزارییەکان و تاوتوێکردنیان لەگەڵ ئەنجوومەنی قەزا، سالّی دووجار کۆدەبوونەوە[٨]. زۆرجاریش کەسایەتی شاری هەولێر پۆستی سەرۆکی شارەوانی وەرگرتووە، لەوانە (عەباس ئاغای ئەلنەقیب)، هەروەها دووجاریش لە سالآنی (١٩٠٣ —

---

(١) - سالنامەء ولایت موصل ، ١٣٢٥هـ، ص ٢١٨.

(2) -British Admirality,Ahand Book Of Mesopotamia vol.1 Second Editon (November- 1919), p142.

(٣)- الدستور، ج١، المادة(٩٢)، ص ٤١٥.

(٤) - الدستور، ج١ المادة(٥٦)، ص٤٠٨.

(٥) -الكسندر اداموف، ولاية البصرة في ماضيهاوحاضرها، ت:هاشم صالح التكريتي،ج١، البصرة، ١٩٨٩، ص ٧٩" البرت م. منشاشفيلي، العراق في سنوات الانتداب البريطاني،ت:د.هاشم صالح التكريتي،مطبعة جامعة بغداد، ١٩٧٨، ص٢٣.

(٦) - سالنامەء ولایت موصل ، ١٣٠٨هـ، ص١٣١" سالنامەء ولایت موصل، ١٣١٠هـ ، ص ١٨٨. د.ابراهيم العلاف، م.س.

(٧) - بڕوانە: محمد عصفور سلمان، العراق في عهد مدحت باشا، رسالة ماجستير، كيلة الاداب/ جامعة بغداد، ١٩٨٩، ص ص ٩٤ -٩٥.

(٨)- د.ابراهيم العلاف، م.س.

١٩٠٧)، (١٩١٣ – ١٩١٨) (عەبدوڵا پاشای کوڕی سەید عەبباس ئەلنەقیب) ئەو پۆستەی وەرگرت[١]. دیاردیکەین ئەو کارانەی کە ئەوەی دوایی لە ماوەی پۆستەکەی

ئەنجامیدا، ئەوەبوو کە: لە ساڵی ١٩١٣ دووبارە حەوزی ئاوی شارەکەی نۆژەنکردەوە، کە دانیشتووانی هەولێر سوودێکی زۆریان لێ بینی[٢]. هەروەها شەقامی سەرای دروست کرد[٣]. (عەبدولڕەزاق ئاغا) ش بۆ چەند جارێك ئەو پۆستەی وەرگرت[٤]. (ئەحمەد عوسمان)یش دوایین سەرۆك شارەوانی ڕۆژگاری عوسمانییەکان بوو[٥].

بەڵام کاروباری دادوەری بۆ دووبەش دابەش دەکرا، یەکەمیان: دادگەی شەرعی[٦] کە لەسەر بنەمای یاساو ڕێساکانی ئیسلام کێشەکانی یەکلایی دەکردەوە[٧]. دادگەی

---

(١) - مصطفى اربيلي، م.س.

(٢) - عبدالرحمان گەزنەیی، عبدالرحمان احمد گەزنەیی، اربیل وماءالشرب في الماضي والحاضر، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ١٩٩٧، ص ٣٧.

(٣) - بوتان جلال،اسرة السيد احمد اغا النقيب (من الاسره المعروفة في اربيل)، بارش"مجلة"، ع(١٢)، اربيل، نيسان ٢٠٠٣، ص ٥٧.

(٤) - عەبدولڕەزاق ئاغای کوڕی فەتحوڵڵا ئاغایە، یەکێك لە پیاو ماقوڵانی شاری هەولێر بوو، هەروەها ناوبراو شاعیر بوو، زۆرجار بەرهەمەکانی لە ڕۆژنامەکانی سەردەمی عوسمانی بڵاودەکردەوە، وەك ڕۆژنامەی (حوادث) و (نینوی). بڕوانە: نصرت مردان، ئەدەبی تورکمان لە هەولێر، و: رمزی میرەکانی، بارش"مجله"،ع(٣٧)، ٢٠٠٠، ص ١٣٣" احسان دوغرامجی، عوائل أربيل الاصله تورکمن أتابکی، موقع الاكتروني: www.alturkmani.com/makalaat/minawaeel:htm

(٥) - احمد عوسمان لە خانەوادەی مەلای گچکەی هەولێر بوو، لە ساڵی ١٨٧٩ لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩٠٦ ئەندامی دادگای بەرایی هەولێر و لە ساڵی ١٩١١ ئەندامی دادگای کەرکووك بوو، دواتر بووەتە سەرۆکی دادگا، لە کاتی هاتنی دەسەڵاتی بەریتانی سەرۆکی شارەوانی هەولێر بوو، لە ساڵی ١٩٢١ دەبێتە یاریدەدەری موتەسەڕیفی هەولێر و لە ساڵی ١٩٢٣ دەبێتە موتەسەڕیف، لە ساڵی ١٩٢٧ بە موتەسەڕیفی سلێمانی دانرا، لە ساڵی ١٩٣٠ بووەتە ئەندامی ئەنجومەنی پیاو ماقوڵان، بۆ دوو جاریش لە ئەنجومەنی نوێنەران بە نوێنەری هەولێر هەڵبژێردرا، لە ١٠ کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ لە شاری بەغدا مردووە. میر بصري، اعلام الكرد، ط١،لندن- قبرص، ١٩٩١، ص ص ١٦٨-١٦٩.

(٦) - موصل "جريدة"، نومرو(٧١٢)، ٢٧ جمادي الاول سنة ٣٢١ – ٧ اغسطوس سنة ٣١٩.

(٧) - د.خلیل عەلی موراد، ئیدارەی هەولێر ... ل ٤ .

دووەمیش: دادگەی نیزامی بوو[1] کە سەیری کێشەوگرفتەکانی خەڵکی دەکرد، ئەوەیان لەسەر شێوازی نوێی ئەوروپی بوو، پشتی بە یاسای نوێ بەستبوو، بەڵام نەدەبوو پێچەوانەی شەرع بێت[2]. دوا بڕیاری ئەو دادگەیەش لە دادگەی بەرایی کەرکوك یەکلایی دەکرایەوە، چونکە سەر بە دادگەی کەرکوك بوو[3]. لە نێو ئەندامانی دادگە هەندێ کەسایەتی هەولێری هەبوون، لەوانە (سەید عومەر ئاغای ئەحمەدلی) کە بەپێی فەرمانێکی سوڵتانی عوسمانی لە ساڵی (١٨٩٢) کرایە سەرۆکی دادگەی بەرایی هەولێر[4]، هەرچی (ڕەشید ئاغا)[5]، کە دواتر لە ساڵی ( ١٩١١ )، ئەویش ڕۆڵی بەدیار دەکەوێ ئەندامی دەستەی دادگە بوو[6]. هەر لە لە هەولێر پلەی موفتی هەبوو، کە پایەیەکی ئاینیی بوو. لەماوەی یەکەمین جەنگی جیهانیدا (جەمیل عەلی ئەفەندی) [7] موفتی هەولێر بوو. دەستەیەکی (سەرباز و جەندرمە)ش لە شارەکەدا هەبوون، ئەو فەرمانانەی لە دادگەوە دەردەچون، جێبەجێیان دەکرد، ئەوە جگە لەوەی ئەرکیان پاراستنی ئارامی و بەرژەوەندیی دەوڵەت و بەرقرارکردنی سەقامگیری بوو لە شار و دەوروبەری دا[8].

---

(١) - سالنامەء ولایت موصل ١٣٠٨هـ، ص١٣١" سالنامة ولایت موصل ١٣١٠، ص ١٨٨.

(٢) - الدستور،ج١، ص١.

(٣) - بڕوانە: موصل"جریدة"، نومرو(٧٦٠) ٦ رجب ٣٢٢ – ٣ ایلول ٣٢٠.

(٤) - احسان دوغرامجی، م.س.

(٥) - حاجی رەشید ئاغا کوڕی وەیسی ئاغایە، سەر بەهۆزی شێخ مەموندە، خاوەنی شەش گوند بوو لە دەوربەری هەولێر و دەشتی شەمامك، چوار کوڕی هەبوو، بە ناوەکانی ( عەتاوڵا، نافع، نورەدین و موسا ئاغا). عباس العزاوي، اربل في...، ص ١٤٨.

(٦) - سالنامەء ولایت موصل ١٣٣٠هـ، ص ٢٣٥.

(٧) - عباس العزاوي، اربل في مختلف العصور/ اللواء و المدينة، راجعه و علق عليه و قدم له: محمد علي القرداغي، ط١،شركة الخنساء للطباعة، بغداد، ٢٠٠١، ص ١٥٠.

(٨) - شكري محمود نديم، التشكيلات العسكرية في الموصل، موسوعة الموصل الحضارية،مج٤، الموصل، ١٩٩٢،ص ص ٢٢٢- ٢٢٤.

لەگەڵ ئەوانەش بانکێکی کشتوکاڵی هەبوو[1]، بۆ ئەوەی قەرز پێشکەش بە جوتیارانی ناوچەکە بکات[2]، کە بەرێژەی١٪ مانگانە سووی لێ وەردەگرتن، قەرزەکەش بۆ ماوەی یەك ساڵ بوو[3]. فەرمانگەیەکی (تەلیگراف)یش لەشارەکەدا هەبوو[4]، مێژووی دامەزراندنی بۆ ساڵی (١٨٦٩) دەگەڕێتەوە[5]. ئەوە جگە لە بوونی چەند فەرمانگەیەکی دیکە، لەوانە ( نفوس، تاپۆ، ئەوین سندوق ) و چەند دامەزراوەیەکی دیکە[6].

سەبارەت بە ڕەوشی کارگێڕی لە هەولێردا، وا تێبینی دەکرێت کە فەرمانبەرانی عوسمانی لە شارەکەدا هەستیان بە لێپرسراویەتی نەدەکرد، لەبەر ئەوەی زۆرینەیان ڕەگ و ڕیشەیان هی ئەو شوێنە نەبووو، ئیدی بەرژەوەندیی شارەکەیان زۆر بەلاوە گرنگ نەبوو[7]. گەندەڵی فەرمانبەرانی عوسمانی بەڕادەیەك پەرەی سەندبوو، تەنانەت ڕۆژنامەکانی ڕۆژگاری عوسمانی نەیان دەتوانی پەردەپۆشی بکەن و بەرتیل خۆری بەڕادەیەکی زۆر پەرێزی زۆرینەی کارمەندانی دەوڵەتی گرتبووە[8]. هەربۆیە ئاسایش شپرزەیی تێ کەوتبوو[9]،

---

(١) - موصل "جريدة"، نومرو(٦٧٨) ٢١ رجب ١٣٢٠هـ — ١٠ تشرين الاول سنة ٣١٨ر" نومرو(٧٠٥) ٧ ربيع الاخر سنة ١٣٢١هـ — ١٩ حزيران سنة ١٣١٩ر.

(٢) - حنا بطاطو، العراق/ الطبقات الاجتماعية و الحركات الثورية من العهد العثماني حتي قيام الجمهورية، ت: عفيف الرزاز، ط٢، ج١، مؤسسة الابحاث العربية، بيروت- لبنان، ١٩٩٥،ص١٤١.

(٣) - د.خليل عەلی موراد، ئیدارەی هەولێر...، ل ل ٣-٤ .

(٤) - موصل"الجريدة"، نومرو(٧٩٥)، ٢٣ جمادي الاخر سنة ١٣٢٣ هـ— ١١اغسطوس سنة ١٣٢١ر" عبدالله محمد حداد،معلومات نادرة...، ص ٩٦.

(٥) - د. عبدالله حداد، جولة سريعة بين صفحات الديوان المخطوط للشاعر الاربيلي يعقوب أغا المتوفي سنة ١٨٧٥، بارش"مجلة" ع(٢٠)، اربيل، ٢٠٠٥، ص٧٦.

(٦)- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت کارگێڕی هەولێر بڕوانە: سالنامەء ولایت موصل ١٣٠٨هـ ، ص ١٣١ " سالنامەء ولایت موصل ١٣١٠هـ ، ص١٨٨" د.خليل عەلی موراد، ئیدارەی هەولێر..." مەهدی محەمەد، هەولێر لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا...، ل ل ٩٢ -٩٨ .

(٧) - صديق الدملوجى، م.س، ص٧٢.

(٨) - بۆنموونە بڕوانە: موصل "جريدة"، نومرو (٦٦٢)، ربيع الاول سنة ١٣٢٠هـ — ٦ حزيران سنة ١٣١٨ر ،ص ٢.

(٩) - موصل "جريدة" ، نومرو(٦٦٢)، ربيع الاول سنة ١٣٢٠هـ — ٦ حزيران سنة ١٣١٨ر ،ص ٢.

فەرمانبەران پۆستەکانیان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکاردەهێنا[1]. لێپرسراوانیش ئەوەندە بیریان بەلای کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و داهات و باج بوو، ئەوەندە بیریان بەلای دەستەبەرکردن و فەراهەم کردنی خزمەتگوزارییەکان نەدەچوو[2].

هەندێ جاریش بەرپرسانی ئیدارەی شارەکە باجی زۆریان لە خەڵکی وەردەگرت، بۆ ئەوەی لە لەلایەن سەرودیکەیان خۆیان ڕەپێش بکەن، بۆ نموونە (مستەفا سەبری پاشا)ی قائیمقامی هەولێر لە بەرامبەر ئەو باجە زۆرەی کۆی کردەوە، سوپاس و دەست خۆشی لەسەروی خۆی ئاراستە کرا[3]، بێ ئەوەی لێی بپرسرێتەوە، کە ئەو باجە بۆچی بەم شێوەیە بەراورد لەگەڵ ساڵی پێشوو زیادی کرد.

---

(١) - موصل "جريدة" ، نومرو (٧٨٩)،٢٨ ربيع الاول سنة ١٣٢٣هـ — ١٩ مايس ١٣٢١ر، ص ٢ .

(٢) - موصل"جريدة"، نومرو(٧٨٥) ١٤ ربيع الاول ١٣٢٣هـ — ٥ مايس ١٣٢١ر" نومرو(٧٠٧)، ص ٢

(٣) - موصل "جريدة" ، نومرو(٧٨٥).

# تەوەری چوارەم

# بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بڕبڕەی پشتی ئابووری کوردستانیان پێك دەهێنا، بۆیە لە دەڤەری هەولێریش بەهەمان شێوە بوو[1]. بێگومان لەم هەلومەرجەدا زەوی لە هۆیە سەرەکییەکانی بەرهەم هێنان بوو. بەپێی یاسای خاوەنداریەتی زەوی، کە لە ساڵی ١٨٥٨ دەرچوو، دەوڵەتی عوسمانی خاوەنداریەتی زەوی بۆ پێنج جۆر زەوی دیاری کرد، ئەوانیش زەوییە تایبەتەکان ( اراضي مملوكة)، زەوی میری (اراضي ميرية)، زەوی وەقفەکان (اراضي موقفة)، زەوییە جێهێڵدراوەکان (اراضي متروكة)، زەوییە مردووەکان (اراضي موات) بوون[2] و دوادیکەش سیستەمی تاپۆی دانا[3].

(کاپتن های) لە ماوەی کۆتایی فەرمانڕەوایەتی عوسمانی دا زەوییە کشتوکاڵییەکانی هەولێری بۆ سێ بەشی سەرەکیی پۆلین کردووە. یەکەم: (تاپۆ) ئەو زەویانەبوون، کە بەگوێرەی دۆکیومێنتێکی فەرمی بە ناوی دەرەبەگێك کرابوون. دووەم: ئەو زەویانەی لەسەنتەری شار دوور بوون و بە ناوی ئەو کەسانەوە بوون، کە لەسەر زەوییەکە بوون، ئەوەش پێی دەگوترا (التحرير). زەوی سێیەمیش: سوڵتان دەستی بەسەرداگرتبوون و پێیان

---

(١) - دبليو.هي، م.س، ج١، ص ١٢١-١٣٨" هادی رەشید چاوشلی، هەولێر لە...، ل ل ٤١-٦٦.

(٢)- هرشلاغ.ز.ي، مدخل الى التاريخ الاقتصادي للشرق الاوسط، ت:مصطفى الحسني، بيروت، ١٩٧٣، ص ص ٥٤-٥٦" جميل موسى النجار، الادارة العثمانية في ولاية بغداد من عهد الوالي مدحت باشا الى نهاية الحكم العثماني(١٨٦٩-١٩١٧)، القاهرة، ١٩٩١، ص ٤٠٨" ا.م مينتيشاشڤلی، کورد/ کورتەی پێوەندی کۆمەڵایەتی — ئابووری، ڕۆشنبیری و گوزەران، و:عزەدین مستەفا ڕەسووڵ، لە چاپکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ل ٢٢٥-٢٢٦.

(٣) - بۆ زانیاری سەبارەت بە یاسای تاپۆ بڕوانە: الدستور،ج١،ص ص ٤٤-٥١.

دەگوترا زەوی سنییە (اراضي سنيية)[1]، کە سەر بە ئەولاکی هەمایۆن بوون[2]، بە واتایەکی دیکە موڵکی سەڵتەنەتی عوسمانی و سوڵتانەکان بوون[3]. هەربۆیە دەبینین (سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم) لە قەزای هەولێر چەند پارچە زەوییەکی بۆ خۆی دابڕی بوو، کە ئەولاکی هەمایۆنیان پێ دەگوترا، داهاتەکەی تەنیا بۆ سوڵتان بوو، دوای لادانی ناوبراویش داراییەکەی چووە ناو خەزێنەی وەزارەتی دارایی عوسمانی[4]. زەوییەکانی دەشتی شەمامکی هەولێر لەم جۆرە بوون[5].

زۆرینەی بنەماڵە دەوڵەمەندەکانی هەولێر پشتیان بە داهاتی کشتوکاڵی دەبەست، زیاتر لە (١٠٠) ماڵی شار خاوەن زەوی کشتوکاڵی بوون لە ناوچەکە، کە بە تێپەڕبوونی کات، بوونە خاوەنی زەوی و گوندی زۆرتر. ئەوانەی ماڵیان لە ناو شاردا بوو لەبری خۆیان کوێخای گوند، یان سەرکار ئیشوکاری گوندەکەی بۆ هەڵدەسوڕاندن،خاوەنی ئەو گوندە چەند پارچە زەوییەکی خۆی دەکێڵاو ئەوانی دیکەی بەسەر خەڵکی گوندەکەدا دابەش دەکرد کە بە (فەلاح) ناودەبران. ئەو فەلاحە رێژەیەکی[6] بەرهەمەکەی ئەدا بە خاوەن زەوییەکە. بەڵام ئەوانەی کاروباری کێڵان و چاندنی زەوییان دەکرد پێیان دەوترا جوتیار، کە لەسەرەتاوە دەگیرا تا جووت تەواو دەبوو، کرێیەکەی بە شت ومەك بوو، بڕێکی دیاری کراو لە چەند عەلبە گەنم و جۆ لەگەڵ پارە یان لەگەڵ دوو جووت پێڵاو سووتەمەنی بوو، هەروەها لەماوەی کارکردنیدا خانووی پێ دەدرا[7].

---

(١) - سنتان في كردستان ...، ج١، ص١٢١.

(٢) - موصل "جريدة"، نومرو(٧٢٢) ١٦ شعبان سنة ١٣٢١هـ–تشرين الاول سنة ١٣١٩ر" نومرو(٧٤٣) ٢٨ محرم ١٣٢٢ هـ – ١ نيسان سنة ١٣٢٠ر.

(٣) -عبدالرحمن شرف، فذلكة تاريخ دولت عثمانية، اون يكنجي طبعي، قرةبت مطبعة سي، استانبول، ١٣٢٨ هـ/ ١٣٢٦ رومي، ص ٨٤.

(4) - British Admirality, OP.Cit،P 150

(٥) - موصل "جريدة"، نومرو(٦٩٢) ٢٧ ذي الحجة سنة ١٣٢٠هـ – ١٣ مارت سنة ١٣١٩ر.

(٦) - هادی چاوشلی دەڵێ دەیەك یان هەشت یەك بوو، بەڵام پێ دەچێ ئەمە هەڵەبێ، چونکە دەوڵەت ئەوەندی لە خاوەن زەویەکان وەردەگرت، ئیتر چۆن دەرەبەگ بەوەندی رازی دەبێ، لەوانە پێنج یەك بێت.

(٧) - هادی چاوشلی، هەولێر...، ل ل ٤٧ – ٤٨.

هەولێر بــە هــۆی ئــەو پانتاییــە زەوییــەی کــە هــەیبوو، گەورەدیکــەیەن ناوەنــدی بەرهەمهێنانی دانەوێڵە بوو لــە ناوچــەکە[١]، دۆکیۆمێنتــە بەریتانییــەکان ئــەوە دووپــات دەکەنەوە[٢]. جگە لە گەنم و جۆ چەند بەرهــەمێکی دیکــەش بەرهــەم دەهێنــران، لەوانــە (پەمۆ و برنج)[٣]، بەڵام لەبەر ئەوەی برنج پێویستی بە ئاوی زۆر بوو، زیاتر ئــەو کەســانە دەیانکرد، کە ئاوی تایبەتیان هەبوو[٤]. بەشێوەیەکی گشتیی بەرهەمی کشتوکاڵی هەولێر دابەش دەکرا بۆ زستانە و هاوینە، دەغڵ و دان لە مانگی دوای باران و پەڵە لــە ســەرەتای پایز تۆ دەکرا[٥]، بەرهەمی هاوینیش لە رێگای هەڵکەندنی جۆگا یان(نــاعور) و کــارێزەوە ئەنجام دەدرا و نێزیکەی (٦٠) کارێز هەبوون[٦] شینایی و باغ و بێستانیان پێ ئاو دەدرا[٧]. لەگەڵ ئەوەشدا شێوازی کێڵان سادەو دوا کەوتوو بوو، ئامێری نوێیان بــەکار نــەهێناوە[٨]. لە ناوچە چیاییەکانیش بەرهەمەکانی وەکو گوێز ، هەنجیر ، هەرمێ ، هەنار ، سێو ، خۆخ ، ئاڵوباڵو ، قەیسی ، دیکەی ، مێوژ هەبوون، ئەو بەرهەمانە دەهێنرانە شــاری هــەولێرو لەوێ ساغ دەکرانەوە و زۆرجار بەدانەوێڵە ئاڵوێریان پێدەکرا[٩].

---

(١) - سالنامەء موصل ولایتي ، ١٣٢٥هـ ، ص١٠٣" تێگەیشتنی راستی" رۆژنامە"، ژ(٢٠)، کەرکوك، ١١ ازار ١٩١٨" ا.م مینتیشاشڤلی، کورد...،ل٢٤.

(2)- F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray, 16 the July,1919.

(٣)- هۆشــیار عەبــدوڵڵا، جوگرافیــاو مێــژوو و ڕیشــەی نــاوی هەنــدێك لــە گونــدەکانی دەشــتی هــەولێر، هەولێر"گۆڤار"، ژ(١١)، هاوینی ٢٠٠١، ل ١٠١.

(٤) - مەهدی محەمەد، هەولێر لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا...، ل ١٣.

(٥) - ا.م مینتیشاشڤلی، کورد...ل٢٤.

(٦) - سەبارەت بە کارێزەکانی هەولێر بڕوانە:عبدالرحمان گەزنەیی، اربیل ...، ص ٣٣" دبلیو. هي، م. س، ج١، ص ص٣٧-٤٠.

(٧) - هادی چاوشلی، هەولێر لە... ، ل ل ٥٧ — ٥٨.

(٨)- کاپتن لاین، کورد عەرەب بەریتانییەکان/ بیرەوەرییــەکانی کــاپتن لایــن لەمــەڕ ڕووداوەکــانی باشــووری کوردستان، و: یاسین سەردەشتی، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ل ١٥٨-١٥٩" هــادي رشــید الجاوشــلي، المظــاهر الاقتصادیة في تراث منطقة کردستان،ط١، بغداد، ١٩٨٧، ص ص ٢٦-٢٨.

(٩) - کاپتن لاین، س.پ، ل ١٤٩.

هەرچی ئاژەڵداریش ئەویش بەشێکی گرنگی چالاکی ئابووری هەولێری پێکدەهێنا، سەرچاوەیەك ژمارەی مەڕو بزن و ڕەشەوڵاغەکانی هەولێر تا ساڵانی سییەکان بە ملیۆنێك مەزەندە دەکات[1]. ئەو سامانە بەرهەمی زۆری هەبوو، وەك: شیرو ماست و پەنیرو ژاژی ، قەیماغ و لۆر، سەرەڕای خوری ، موو ، پێست ، ڕوون ، گۆشتەکەی جگە لەمەماڵەکانی ناو شارو گوندەکانی دەوروبەریش پەلەوەریان بەخێودەکرد، وەك مریشك، قاز، مراوی، کە پێداویستی شارو گوندی دەستەبەر دەکرد[2]. بەمەش پێویستیان بە هاوردەی دەرەکی نەدەبوو.

بازرگانیش لایەنێکی دیکەی ئابووری هەولێری پێکدەهێنا، بەتایبەتی کە هەولێر بەهۆی ئەو شوێنەی کە هەیبوو، خاڵی کۆکردنەوەی بەرهەمی ناوچە چیایی و ناوچە گوند نیشینەکانی دەشتی هەولێر بوو، لەبەر ئەوەش ڕێگایەکی هاتوچۆی ئاسانی هەبوو لەگەڵ هەر یەکە لە کەرکووك و موسڵ، بۆیە کەوتبووە سەر ڕێگایەکی بازرگانی گرنگ[3]، کە ڕێگای ( بەغدا- کەرکووك- پردێ- هەولێر- موسڵ) بوو[4].جگە لەوەش هەولێر دوو ڕێگەی دیکەی لێ دەبووە بە ئاراستەی باکووری ڕۆژهەڵاتی تێپەڕدە بوون بەرەو ئێران، کە یەکێکان بە ئاراستەی ڕەواندزدا دەڕۆیشت لە باکووری ڕۆژهەڵاتی، ڕێگایەکی دیکەش لە ڕۆژهەڵاتی بە کۆیە تێپەڕ دەبوو[5]. ئەو دوو ڕێگایە بریتی بوون لە: ڕێگای (هەولێر-

(١)- هادی چاوشلی، هەولێر لە...، ل٤١ . ڕەنگە زیادە ڕۆیی لە ژمارەکەی هەبێت.

(٢) - هادی جاوشلی، هەولێر لە...، ل ل ٤١ -٤٠.

(٣) - د.سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية...، ص ٥٧.

(٤) - بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، گەشتێك بە عەرەبستان و کوردستان و ئەرمەنستاندا، و:حەمید عەزیز، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر،٢٠٠٤، ل ٣١" محمد بن احمد الحسيني المنشيء البغدادي، رحلة المنشيء البغدادي ت: المحامي عباس العزاوي، دار الجاحظ، بغداد، ١٩٧٠، ص٥٠.

(٥) - زبير بلال اسماعيل، تاريخ اربيل...،ص ٢٠٧.

ڕەواندز - ورمێ — تەبریز)[1]، لەگەڵ ڕێگای (هەولێر —پشدەر /قەلآدزێ — ورمێ — بانە)[2]، دیسانەوە ڕێگەی بازرگانی (هەولێر - کۆیە — سلێمانی)ش هەبوو[3].

بازرگانانی هەولێر پەیوەندییان لەگەڵ چەند کۆمپانیایەکی مارسیلیای ئیتاڵی بەستبوو، هەروەها هەولێر پەیوەندی بازرگانیشی لەگەڵ ئێراندا هەبوو، بە تایبەتی لە ڕووی هێنـانی کوتاڵ، ئاوریشم، سەماوەر و چەند کەلوپەلێکی جوانکاری دیکە، بەڵام هـەناردەی هـەولێر زیاتر لە بەرهەمی کشتوکاڵی بە تایبەتی(گەنم و جۆ) و بەروبوومە ئاژەڵییەکان پێکهاتبوو، کە ڕەوانەی بەغداو موسڵ و شارو وڵاتانی دیکە دەکـران. ئـەوەتا گـەنمی هـەولێر تـاپێش هەڵگیرسانی یەکەمین جەنگی جیهانی ڕەوانەی ئەورووپا دەکرا. هەروەها هاوردەی سەرەکیی هەولێریش: چای، شەکر، قاوەو کەلوپەلە دروستکراوەکان بوو[4].

لە بواری پیشەگەریش لە هەولێردا چالاکی هەبوو، لەم شارەدا چەندین پیشەی دەسـتی هەبوون، لەوانە: ( ئاسنگەری، پێڵاودروو، چەخماخچـی، بەرگـدووری، دارتاشـی، زێرنگـرو جۆلآیی)، کە ئەوە بە ڕوونی لە ئاماری سـاڵی ١٩٢٢دا هـاتووە[5]. دیـارە جگـە لەمانـە پیشەی (خەمگەری)ش هەبوو، کە زیاتر جوولەکەکان پێـوەی خـەریك بـوون[6]،هـەموو ئـەو

(١) - خليل علي مراد، تاريخ العراق الاداري و الاقتصادي في العهد العثماني (١٠٤٨ -١١٦٤هـ/١٦٣٨ - ١٧٥٠ م) جامعة بغداد، كيلة الاداب، ١٩٨٧،ص ٤١٠.

(٢) - عماد عبدالسلام رؤوف، الموصل في العهد العثماني/ فترة الحكم المحلي (١٧٢٦ -١٨٣٤)،ط١،النجف الاشرف، ١٩٧٥، ص ص ٢٩٥ -٢٩٨" روبرت دبيلو اولسن، حصار الموصل و العلاقات العثمانية الفارسية (١٧١٨ — ١٧٤٣)، ت: عبدالرحمن بن الحاج امين بك الجليلي، الرياض، ١٩٨٣، ص ٥٥" يوسف غنيمه، تجارة العراق قديما و حديثا، بغداد، ١٩٢٢، ص ١٠٥.

(٣) - عماد عبدالسلام، الموصل...، ص٢٩٨.

(٤) - دبيلو. هي، م.س،ج١، ص ص ١٢٣- ١٣٨.

(٥) - بڕوانە: تاريق جامباز و نەژاد بـەرزنجی، س.پ، ل ل٦٣-١٦٣" جلال عبدالجبار المختار، اربيل كما عرفتها، ص٥. دەستنووسێکە دانـە ڕەسـەنەکە لـەلای مـەولود بێخـاڵی پـارێزراوە و لێتـۆژیش وێنەیـەکی لەبەرگرتووە.

(٦) - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نورەدین دەباغ.

پیشانەو فرۆشتنی کەلوپەلەکانی دیکە لەچوارچێوەی بازاڕی قەیسەری ڕێکخرابوو، کە مەڵبەندێکی گرنگی کڕین و فرۆشتن و بازرگانی بوو[١].

سەبارەت بەو دراوانەی کە لە هەولێر بەکاردەهێنران، دەتوانین بڵێین هەتا یەکەمین جەنگی جیهانیش بە لیرەی تورکی[٢] مامەڵە دەکرا، کە بەهای هەر لیرەیەك کەمتر بوو لە پاوەنێکی ئینگلیزی، لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠ یەك لیرە بەرامبەر (١٤) ڕوپییە[٣] بوو، دواتر لەدوای هاتنی بەریتانییەکان دراوی کاغەزی هیندی لە برەو دابوو[٤].

لەگەڵ جاڕدانی (سەفەر بەلگ) لەساڵی ١٩١٤و ڕەشبگیرکردنی پیاوەکان زۆرێك لە گەنج و لاوانی شار بە مەبەستی خۆدزینەوە لە جەنگ، ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ هێشت و ڕوویان لە ناوچە شاخاوییەکان کرد — وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا-، ئەوەش وایکرد لە ماوەی یەکەمین جەنگی جیهانی ، (٥٠٪)ی زەوییەکانی کوردستان تۆ نەکرێن، دەشتی هەولێریش تۆ نەکراو بە بەیاری مایەوە، هەرچەندە خودان پانتاییەکی گەورەی زەوی کشتووکاڵی بوو و بە باشدیکەیەن ناوچەی بەرهەمهێنانی دانەوێڵە دادەنرا[٥].هەر بەهۆی جەنگەوە ئاستی بەرهەمهێنان دابەزینی بەرچاوی بەخۆ بینی و هێنانی کەلوپەل و جموجوولی بازرگانی زیانی گەورەی بەرکەوت[٦]. دەکرێ بڵێین هێزی کار بە تەواوی پەکی کەوتبوو، چونکە زۆرینەی گەنج و لاوەکان و ئەوانەی توانای کارکردنیان هەبوو ڕ ایێپچی بەرەکانی شەڕ کرابون، یاخود بەهۆی خۆ دەربازکردنیان لە دەست خزمەتی سەربازی ڕوویان

---

(١) - مولود بێخاڵی، هەولێرم وادیوە...،ب٣، ل ل٣٠٢-٣٠٣" جلال سنجاری، هونەری بیناسازی و نیگار لە بازاری قەیسەری و قەلاتی هەولێردا، هەولێر"گۆڤار"ژ(١٦)، ٢٠٠٢، ل٧٦.

(٢)- یەك لیرەی زێری تورکی دەیکردە ١٠٠قرش. عباس العزاوي، تاريخ النقود العراقية...، ص١٣٨.

(٣) - ڕووپییە دراوێکی هیندی بوو، تا دەرچوونی دراوی نیشتمانی لە ساڵی ١٩٣٢ لە عێراق کاری پێدەکرا، لەو کاتەی هەر ڕووپییەك بەرامبەر بە ٧٥ فلسی عێراقی بوو. د.خليل علي، مختارات من كتاب ..، ص ١٧٥.

(٤) - دبليو.هی، م.س، ج١، ص ص١٣٧ - ١٣٨.

(٥) - د.كمال مظهر، كردستان في سنوات...، ص ٢٢٩.

(٦) - ل.ن. كوتلوف، ثورة العشرين الوطنية التحررية في العراق، ت: عبدالواحد كرم، مطبعة الجمهورية، بغداد،١٩٧١، ص ٦٧.

له ناوچه شاخاوییه‌كان كردبوو، هه‌ربۆیه زیاتر پیرو په‌ككه‌وته و ئافره‌ت و منداڵان مابوونه‌وه، ئه‌وانیش وه‌به‌رهێنانی زه‌وییه‌كانیان پێ هه‌ڵنه‌ده‌سووڕا، بۆیه زۆرینه‌ی زه‌وییه‌كان به به‌یاری مابوونه‌وه، كه ئه‌وه‌ش زیانێكی گه‌وره‌ی به كه‌رتی كشتوكاڵی گه‌یاند، هه‌روه‌ها بازرگانیش به هۆی پشێویی و نائارمییه‌كانه‌وه په‌كی كه‌وت.

سه‌ره‌ڕای ئه‌و هۆكارانه، وشكه ساڵی و باران نه‌بارین، هه‌روه‌ها تالانكردنی ناوچه‌كه له‌لایه‌ن سه‌ربازانی عوسمانی، نه‌هامه‌تی و برسیه‌تییه‌كی گه‌وره‌ی له ساڵی **١٩١٧** نایه‌وه، كه له هه‌ولێر به (گرانی گه‌وره) ده‌ناسرێت[١]. چونكه خه‌ڵكی به جۆرێك برسیه‌تی تینی بۆ هێنابوون، كه هه‌ندێكیان له برسان په‌نایان بۆ خواردنی گۆشتی سه‌گ و پشیله و گوێ درێژ بردووه[٢]، ته‌نانه‌ت له هه‌ندێ كاتی ده‌گمه‌ندا ده‌ستیان له گۆشتی مرۆڤیش نه‌پاراستووه[٣]. وای لێهاتووه خه‌ڵكانێكی زۆر ته‌نیا به نان و زگ كاریان ده‌كرد[٤]، یاخود له به‌یانی تا ئێواره به (٢)نان كاریان ده‌كرد، عه‌لبه‌ی گه‌نم ئه‌وكات گه‌یشتۆته (٩٦) لیره و ڕبه‌ی (خوێ) به (١٠) لیره بووه[٥].

له‌م سه‌روبه‌نده‌دا ناكرێت ڕۆڵی هه‌ندێ له ده‌وڵه‌مه‌ندانی شار له‌به‌رچاو نه‌گرین، كه له‌م برسیه‌تیی و قاتوقڕییه‌دا هه‌ندێكیان ده‌ستی یارمه‌تیان بۆ هه‌ژاران و لێ قه‌وماوان درێژكردووه و ده‌وڵه‌مه‌ند هه‌بووه ڕۆژێ دووجار شۆرباو نانی به‌سه‌ر هه‌ژارانی شاردا دابه‌ش كردووه[٦]. هی دیكه هه‌بووه- به‌رهه‌مه كشتوكاڵییه‌كانی به نرخێكی كه‌م خستۆته بازاڕ،

---

(١) -چاوپێكه‌وتن له‌گه‌ڵ ئیحسان ڕه‌شاد موفتی.

(٢) - چاوپێكه‌وتن له‌گه‌ڵ حاجی نوره‌دین ده‌باغ.

(٣) - چاوپێكه‌وتن له‌گه‌ڵ د.عه‌بدوڵڵا حه‌داد.

(٤) - چاوپێكه‌وتن له‌گه‌ڵ حاجی نوره‌دین ده‌باغ.

(٥) - مه‌لا محه‌مه‌د عه‌لی عه‌لیاوه‌یی، س.پ، ل٢٠١.

(٦) - چاوپێكه‌وتن له‌گه‌ل عوسمان موفتی، له به‌رواری ١٢ /١٠ / ٢٠٠٧، ناوبراو یه‌كێكه له كه‌سایه‌تیه دیاره‌كانی بنه‌ماڵه‌ی موفتی شاری هه‌ولێر له‌ساڵی ١٩٤٨ له قه‌ڵای هه‌ولێر دایك بوو، چه‌ندین نووسینی له‌سه‌ر هه‌ولێر هه‌یه، ئێسته ڕاوێژكاری یه‌كه‌مه له وه‌زاره‌تی ئه‌وقافی حكومه‌تی هه‌رێمی كوردستان. مه‌هدی محه‌مه‌د قادر، هه‌ولێر له نێوان ساڵانی ١٩١٤-١٩٤٠/ تویژینه‌وه‌یه‌كی مێژوویی یه- له‌باره‌ی بارودۆخی

زۆرجاریش بە خۆڕایی بەسەر هەژارانی دابەش کردووە[1]، هەروەها دەوڵەمەندی دیکە هەبوو، دەستی یارمەتی بۆ هەژارانی شار درێژکردووە و شوێن و جێگەی بۆ زۆرێك لەو خێزانانە دەستەبەرکردووە، کە بە هۆی هێرشی ڕووسەکان و نائارامیەکانی ئەو کات لە مەندەلییەوە ڕوویان لە هەولێر کردبوو[2]. دەستکراوەیی پیاوانی هەولێر نەك لە یارمەتیدانی هەژاران، بەڵکو پێشدیکەش زۆرجار کۆمەك ویارمەتیان بۆ ڕێوشوێنەکانی حەج کردن فەراهەم دەکردو ڕەوانەی حیجازیان دەکرد[3].

لە کۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانی لە ڕووی پێکهاتەی نەتەوەییەوە، کورد زۆرینەی دانیشتووانی هەولێریان پێکدەهێنا[4]، لە دوای ئەویش تورکمان و عەرەب و کلدان[5] (مەسیحی) و عبریی (جوولەکە) دەهاتن[6].

لە ڕووی ئاینییەوە زۆرینەی دانیشتووان موسڵمانی سوونە مەزهەب بوون لەسەر پەیڕەوی ئیمامی شافعی، جوولەکە (جوولەکەی)یش لە شارەکەدا هەبوو، کە ژمارەیان

---

کۆمەڵایەتی و ئابووری و کارگێڕی و سیاسی، چ١، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٨. ل ٥١.

(١) - هادي الجاوشلي، تراث اربيل...، ص ٢٨.

(٢) - موسى عمران، مندلي عبر االتاريخ، ط١ مطبعة الحرية، بغداد،١٩٨٣، ص ص ٩٣- ٩٥ .

(٣) - لەم بارەیەوە بڕوانە: موصل "جريدة"، نومرو(٦٩٣) ٢٧ محرم سنة ١٣٢١هـ — ٢٠ مارت سنة ١٣١٩ر " نومرو(٦٩١) ٢٠ ذي الحجة سنة ١٣٢٠هـ— ٦ مارت سنة ١٣١٩ر.

(٤) - شمس الدين سامي، م.س ،مج٣، ص٨٢١ " دبيلو. هي، م.س، ج١، ص ٥١" ا.م مينتيشاشڤلی، کورد... ل٤٩.

(٥) - سالنامەء موصل ولايتي ١٣٢٥هـ، ص ٢١٩" دڵدار عەبدولغەفور باڵەکی( وەرگێڕ)، کوردستانی عێراق لە گەشتەکەی (جۆنستن بێرکنس) لە ساڵی ١٨٤٩، هەولێر"گۆڤار"، ژ(٧)، هاوینی ٢٠٠٠، ل ٩٣ .

(٦) - لە بارەی مێژووی جولەکە لە کوردستان و داب و نەرتیان بڕوانە: احمد باوەڕ، جولەکەکانی کوردستان، چ١، هەولێر، ٢٠٠٠" ايراك براور، يهود كردستان، ت:شاخوان كركوكي وعبدالرزاق بوتاني،ط١، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٤" هەروەها عەباس سلێمان سمایل، ڕیشەی جولەکەکانی کوردستان و داب و نەریتیان لە پارێزگای هەولێر، هەولێر"گۆڤار"، ژ(٤)، بەهاری ٢٠٠٢، ل ل ٩٠ -١٠٠.

نێزیکەی هەزار کەسێك دەبوو[1]، ئەو جولەکانە پەرستگا(کەنیشت)ی تایبەت بە خۆیان هەبوو، کە لەسەرەتادا لە گەڕەکی تۆپخانە بوو، دواتر بۆ خوارەوەی قەلاّ گوازرایەوە[2]، پەیڕەوانی ئاینی مەسیحی ش[3] لە هەولێر هەبوون، زۆرینەیان لەسەر مەزهەبی کاسۆلیك بوون[4].

کلدانییەکان زیاتر لە عەنکاوە نیشتەجێ بوون لەگەڵ ئەوەشدا ڕێژەیەکی کەمیان لەناو شاردا هەبوو[5]. عبرییەکان (جوولەکەکان) بە زۆری لە گەڕەکی تەعجیل نیشتەجێ بوون، تەنانەت بەشێکی تەعجیل پێی دەگوترا تەعجیلی جولەکان _ وەك پێشتر باسمانکرد -، و ژمارەیەکیان لە گوندەگانی دەوروبەری هەولێر بلاّوببوونەوە[6]، عەرەبەکانیش زیاتر لەگەڕەکی عەرەب نیشتەجێبوون[7].

لەڕووی چینایەتیشەوە دەکرێت کۆمەڵگەی هەولێر بۆ سێ چینی سەرەکیی دابەش بکەین، ئاغاو دەرەبەگ و بازرگانە گەورەکان و ساماندارەکان، چینی ئەرستۆکراتی

---

(١) - هادی چاوشلی، هەولێر لە...، ل١٢" بەلاّم بە پێی ئامارێك لە ساڵانی (١٩١٨ -١٩١٩) ژمارەی جولەکەکانی هەولێر ٤ هەزار و ٨٠٠ کەس بوون. د.فاضل البراك، المدارس اليهودية و الايرانية في العراق دراسة مقارنة، ط٢، بغداد، ١٩٨٥، ص٦٣" عەباس سلێمان ، ریشەی جولەکانی ... ، ل ١٠٠. بەلاّم دەبێت ئەمە ژمارەی تەواوی جولەکەکانی هەموو ناوچەی هەولێر بێت.

(٢) -جلال عبدالجبار المختار، م.س، ص ٤. جێگەی باسە هەندێك لەو جولەکانەی هەولێر لەو ماوەیە موسڵمان بوون، بڕوانە: موصل"جريدة"، نومرو(٧٤٤) ١٩ سفر سنة ١٣٢٢ — ٢٢ نيسان سنة ١٣٢٠.

(٣) - مەسیحیەکان بەزمانی کلدانی(سریانی ڕۆژهەلاّتی) قسە دەکەن، لە هەولێر ڕەگ و ڕیشەیەکی درێژیان هەیە، لەم بارەیەوە، بڕوانە: ئیدوارد زاخاو، کرۆنۆلۆژیای ئەربێلا/ کۆندیکەی‌ن دەستنووس لەبارەی بلاّوبوونەوەی ئاینی عیسایی لە کوردستان، و:عەبدولمؤمین دەشتی، بەرلین، ١٩٩٥" حنا عبدالاحد روفو، م.س، ص٢٥، نوری پەترۆس، دەستنوسێکی کلدانی لەبارەی مێژووی هەولێر، هەولێر"گۆڤار"، ژ(٥)، زستانی ٢٠٠٢، ل ١١٥ — ١٢٢.

(٤) - حنا عبدالاحد روفو، لمحة عن...، ص ٢٥.

(٥) - ساکار بهاالدین، م.س، ص ٥١.

(٦) - هۆشیار عەبدوڵلا، جولەکەکانی ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر، هەولێر"گۆڤار"، ژ(١٣)، کۆتایی ٢٠٠١، ل ٥٩.

(٧) -ئارارات احمد عەلی، کۆلاّنی عارەبان، هەولێر"گۆڤار"، ژ(١٧)، هەولێر، خولی دووەم، ٢٠٠٦، ل ٧.

هەولێریان پێکدەهێنا[١]. ئەو چینە خودان دەسەڵات و دەست ڕۆیشتوو بوون. چینی ناوەڕاستیش لە فەرمانبەرانی حکومی و زانایانی ئاینی و کەمینەی ڕۆشنبیر پێکهاتبوون[٢]، هەروەها بازرگانە بچووکەکان و دوکاندارەکانیش دەگرێتەوە[٣]. سەبارەت بە قەبارەی ئەو چینە بۆچوونی جیاواز هەیە، سەرچاوەیەك بەزۆرینەی دانیشتووانی دەزانێت[٤]و سەرچاوەیەکی دیکەش ئەو بۆچوونە ڕەتدەکاتەوەو پێداگیری لەسەر ئەوە دەکات، چینی سێیەم، کە لە کاسبکارو کرێکار و خاوەن پیشەو کۆمەڵەی دیکەی شارەکە پێکهاتوون، زۆرینەی دانیشتووانیان پێك دەهێنا[٥]. لەگەڵ ئەوەشدا تێبینی دەکرێت ئەو جیاوازییە چینایەتیەی کە لە ئەورووپا هەبوو، لە هەولێر بەو ڕادەیە بەرچاو نەبوو[٦]. لە هەولێر چەندین بنەماڵەی گەورەو دەست ڕۆیشتوو هەبوون کە دیاردیکەینیان بنەماڵەکانی: ( مەلا فەندی، یەعقوب ئاغا، دۆغرەمەچییەکان، چەلەبی، ئەلنەقیب، عوزێرییەکان، بیرەقدار، ڕەشید ئاغا، دەباغەکان) بوون[٧].

دانیشتووانی شاریش لەگەڵ ئەوەی زۆرینەیان خانووی خۆیان هەبوو، بەڵام کرێچیش لە شارەکە بوونی هەبوو[٨]، کرێکارو ڕەنجبەری کشتوکاڵ، کە سەپانیشیان پێ دەگوترا زۆرینەیان بێ خانوو بوون. هەربۆیە بەشی زۆریان کرێچی بوون، بەڵام هەندێکی دیکەیان لەو حەسارانەی[٩]

---

(١) -اسماعیل شکر، اربیل...، ص ٢٥" مولود بێخاڵی، هەولێرم وادیوەو.... بیستووە، چ١، ب١، بەغدا،١٩٩١.ل ٧٦.

(٢) - اسماعیل شکر، اربیل...، ص٢٦.

(٣) - مولود بیخاڵی، هەولێرم وادیوە و...، ب١، ل ٨٣.

(٤) - مەهدی محمد قادر، هەولێر لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا...، ل ٧٦.

(٥) - اسماعیل شکر، اربیل...، ص ٢٧.

(٦) - هادي الجاوشلي، تراث اربيل ...، ص ٧٨.

(٧) - لە بارەی خانەوادەکانی هەولێر بڕوانە: مولود بێخاڵی، هەولێرم وادیوەو.. بیستوە، ب،٢، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری ، هەولێر، ١٩٩٧، ل ٥٨و دواتر.

(٨) - تاریق جامباز و نەژاد بەرزنجی، س.پ، ل ٥٨

(٩) - لە بارەی خان و حەسارەکانی هەولێر بڕوانە: پیرداود مەخموری، هەولێر (خان و حەسار)، هەولێر" گۆڤار"، ژ(٢)، هەولێر، ١٩٩٩،ل ٨٩.

خواررووی قەڵات نیشتەجێ ببوون، کـە پیـاوە دەوڵەمەنـدەکانی شـار بـۆ جوتیـارو سـەپانەکانیان دروستیان کردبوو. ئینجا ئەگـەر ژووری زیـاد هەبووایـە، ئـەوا ئـەو ژوورانـەی حەسـاریان وەکـو (عەمبار) بۆ بەرهەمە کشتوکاڵیەکانیش بـەکاردەهێنا، یـاخود ئـەو ژوورانـە مانگانـە بـە کـرێ دەدرانە کرێکارەکان، حەسارەکانیش بەناوی خاوەنەکانیان، یان ئەو شوێنەی لێـی دروسـت دەکـرا، دەناسران[1].

لە ناوچەکانی دەوروبەری هـەولێر، چـەندین هـۆزی کـورد هـەبوون، کـە لـە ڕووی ژمـارەو ڕووبەری ناوچەکانییان لە یـەکتر جیـاواز بـوون، وەك دزەیـی، گـەردی، خۆشـناو[2]، هـەروەها مەمونـدی، شـێخانی، شـێخ بـزێنی، زراری، هـەرکی، خـەیلانی، شـێروانی، لـەك، بلْبـاس، هورمزیار، سورچی، باڵەکی، مەنگوڕ، بابۆڵی، سیان، نانەکەلی[3]، کە هەریەك لەمانە یـەکێك سـەرۆکایەتی دەکـردن پێـی دەگـوترا (ئاغـا)[4]، هەنـدێ جـاریش پێیـان دەگـوترا (مـیر) وە بەگ)یشیان پێ دەگوتران، وەك خۆشناوەکان. وەرگرتنی دەسەڵات لـەم هۆزانـە بـەپێی نـەریتی هۆزەکە و کات و سات دەگۆڕا، یان بە هەڵبژاردن، یان بە پشتاوپشت بوو، یاخود بە زەبری هێـز بوو[5]، پێکدادانی نێوان هۆزەکانیش بەشێك بوو لە خەسڵەتەکانی ئەو ماوەیە[1].

---

(١) - هادی چاوشلی، هەولێر لە...، ل١٢.

(٢) - هۆزی خۆشناو لە ناوچەکانی شەقلاوەو بتوێن و کۆیە نیشتەجێ بوون و نزیکەی ١٠٠٠ خێزان دەبـوون و ژمارەیان ئەوکات خۆی لە ١٠ هەزار کەس دەدا، لە شەقلاوە ١٠٠ گوندیان هەبوو، ئەم هۆزە لە سێ بـەش پێکهاتبووە، (قادر بەگ) بە سەرۆکی بنەڕەتی ئەم هۆزە دادەنرا و سەرۆکی (میرمەحمەلی)بووە، (رەشید بەگ) یاریدەدەری بوو لە بـەڕێوەبردنی کاروبـاری هۆزەکـەدا و (میریوسـفی) لەلایـەن (سـاڵح بـەگ و خدربـەگ) و (پشتگەلی) لەلایەن (احمد بەگ)ەوە بەڕێوەدەبران. عباس العزاوی ، عشائر...، ص ص ١٢٩ -١٣٣" مارك سایکس، القبائل...، ص ٤١ " کەیوان ئـازاد ئـەنوەر، هـۆزە کوردەکـانی عێـراق، پـەیڤین "گۆڤـار"،ژ(٩)، سلێمانی، تەمموزی ٢٠٠٠، ل ١٨٥.

(٣) - جلال عبدالجبار المختار، م.س، ص ٩.

(٤) -ا.شامیلوف، حول مسالة الاقطاع بین الکرد، ت: کمال مظهر،مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٨٤، ص٤٧.

(٥) - تومابوا،لمحة عن الاکراد/ وحالتهم الاجتماعیة و الادبیة و الثقافیة، ت: محمد شـریف عثمـان، مطبعـة النعمان، النجف الاشرف، ١٩٦٩، ص٤٠.

دەسەڵاتدارانی عوسمانی هەوڵیاندا ڕایەڵی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ پیاو ماقوڵانی شارو دەوروبەری پتەوبکەن، بۆ ئەو مەبەستە پلەوپایە و نازناوی جیاجیایان پێ بەخشین، هەروەها هەوڵیاندا لە دەزگایەکدا کۆیان بکەنەوە. لەم چوارچێوەیەدا سەندیکای پیاوماقووڵان (نقابة الاشراف) لە هەولێر بە هاندان و پاڵپشتی سوڵتان (مەحمودی دووەم)( ١٨٠٨ - ١٨٣٩) لە ساڵی (١٨١٨) دامەزرا. (سەید ئەحمەد ئاغای ئالسەید ئەحمەد) بە سەرۆکی سەندیکای پیاوماقوڵانی شار هەڵبژێردرا[٢]. هەر ئەو بنەماڵەیە، کە بە خانەوادەی (ئەلنەقیب) ناسراون، ئەندامەکانیان چەندین پلەوپایە و نازناوی گەورەیان لەلایەن سوڵتانەکانی عوسمانی پێ بەخشراوە[٣]، لەوانە: نازناوی (پاشا) و پلەی (میری میران)[٤]، زۆرێك لەم فەرمانانە لەلایەن خانەوادەکەیان پارێزراون، هەموو ئەوانەش گەواهیدەری بەهێزی و توونـدوتۆڵی پەیوەندی نێوان ئەو بنەماڵەو دەسەڵاتی ناوەندی عوسمانییەکانن.

بنەماڵەی حەیدەرییەکانیش بە تایبەتی (ئیبراهیم ئەلحەیدەری)[٥]، لە دەرباری عوسمانییەکان نزیك بوون، ناوبراو چەندین پلەو پایەی لە دەوڵەتی عوسمانی وەرگرت،

---

(١) - بۆ نمونە بڕوانە: دبلیو هي،م.س، ج١، ص ص ٩٧ — ٩٨“ هەروەها: تەڵعەت مشیر ابراهیم ئاغا دزەیی، حەبیب ئاغا و...چەند تێبینی یەك، کاروان "گۆڤار"، ژ(٧)، ساڵی حەوتەم، کانوونی یەکەم، ١٩٨٨، ل ٩٢.

(٢) - سەید بەرزۆ ئەلنەقیب ئەلڕوفاعی، جڤاتی پیاو ماقولانی (لیوا)ی هەولێر، و: ئەکرەم مولود ڕۆستەم، هەولێر "گۆڤار"، ژ(١٧)، هەولێر، هاوینی ٢٠٠٦، ل ١٣٢.

(٣) - سەید بەرزۆ ئەلنەقیب ئەلڕوفاعی، خانەوادەی هەولێر، گۆڕین و ئامادەکردنی لە عەرەبیەوە بۆ کوردی: ئەکرەم مولود ڕۆستەم، هەولێر"گۆڤار"، ژ(١٧)، هەولێر، هاوینی ٢٠٠٦، ل ١١٨“ بوتان جلال،م.س، ص ٣٥.

(٤) - مصطفى اربيلي، م.س“ بوتان جلال، م.س، ص ٣٥.

(٥) - ئیبراهیم حەیدەری (١٨٦٤ -١٩٣١)، لە ڕۆژگاری پاشایەتیشدا چەندین پلە و پایەی پێ سپێردرا، لە ساڵی ١٩٢٤ لە کابینەکەی "یاسین هاشمی" وەزیری ئەوقاف بوو، هەروەها ئەندامی ئەنجومەنی پیاو ماقوڵان بوو لە ساڵی ١٩٢٥دا، لە ڕێککەوتی یەکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣١ لە شاری بەغدا مردووە. بڕوانە: میر بصري، اعلام الكرد، ،ص ص ١٦٣-١٦٦.

ماوەیەك لە ساڵی ١٩١٥ ئەندامی خانەی حیکمەی ئیسلامی(دار الحكمة الاسلامية) بوو، دواتر لە یەکەمین جەنگی جیهانی پایەی (شیخ الاسلام)ی وەرگرت، کە لە دەوڵەتی عوسمانی بەرزدیکەی‌ن پایەی ئاینی بوو[1].

سەبارەت بە خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتیەکان دەبینین خزمەتگوزاری تەندروستی هەولێر لەم ماوەیەدا لە ڕەوشێکی ناهەمواردا بوو، چارەسەری نەخۆشی جەستەیی و دەرونی و ئەقڵییەکان زۆر سەرەتایی بوو. بۆ چارەسەرکردن بە زۆری پشتیان بە دوعاو نووشتەو دەرمانی میللی دەبەست[2]. شکان و لەجێچوونی ئێسك لەلای بەیتارەکان چارەسەری بۆ ئەنجام دەدرا، بەڵام لە دوای کودەتای ئیتحادییەکان لە ساڵی ١٩٠٨، یەکەم نەخۆشخانە لە هەولێر کرایەوە، کە دکتۆر (عەبدولئەحەد عەبدولنوور) سەرپەرشتیارو بەڕێوەبەری بوو، هەرچەندە هەندێ نووسەر بە یەکەمین پزیشکی دادەنێن، کە ڕێنمایی خەڵکی کردبێ بۆ بەکارهێنانی دەرمانی هاوچەرخ[3]، بەڵام زانیارییەکانی ڕۆژنامەیەکی سەردەمی عوسمانی ئەو بۆچوونە ڕەتدەکاتەوە و ئاماژە بەوە دەدا کە لە ساڵی ١٩٠٢ دکتۆرێك بە ناوی (نەجمەدین ئەفەندی) لە هەولێر هەبوو کە سەر بە شارەوانی شارەکە بوو[4]، دواتر لەدوای ساڵی ١٩١٨ پزیشکێك بە ناوی (ولیم سۆن) لە شارەکە دامەزرا[5] .

سەبارەت بە ڕەوشی خوێندنیش لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە خوێندنی فەرمی گەیشتە کوردستان، بەپێی ساڵنامەی عوسمانی ساڵی ١٨٩١، قوتابخانەی ڕوشدییە لەم ساڵەدا لە هەولێر هەبوو، (عەبدولحەکیم ئەفەندی) مامۆستای یەکەم و (عەبدولقادر

---

(١) - د.أسماعيل شكر، م.س، ص ٢٨.

(٢) - عوسمان موفتی، ژیانی کۆمەڵایەتی قەڵای هەولێر لە سەدەی بیستەم دا، هەولێر"گۆڤار"،ژ(٢)، هەولێر، بەهاری ١٩٩٩، ل ٣٧.

(٣) - مەهدی محمد،هەولێر لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا....، ل ٨١ " ماهیر عەبدول ئەمیر عزیز، ژیانی کۆمەڵایەتی بەر لە شارستانیەت لە شاری هەولێردا، هەولێر"گۆڤار" ژ(٦)، هەولێر، بەهاری ٢٠٠٠، ل ٣٢.

(٤) - موصل "جريدة"، نومرو(٦٧٤)،٢٣ جمادي الاخر سنة ١٣٢٠هـ – ١٢ ايلول سنة ١٣١٨ر.

(٥) - لە بارەی مێژووی پزیشکی و ڕەوشی تەندروستی هەولێرو دکتۆرەکانی بروانە: الدكتور ابرهيم طاهر معروف الرباتي، معجم اطباء محافظة اربيل / الاطباء –اطباء الاسنان –الصيادلة،ط١، اربيل، ٢٠٠٤.

ئەفەندی) مامۆستای دووەم بوون[1]، تا ساڵی ١٩٠٤ (عەبدولحەکیم ئەفەندی) لە هەولێر مامۆستا بوو[2]، هەروەها لە ساڵنامەی ١٩١٢دا دەبینین، کە (عەبدولقادر ئەفەندی) تا ئەو ساڵەش لە هەولێر مامۆستابووە و (٢٩) قوتابی هەبوو، هەر ئەو ساڵنامەیە ئاماژە بەوە دەکات، کە (٢) قوتابخانەی دیکەی سەرەتایی هەبوون، ئەوانیش قوتابخانەی سەرەتایی قەڵات، کە هەریەك لە (رەئوفە فەندی) و (مستەفا فەندی) تیایدا مامۆستابوون و ژمارەی قوتابیانیشی (٦٩) قوتابی بوون، لەگەڵ قوتابخانەیەکی دیکەی سەرەتایی، کە (مەولودە فەندی) و (عەبدولکەریمە فەندی) تیایدا مامۆستابوون[3]، دیاردیکەین ئەو وانانەی کە لە قوتابخانەی سەرەتایی دەخوێنران، بریتی بوون لە ( قورئانی پیرۆز، زانستە ئاینییەکان و تەجوید، جوگرافیا و مێژووی عوسمانی و ڕەوشت و حیساب)[4]. هەندێ جار گەورە پیاوانی شاریش لە دروست کردنی قوتابخانە بە بەخشینی پارە بەشدارییان کردووە، ئەوەتا لە ساڵی ١٩٠٥ ژمارەیەك لە گەورە پیاوانی هەولێر پارەیان بۆ دروست کردنی قوتابخانەیەکی سەرەتایی بەخشیووە[5].

لە لایەکی دیکە حوجرەو مزگەوتەکان سەکۆو مەڵبەندی گرنگی خوێندنی ئاینیان لە هەولێر پێکدەهێنا، مزگەوتی گەورەی قەڵات و قوتابخانەی ئەحمەدیە، دوو لە دیاردیکەین ئەو قوتابخانانە بوون[6]. لەگەڵ هەڵگیرسانی یەکەمین جەنگی جیهانی، قوتابخانە

---

(١) - سالنامەء موصل ولايتي ١٣٠٨هـ، ص١٣١.

(٢) - موصل "جريدة"، نومرو(٧٤١)، ١٤ محرم سنة ١٣٢٢هـ، ١٧ مارت ١٣٢٠ر.

(٣) - سالنامەء موصل ولايتي ١٣٣٠ هـ، ص٢٧٦.

(٤) - مكاتب ابتدائية شهادتنامه سي، محمد سعيد افندي، اربيل قلعة مكتب ابتدائي، ١٣٢٢ه/ ١٩٠٧. لەلای مومتاز حەیدەری پارێزراوە.

(٥) - لە بارەی ناوی ئەو کەسانەی کە پارەیان بەخشیووە و بڕی پارەکەش بڕوانە: موصل "جريدة"، نومرو(٧٨٧) ،٤ربيع الاخر سنة ٣٢٣ — ٢٥ مايس سنة ٣٢١.

(٦) - لە بارەی ڕەوشی خوێندنی ئاینی لە حوجرەو مزگەوتەکانی هەولێر بڕوانە: عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی، رەوشی حوجرە لە پێگەیاندنی زانا ئاینییەکانی شاری هەولێر، چ١، هەولێر، ٢٠٠٧" زبير بلال اسماعيل، علماء ومدارس في اربيل، مطبعة الزهراء الحديثة، موصل، ١٩٨٤.

فەرمییەکان[1] لە خوێندن وەستان، هەربۆیە بەشێك لەو قوتابیانەی کە دەستیان لە خوێندن هەڵگرت، دەستیان بە خوێندنی ئـاینی کـرد[2]. بـە گشـتیی سەرچـاوەیەك ئامـاژە بـەوە دەکات، کە بەر لە دەسپێکردنی یەکەمین جەنگی جیهانی لە شاری هەولێر (١٥٥) قوتابی لە قوتابخانە فەرمییەکان دەیان خوێند[3].

(١) - لە بارەی ڕەوشی خوێندنی فەرمی لە کوردستان بەگشتی و شاری هەولێر بەتایبـەتی بڕوانە:د.محەمـەد عەبـدوڵا کاکەسـوور، گەشـەکردنی خوێنـدنی فـەرمی لـە کوردسـتان ١٩٢١ -١٩٥٣/ لێکۆڵینەوەیـەکی مێژووییە، چ١، هەولێر، ٢٠٠٤.

(٢) - نەزیرە حەوێز ساڵح، شاعیر و ڕەچەڵەکناس ناسح حەیدەری (١٨٩٨ -١٩٨٦) ژیان و بەرهەمـەکانی، هەولێر "گۆڤار"، ژ(١٣) ، کۆتایی ٢٠٠١، ل ١٠٠.

(٣) - د.کەمال مەزهەر احمد، تێگەیشتنی ڕاستی شوێنی لـە ڕۆژنامەنووسـی کوردیـدا، چـاپخانەی کـۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨، ل ٥٠.

## تەوەری یەکەم

## دامەزرانی دەسەڵاتی بەریتانیا لە هەولێر و شێوازی بەڕێوەبردنی

دوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی بەبێ ئامادەکاری پێشینە، شان بە شانی ئەڵمانیا لە سەرەتای مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٤دا خۆی خزاندە نێو یەکەمین جەنگی جیهانی[١]، بەریتانیا بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندییە ئابووری و سەربازی و سیاسییەکانی، شاڵاوی سەربازی بۆ ناوچەکە دەستپێکرد[٢] و لە (٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٤ دەستیان بە پێشڕەوی کرد[٣]. سەرەڕای هەندێك ئاستەنگ کە ڕووبەڕووی هێزەکانیان بووە[٤]، بەریتانییەکان لە (١١)ی ئازاری ١٩١٧ توانیان بچنە نێو شاری بەغدا[٥].

شکستە یەك لە دوای یەکەکانی هێزەکانی عوسمانی پانتایی پێشڕەوی هێزەکانی بەریتانی فراونتر کرد و ناوچەکانی باشووری کوردستان بوونە ئامانجی هێرشەکانی بەریتانیا، لە ئەنجامدا

(١) - بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عمر الديداوي، الحرب العالمية الاولي، ط٥، بيروت، ١٩٧٧، ص٤٦٥.

(٢) - بڕوانە: احمد البرقاوي، العلاقات السياسية بين العراق و بريطانيا(١٩٢٢ – ١٩٢٣)، بغداد، ١٩٨٠" ص١٣" هنري فوستر، نشاة العراق الحديث، ت: سليم طه التكريتي،ج١،بغداد، ١٩٨٩،ص٥٥.

(٣) - د.حامد محمود عيسى، القضية الكردية في العراق من الإحتلال البريطاني الى الغزو الامريكي (١٩١٤ -٢٠٠٤) القاهرة، ٢٠٠٥، ص ١٣" د. علي ناصر حسين، مقاومة العراقيين للاحتلال البريطاني (١٩١٤ – ١٩١٧) بحث ضمن كتاب (المفصل في التاريخ العراق المعاصر)، بغداد، ٢٠٠٢، ص ١٢٩.

(٤) - وەك ئەو تێکشکانەی کە لە شاری کوت دووچاری بوون، لەم بارەیەوە بڕوانە: رسل برادون، حصار الكوت في الحرب بين الإنكليز و الاتراك في العراق سنة ١٩١٤-١٩١٨، ت: سليم طه التكريتي و عبدالمجيد ياسين التكريتي، جزئين، بغداد، ١٩٨٥.

(٥) - ارنلد ويلسن، بلاد مابين النهرين بين ولاء ين/خواطر شخصية و تاريخية، ت: فؤاد جميل،ج١، ط١، بغداد، ١٩٧١، ص٣٦١.

له (٧)ی ئایاری ١٩١٨ شاری کەرکووکیان داگیرکرد[١]. هەرچەندە دواتر سوپای بەریتانی بە هۆی چەند هۆکارێك بە ئاراستەی ناوچەکانی خورماتوو و کفری لە شاری کەرکووك پاشەکشەیان کرد[٢]، بەڵام دواتر سەرلەنوێ لە (٢٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨، بەر لەوەی جەنگ تەواوبێت کەرکووکیان خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان[٣].

یەکێك لەو سیاسەتانەی بەریتانییەکان پیادەیان کرد، دانانی ئەفسەری سیاسیی بوو لەو ناوچانەی کە داگیریان دەکرد، بۆیە (کاپتن های) کە لە شارۆچکەی پردێ بوو، لە لایەن (مێجەر نۆئێل) (Noel)[٤]ی ئەفسەری سیاسیی کەرکووك، بۆ ئەو شارە بانگ کرا، بۆ ئەوەی پرسی ئیدارەی بەریتانی لە هەولێری لەگەڵدا تاوتوێ بکات. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە هەولێر لە دەرەوەی دەسەڵاتی هێزەکانی بەریتانیادا بوو، بەڵام وەك (وڵسن) ئاماژەی بۆ دەکات، بە مەبەستی گەیاندنی کەلوپەلی خواردەمەنی و پێداویستی سەربازی، وەك تەواوی ناوچەکانی دیکەی باشووری کوردستان، کەوتە چوارچێوەی ستراتیژییەتی بەریتانیاوە[٥]. بە تایبەت کە دەشتی هەولێر گەورەدیکەی‌ن ناوەندی بەرهەم هێنان و دابین کردنی دانەوێلە بوو، ئەوەش سوودێکی زۆری بە هێزە بەریتانییەکان دەگەیاند و بە هۆیەوە ئازوقەیان بۆ فەراهەم دەکرا. هەر

---

(١) - م.ن، ص ١٥٧" دڵشاد مەحموود عبدورەحمان، کەرکوك لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی دەربارەی ڕۆڵی سیاسی و ڕۆشنبیری(١٩٣٢ -١٩٥٨)، نامەی ماستەر، کۆلیژی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر، ٢٠٠٦،ل ٢٣.

(٢) - لە بارەی هۆکارەکانی پاشەکشەکردنی بەریتانییەکان لە کەرکوك بڕوانە: پشکۆ حەمەد تاهیر ئاغجەلەری، کەرکووك (١٩١٧ – ١٩٢٦)/ توێژینەوەکی مێژوویی سیاسییە، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ل ١٤١ – ١٤٤.

(3) - B.C.Buch, Mudros to Lausanne: Britains Frontiers in West Asia ( 1918 – 1923) , state university of New york Press, New york, 1976,PP 10 – 11"

وليد حمدي، الكرد و كردستان في الوثائق البريطانية/ دراسة تاريخية وثائقية، لندن،١٩٩١، ص ٤٦.

(٤) - مێجەر نۆئیل ئەفسەرێکی زرنگ و کارامەی بەریتانی بوو، شارەزاییەکی باشی لە بارەی هۆزە کوردیەکان هەبوو، دواتر بووە ڕاوێژکارێکی حکومەتەکەی شێخ مەحمود، یەکێك بوو لە پشتیوانکارانی دۆزی کورد. لەبارەی بڕوانە: مێجەر نوئێل، یاداشتەکانی مێجەر نوئێل لە کوردستان، و: حسن احمد جاف و حسین عثمان نێرگسەجاری، بەغدا، ١٩٨٤، ل ل ٧ – ١١" هەروەها جليلي جليلى واخرون، م.س، ص ١٤.

(٥) - ارنلد ويلسن، بلاد مابين النهرين بين... ،ج١، ص ١٤.

بۆیە توانیـان ئـەو ناوچـانە لـە دوای ئاگربەسـتی مۆدرۆسـی (٣٠) تشـرینی یەکـەمی سـاڵی ١٩١٨[١] لە دەست هێزەکانی عوسمانی دەربێنن.

لەشکری عوسمـانی دوای ئـەوەی لـە کـەرکووك شکسـتی خـوارد، بـە ئاراسـتەی هـەولێر پاشەکشەی کرد[٢]. تا ئەوکات بەشێکی زۆر لە ویلایـەتی موسـڵ بـە هـەولێرەوە لـە دەرەوەی دەسەڵاتی بەریتانیا بـوو[٣].بـەڵام بـە سـوود وەرگـرتن لـە بەنـدەکانی ئاگربەسـتی مـۆدرۆس، بەریتانییەکان دەسەڵاتیان گەیاندە هەولێر، لەگەڵ ئەوەی بەشێك لە ناوچـەکان خـاڵی بـوون لـە دەسەڵاتی عوسمانی[٤]، دەکرێـت بڵـێین ناوچـەکە تاڕادەیـەك بـە دەسـت بۆشـایی دەسـەڵاتەوە تێپەڕدەبوو.

دوای ئەوەی (نۆئێل) لە دیدارەکەیدا (کاپتن های) راسپارد، بۆ ئەوەی بەرەو هەولێر بچـێت، بۆ ئەو مەبەستە یاداشتێکی دایە دەستی، تاوەکو رادەستی فەرماندەی ئەو هێـزە عوسمانییـەی بکات، کە لە شاری هەولێر مۆڵگەیان دانابوو، تـاوەکو بـەپێی ئـەو ڕێککەوتنـەی کـە پێشـتر ئیمزای لەسەر کرا بوو، شارەکە چۆڵ بکەن و بەرە و دیاربەکر پاشەکشە بکەن[٥].

بەر لە هاتنی دەسەڵاتی بەریتانیا بۆ هەولێر، (نۆئێل) کاربەدەستانی ئەو شارەی لەنێویانـدا (ئەحمەد عوسمان)ی سەرۆك شارەوانی ئاگەدار کردەوە سەبارەت بە هـاتنی هێـزی بـەریتانی بـۆ شارەکە[٦]. لێتۆژێك ئاگەدارکردنەوەی (ئەحمەد عوسمان) لەلایـەن بەریتانییەکانـەوە، بـە واتـای

---

(١) - ئاگربەستی مۆدرۆس لە ٣٠ تشرینی یەکـەمی سـاڵی ١٩١٨ لـە نێـوان هاوپـەیمانان و عوسمانیـەکان ئیمزاکرا و کۆتایی بە جەنگی جیهانی یەکەم هێنا. بە پێی بەندی حەوتەمی ئـاگر بەسـتەکە بـەریتانیا مـافی ئەوەی هەبوو، هەر ناوچەیەك کە دەچێتە نێو بازنەی ستراتیژی خـۆی، یـاخود هەڕەشـەی بـۆ دروسـت بکـات دەستی بەسەر دابگرێت. " B.C.busch, Op.Cit,PP 10 – 11

عزيز الحاج، القضية الكردية في العشرينات، ط٢، مطبعة الإنتصار، موصل، ١٩٨٥، ص ٢٣.

(٢) - وليد حمدي، م.س، ص٤٦" مولود بێخاڵی ، هەولێرم...، ب١، بەغدا، ١٩٩١، ل ٢٥.

(٣) - سیسیل جۆن ئیدمۆندس، کورد تورك عەرەب، و: حامید گەوهەری، چ ٢، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٥٤.

(٤) - هادي الجاوشلي، تراث اربيل...، ص ٢٣١.

(٥) - دبليو. هي، م.س. ج١،ص ١٤٤.

(٦) - هادي الجاوشلي، تراث اربيل...، ص٢٣١" مولود بێخاڵی ، هەولێرم...، ب١، ل ٢٥.

نەمانی سوپای عوسمانییەکان لـە شـارەکە دادەنـێ[1]، لەکاتێکـدا گوزارشـتی (هـای) ڕاسـتی هـەبوونی هێـزی عوسمـانی لـە کـاتی هـاتنی بـۆ شـارەکە دووپـات دەکاتـەوە[2]، بێگومـان بەڕێوەبەرایەتیی شـارەوانی وەك دامەزراوەیـەکی سـیڤیل بـووە، دیـارە بەریتانییـەکانیش لـەم گۆشەنیگایەوە سەودایان لەگەڵدا کردووە.

(های) هاوڕێ لەگەڵ ئەفسـەرێکی بـەریتانی لـە (یەکـەی سـوارە/١٢)ی هێـزی هینـدی و دووفەرمانبەری دیکەی پۆستە لە کاتژێر(١)ی دوای نیوەڕۆی (١٠)ی تشـرینی دووەمـی سـاڵی ١٩١٨ گەیشتە شاری هەولێر[3]، هاووڵاتییەکی خەڵکی گوندی قوشتەپە[4]، تا گەیشـتنیان بـۆ شارەکە ڕێنموونی و چاوساغی بۆ کردن[5].

(های) بەم شێوە باسی هاتنی بۆ هەولێر دەکات:

**"لەدەستپێکدا ڕێگایەکی هەڵەمان گرتبـووە بـەر، بـەڵام...، دواتـر ڕێگەیـەکی دیکـە دروستمان گرتەبەر و گەیشتینە ناو شار، لەگەڵ ئەوەی کەش و هەوای شـارەکە نالـەبار بـوو، بەڵام لەنێو ئاپۆڕایەکی گەورەی خەڵکی پێشوازیمان لێکرا، لە سەرووی هەموویانەوە فەرمانده و سەرۆکی شارەوانی، خەڵکێکی زۆر و سەربازان بە ئەندازەیەکی دروست لە پێشوازیمان دابوون، سەلامیان لێ وەر دەگرتینەوە، ڕێگای قەڵاش تا بەردەم شارەوانی بەرد ڕێژکرابوو"[6].**

دوای پشوودانێکی کەم کاتژێر (٣) ی دوای نیـوەڕۆی هـەمان ڕۆژ، (هـای) سـەردانی ئـەو سەربازگەیەی کرد، کە لە ڕۆژئاوای شار هەڵکـەوتبوو، بـۆ ئـەوەی دەقـی ئـەو یاداشـتەی کـە لەکەرکوکەوە لەگەڵ خۆی هێنابووی و داوای پاشەکشەکردنی هێزەکـانی عوسمـانی دەکـرد لـە ناوچەکە، بداتە دەست فەرماندەی ئەو هێزانە. ئەو فەرماندەیەش بە ناچاری ڕەزامەنـدی لەسـەر

---

(١) - مەهدی محەمەد قادر، هەولێر لەسەردەمی داگیرکردنیدا(١٩١٨ — ١٩٢٠)، مێژوو (گۆڤار)، ژ (٣)، هەولێر، ٢٠٠٧،ل ١٦٤.

(٢) - بڕوانە: سنتان في كردستان، ج١،ص ١٥١ .

(٣) - مولود بێخاڵی، هەولێرم...، ب١، ل ٢٦.

(٤) - قوشتەپە کە ئەو کات گوندێك بوو، دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای شاری هـەولێر، لـە نێـوان پـردێ و هەولێردا، کە بە مەڵبەندێکی گرنگی دزەییەکان دادەنرا. کلۆدیوس ریچ، س.پ، ل ل ٣٣٩ -٣٤٠.

(٥) - هادي الجاوشلي، تراث اربيل...، ، ص ٢٤.

(٦) - سنتان في كردستان. ج١، ص ١٤٨ .

ئەو فەرمانە پێشانداو پێی ڕاگەیاند بۆ بەیانی بارو بارگەیان تێك دەنێن و شارەکە بەجێ دەهێڵن، بەڵام داوایکرد هەندێك لە سەربازەکانی کە نەخۆش و پەککەوتەو بریندداربوون لە شارەکە بمێننەوە. لە بەرامبەردا (های) مکوڕبوو لەمبارەیەوە کە دەبێت پزیشکێك بۆیان بە جێبهێڵن. لایەنی عوسمانی ئەو داوایەی ڕەتکردەوە و ڕایگەیاند کە سەربازە نەخۆشەکان لەگەڵ خۆیاندا دەبەنەوە، بەڵام بۆ بەیانییەکەی کە پاشەکشەیان کرد، ئەو سەربازانەیان بەسەر چەند ماڵێکی شارەکە دابەشکرد و شارەکەش بە شێوەیەکی فەرمی ڕادەستی (های) کرا[1]. بێگومان ئەوەش دڵ و دەروون کراوەیی دانیشتووانی شارەکە پێشان دەدات کە هەڵوێستێکی مرۆڤانە بەرامبەر سەربازانی ئەو دەوڵەتە پێشان دەدەن، کە چەندین ساڵ بوو ناوچەکەیان دەچەوساندەوە. هەرچۆنێك بێت بەم پێیە لە دوای کشانەوەی سوپای عوسمانی، هەولێر و دەوروبەری پێیناوەتە قۆناغێکی نوێ کە خۆی لەداگیرکاری بەریتانیا بەرجەستە دەکات.

دوابەدوای بەڕێکردنی هێزەکەی عوسمانی، (های) ڕاستەوخۆ لەگەڵ پیاو ماقوڵ و سەرۆك هۆزەکانی هەولێر و دەوروبەری کۆبووە، لەو کۆبوونەوەیەدا هاتنی دەسەڵاتی بەریتانیای لەگەڵیاندا باسکرد. لە قسەکانیدا هەوڵەکانی سوپای بەریتانیای سەبارەت بە ئازادکردنی میللەتان و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی بەرز نرخاند و ستایشی کرد. هەروەها پێداگیری لەسەر ئەوە کردەوە، کە ئەوان وەك هێزی داگیرکار نەهاتوون، بەڵکو هاتوون تا لە ژێر چەپۆك و زوڵمی عوسمانییەکان ڕزگاریان بکەن[2]. شایانی باسە ئەفسەرانی بەریتانی ئەو قسانەیان لە شارەکانی دیکەش دووپات دەکردەوە[3]. بێگومان ئەوەش بۆ دەستەمۆکردنی دانیشتووان و زەمینە خۆشکردن بوو، بۆ سەقامگیر بوونی دەسەڵاتی داگیرکاری بەریتانی لە ناوچەکەدا.

(های) مانەوە لە پۆستی سەرۆکی شارەوانی و پێدانی پۆستێکی دیکەی وەك یاریدەدەری فەرمانڕەوای شارەکە بە گوێی (ئەحمەد عوسمان)دا چرپاند[4]، دیارە ئەوەش بۆ ئەوە بوو، کە لەپێناو بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بەکاربهێنرێت، چونکە ناوبراو کەسێکی دیاری شارەکە بوو

---

(١) - م.ن، ج١، ص١٥٠ -١٥١.

(٢) - چاوپێکەوتنێك لەگەڵ د.عەبدوڵڵا حەداد، ئەویش ئەم قسانەی لە باوکییەوە بیستووە کە بەشداربووێکی ئەم کۆبوونەوەیە بوو.

(٣) - بڕوانە:د.کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك...، ب١،ل ١٧٦.

(٤)- هادي الجاوشلي، تراث اربيل...، ص ٢٤.

و بەر لە داگیرکاری بەریتانیاش سەرۆکی شارەوانی بوو، جگە لەمەش لـە لایـەن (مەلافەنـدی) ئامۆزایەوە پشتگیری و پشتوانی لێـدەکرا، کـە خـودان هـەژمون و قورسـاییەکی گـەورە بـوو، هەربۆیە (های) هەولێدا سوود لەمە وەربگرێت.

لەو لاشەوە (های) بڕیاریدا فەرمانبـەرانی شـار بگەڕێنـەوە سـەر کارەکانیـان و درێـژە بـە کارەکانیان بـدەن و موچـەکانیان دوو بەرامبـەر زیـاد کـرا[1]، بـەم هـەنگاوەش بەریتانییـەکان هەوڵیان دا سۆزی ئـەو کارمەندانـە بـۆ لای خۆیـان رابکێشـن، چـونکە بێکـار هێشـتنەوەیان لەوانەبوو پەرچەکرداری لێ بکەوێتەوە و لەلایـەن گلـۆتی نـەیاری دژ بـە دەسـەڵاتی بـەریتانیا سوودیان لێ وەربگیرێ.

رۆژانی ماوەی یەکەمی فەرمانداریی (های) لە شارەکە درێـژەی نەکێشـا، بـە بروسـکەیەك ئاگەدار کرایەوە، کە بگەڕێتەوە سەر کاری پێشووی خۆی لە پـردێ، لـە شـوێنی ئـەو (نـەقیب مۆری) بۆ بەڕێوەبردنی شارەکە و دەوروبـەری دەسـت نیشـان کـرا. بۆیـە لـە (١٣)ی تشـرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨، کاروباری شارەکەی ڕادەستی (نەقیب مۆری) کرد[2].لێتۆژێك دەسەڵاتی داگیرکاری بەریتانی لە هەولێر بۆ دوو قۆناغ پۆلێنکردووە، یەکەمیان: هاتنی (های)و وەرگـرتنی فەرمانڕەوایەتی شارەکە لە دەست عوسمانییەکان، دووەمیان: هاتنی (نەقیب مـۆری) بـۆ گرتنـە دەستی کاروباری شارەکە[3]. بەڵام نابێت ئەوەش لەبەرچاو نەگیرێت، کە دواتر دووبارە (های) بۆ بەڕێوەبردنی هەولێر دەگەڕێتەوە.

لەماوەی فەرمانڕەوایی کردنیان لە هەولێر، بەریتانییەکان بە مەبەستی شـوێن قـاییمکردنی خۆیان و سەپاندنی دەسەڵاتیان لە ناوچەکە، دەستیان کرد بە هەنگاونان بۆ بەهێزکردنی پێگـەی مانەوەیان لەناو شارداو توانیان سەرکەوتووبن لە کێشکردنی دیاردیکەین بنەماڵـەی شـار، کـە ئەویش بنەماڵەی (مەلافەندی) بـوو، ئـەوەبوو پۆسـتی سـەرۆکی شـارەوانی و یارمـەتی دەری ئەفسەری سیاسیی شاریان پێدرا[4]، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا.

---

(١) - م.ن، ص ٢٤.

(٢) - دبليو. هي، م.س، ج١، ص ١٥٢.

(٣) - مەهدی محەمەد، هەولێر لە سەردەمی داگیر...، ل ١٦٦.

(٤) - هادي الجاوشلي، تراث اربيل...، ص ٢٤.

دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە هەولێر بە هەر چەشن و شێوازێك بووایە خۆیان لەناودارانی شار نزیك دەکردەوە، بەڵام وەك (های) ئاماژەی پێ دەکات، ئەگەر هاتوو هەر سەرۆك هۆزێك، یان پیاو ماقوڵێك بە ئاراستەی ویستی ئیدارەی شارەکە هەڵی نەکردبایە، بە جۆرەها شێوازی نا بابەتیانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرا. لە زۆر لەم رووداوانە توندتیژی لە رادەبەدەر لە دژیان بەکاردەهات. ئەو پێی وابوو، ئەو ئاغاو دەوڵەمەندانەی کە بە خراپی باسی دەسەڵاتی بەریتانی دەکەن، دەبێت سەرکوت بکرێنەوە ، ئەوەش بۆ ئەوەی پێگەی دەسەڵاتی بەریتانی زیاتر قایمتر بکەن[1]. هەر بۆیە دەبینین ناوبراو جۆرەها شێوازی ئازاردانی دەرونی و شکاندنی شانوشکۆو دوورخستنەوە و پەراوێزخستنی لەگەڵ ئەو نەیارانەدا بەکارهێناوە[2]. بۆ نموونە (ڕەشید ئاغا)[3]، کە نەیارێکی سەرسەختی دەسەڵاتی بەریتانی بوو لە هەولێر، لەلایەن بەریتانییەکان بە جۆرەها شێوازی ناچۆنییەك ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرا، دواجار دەستگیرکرا[4]، لەلایەن هێزێکی بەریتانییەوە، کە لە شاری موسڵەوە هاتبوون، بەرەو ئەو شارە ڕاپێچیان کرد[5]. بەپێی گوتەی یەکێك لە نەوەکانی (رەشید ئاغا)، ناوبراو خەریك بوو سزای لە سێدارەدانی بەسەردا بسەپێنرێ[6]. هەروەها (سەید عەبدوڵا پاشا)، کە پێشتر ڕۆڵێکی دیاری لە بەڕێوەبردنی شاردا هەبووە و لەبنەماڵەیەکی بەناوبانگ بوو، کەنارگیر کرا و پایەی دەسەڵاتی بەرەوخوارەوە

---

(1)-F.O,371-5068, Note on Rawanduz by Majar W.R.Hey,Arbil, 26December,1919,P173.

(٢) -دبيلو. هي، م.س، ج٢ ، ص ١٧١.

(٣) - حاجی رەشید ئاغا کوڕی وەیسی ئاغایە، سەر بەهۆزی شێخ مەموندە، خاوەنی شەش گوند بوو لە دەوربەری هەولێر و دەشتی شەمامك، چوار کوڕی هەبوو، بە ناوەکانی ( عەتاولا، نافیع، نورەدین و موسا ئاغا). عباس العزاوي، اربل في...، ص ١٤٨.

(٤) - دبليو. هي، م.س، ج٢ ، ص ١٧١.

(٥) - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە چۆنییەتی بردنی بۆ موسڵ بڕوانە: مولود بێخاڵی، هەولێرم...،ب٢، ل١٣٠ .

(٦) - چاوپێکەوتنێك لەگەڵ د. ئەرسن موسا رشید، هەولێر، ١٠ /١١ / ٢٠٠٧. ناوبراو لە ساڵی ١٩٥٣ لە دایك بووە بڕوانامەی دکتۆرای لە مێژووی ئیسلامی لە زانکۆی ئەدینبەرە لە ئەسکۆتلاندە وەرگرتووە، ئێستە سەرۆکی بەشی مێژووە لە کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین لە شاری هەولێر.

دابەزی[١]. (عەلی پاشای دۆغرەمەچی)ش[٢] یەكێك بوو لە نـەیارانی دەسـەڵاتی بەریتانییـەكان لە شارەكەدا، بۆیە لەلایەن ئەفسەری سیاسیی بەردەوام بە چاوێكی گومانـاوی سـەیر دەكـرا[٣]. ئەو كەسایەتییە دیارانە بەهۆی ئەو زەمینەو پاشـخانەی كـە هـەیانبوو، ڕێگـەیان بەخۆنـەداوە دەست لەگەڵ بەریتانییەكان تێكەڵاو بكەن، دیارە لایـەنی بەرامبـەریش ئەوەنـد سـینگ كـراوە نەبوو، تا بەچاكی سەودایان لەگەڵدا بكات.

بەریتانییـەكان لـە هـەولێر سیسـتەمی دەرەبەگایـەتییان سـەقامگیر كـرد، ئـەوە نـەك لەبەرئەوەی سیستەمێكی پێشكەوتوو بووە، بـەڵكو لـەو ڕێگەیـەوە دەیـانتوانی سـەقامگیری دەستە بەر بكەن[٤]، هەربۆیە بـە مەبەسـتی سەرخسـتنی دەسـەڵاتیان، هەوڵیانـدا خۆیـان لـە كەسایەتییە دیارو سەرۆك هۆزەكانی هەولێر نزیـك بكەنـەوە[٥]. ئـەوەش لـەپێناو كێشـكردنی كەسایەتییە دیارەكان، پارەیەكی زۆریشیان لەمەدا سـەرفكرد، ئـیتر ئـەو سـەرۆك هـۆزەی بـە ئاراستەی ویسـت و سیاسـەتەكەیان هـەڵی بكرادیـە، (١٧٠)[٦] (روپیـە)یان وەك مووچـە بـۆ

---

(١) - مولود بێخاڵی، هەولێرم ...، ب٣، ل ٢٠٢ .

(٢) - عەلی پاشا كوری مەحمود ئاغا كوڕی عەبدوڵڵا ئاغای دۆغرەمەچی، لە ساڵی ١٨٧٨ لە شاری هەولێر لە دایك بووە، لە سەردەمی عوسمانی ئەندامی دادگا بوو، هەروەها سەرۆكی شـارەوانی هـەولێریش بـوو، لـە ساڵی ١٩٣٠ بووە، نوێنەری هەولێر لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و لە ساڵی ١٩٣٧ بووە نوێنەری هـەولێر لە ئەنجومەنی پیاوماقوڵان (مجلس الاعیـان)، لە ٨ی نیسانی ١٩٤٨ مـردووە. مـیر بصـري، اعـلام الترکمـان، ط١، مکتبة الوراق- لندن، ١٩٩٧، ص ٣٨.

(٣) - لە تەوەرەیەكی دیكەدا هەڵوێستی هەولێر دەخەینەڕوو.

(4)- Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil Division For The Year, 1920, By: C.C. Marshall , Major, Political Officer,Arbil, 5tH February,1921,P205.

(5) -F.O,371-4193,memo No.Nil, From the A.P.A, Erbil, to te Polltical Officer Mosul،dated 3/5/1919.

(٦) - ئەو ڕێژەیە مەرج نییە بۆ هەموویان وەك یەك بێت، بۆ نمونە بۆ میرانی قادر بـەگ لـە شـەقڵاوە ٤٠٠ ڕووپیە بوو. هاوكات عەرەب ئاغای گەردی موچەكەی ٢٠٠ ڕووپیە بـوو، كـە دواتـر بـۆ ١٠٠ ڕووپیـە كـەم كرایەوە. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:

F.O,371-5069, from Political Officer,Arbil to Civil Commiaaioner Baghdad ,dated the 27 the April 1920،PP 76-77.

دەبڕیەوە[1]. بە تێپەڕبوونی کات هەوڵدەدرا ناوچەکان لە ڕێگەی سەرۆك هۆزەکانیانەوە بەڕێوە ببردرێن[2]، بەڵام ئەوەی بەدی دەکرێت زۆرینەی هۆزەکانی دەوربەری هەولێر بە تایبەتی لە دەستپێکی داگیرکاری بەریتانی دا، ئامادە نەبوونە بێنە ژێر باری ئەفسەری سیاسیی شارەکە. هەربۆیە لە هەندێك کاتدا بارگرژی و تێکگیران ڕووی دەدا، بە تایبەتی لەگەڵ گەورە پیاوانی دزەیی[3]. دیارە ئەو هەوڵانەشی کە خرابوونە گەڕ، بۆ ڕازی کردنی ئەو سەرۆك هۆزانە، لە سەرەتادا سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا. لەم بارەیەوە یەکێك لە یاریدەدەرانی ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە شارەکە، لە ڕاپۆرتێکیدا کە بۆ سەرووی خۆی بەرزی کردۆتەوە دەڵێت:

**"ئاغاکان پێیان ڕاگەیەنرا، کە هیچ گۆڕانکارییەکی کارگێڕی لە ئارادا نییە، توانرا ئیبراهیم پاشا[4]، بە هۆی چەند مەرجێکەوە ڕازی بکرێت و هێور بکرێتەوە، بەڵام هیچ ڕێگەیەك بۆ ڕازیکردنی ئەوانی دیکە لە ئارادا نەبوو، هەرچەندە پێیان گوترا، ئەگەری ئەوە**

---

پێ دەچێت دیاری کردن ئەو بڕە پارەیە لەسەر ڕێژەی هەژمونی ئەو سەرۆك هۆزە و ڕادەی پەیوەست بوونی بە دەسەڵاتی بەریتانی وەستابێت.

(١) - بڕوانە دەقی ئەو نامەیە جوفرەکراوەی کە لە (وان)ەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ( نظارة الداخلیة)ی عوسمانی ڕەوانە کراوە. لە بەرواری ١٣٣٥/٨/٦ڕۆمی لە: د.خلیل علي، مختارات من کتاب ..، ص ١٧٥.

(2) - F.O,371-5069, from Political Officer,Arbil to Civil Commiaaioner Baghdad ,dated the 27 the April 1920،PP 76-77.

دبلیو. هي، م.س،ج١، ص ١٤٤"

(3) - F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray،16 the July,1919, P 1.

(٤) - ئیبراهیم بایز ئاغای دزەیی، یەکێکە لە پیاوە ناودارەکانی دزەیی لە ساڵی ١٨٤٠ -١٨٤١ لە قوشتەپە لە دایك بوو، سەر بە بەرەی بایز بوو لە نێو دزەییەکان، دواتر قوشتەپەی بەجێهشتووە و هاتۆتە دەشتی مەخمور، چەند جارێك لەگەڵ عوسمانییەکان تێکگیراوە و لەسەرەتای سەدەی بیستەم لە لایەن عوسمانییەکانەوە بۆ ماوەیەك دەستگیرکراوە و دواتر ئازادکرا، لە ٤ ی ئابی ١٩٢٠ مردووە. خاوەنی ٣٠ گوند بوو. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ناوبراو بڕوانە: د.بدرخان سندي، المجتمع الکردي في المنظور الاستشراقي،ط٢، دار سپیریز للطباعة والنشر، دهوك، ٢٠٠١، ص ص ٢٨٧-٢٨٨" دبلیو. هي، م.س، ج١،ص ٢٠٤ و ج٢ ، ص ٨٤.

**هەیە، ئەگەر ئارام بگرن، بە تێپەڕبوونی کات شوێنێکیان پێ بدرێت ...، بۆ ئەوەی کاریگەریان لەسەر هۆزەکانیان هەبێت"[١].**

بەریتانییەکان زیاتر هەوڵی دەستبەرکردنی دڵسۆزی سەرۆك هۆزەکانیان بەلاوە گرنگ بوو، چونکە لەو ڕێگەیەوە دەیانتوانی گوێڕایەڵی ئەو هۆزانە زامن بکەن. تەنانەت هەندێ جار لەپێناوی ڕاگرتنی دڵی سەرۆك هۆزەکان زەوی جوتیارانیان بەبێ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانی جوتیاران بەسەر دەرەبەگەکان دابەش دەکرد، وەك ئەوەی لە گوندی (پیرزین)[٢]ی نزیك شاری هەولێر لەلایەن ئەفسەری سیاسییەوە ئەنجام درا[٣]. لەگەڵ ئەوەشدا تا توانرا زۆرینەی ئەو هۆزانە دەستەمۆ و ملکەچ بکەن، زۆرجار بارگرژی توند دەهاتە ئاراوە. بە تایبەتی زۆرێك لەو سەرۆك هۆزانە بەهۆی ئەو پێگە کۆمەڵایەتی و ئابووری و نیمچە سیاسییەی کە هەیانبوو، ئامادە نەبوون ئەو باجە بدەن، کە بەریتانییەکان بە مەبەستی سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر هۆزەکاندا سەپاندبوویان[٤]. لە بەرامبەردا دەسەڵاتی بەریتانی لە شارەکە بە هیچ شێوەیەك ئامادە نەبوو لە بەرامبەر نەدانی باج نەرمی بنوێنێ و بەردەوام هەڕەشەی ئاکامی خراپیان لەم هۆزانە دەکرد، کە ئامادە نەبوون یاخود خاوخلیسکیان لە دانی باج دەکرد[٥].

گومرگ و باج دوو سەرچاوەی گرنگی داهاتی بەریتانییەکان بوون لە ناوچەکە، کە لە سەرەتادا لە لایەن فەرمانبەرانی پێشووی شارەکە وەردەگیرا[٦]، ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە هەولێر نەك بەرپرسی ئیدارەی گومرگی هەولێر بوو، بەڵکو ماوەیەك ئیدارەی گومرگی

---

(1) - F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray،16 the July,1919, P 3.

(٢) - پیرزین کە ئەوکات گوندێك بوو، دەکەوێتە باکووری شاری هەولێر.

(٣) - د.محمد سلمان حسن، طلائع الثورة العراقية/ العامل الإقتصادي في الثورة العراقية الاولى، ط٢، بغداد، ١٩٥٨، ص ص١٧ — ١٨.

(٤) - دبليو. هي، م.س، ج١،ص١٤٤.

(5)- F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray،16 the July,1919, P 3.

(٦) - سیسل ئەدمۆندس، س،پ، ل ٤٢٣.

کەرکووکیشی لە ئەستۆ دابوو[1]. ئیدارەی بەریتانی لە هەولێر دووبنکەی سەرەکیی گومرگی لە مەخمور و کۆیە دانا بوو، کە لەلایەن مەئمومەری گومرگ و (٥) کارمەندی تر کارەکانی بەڕێوە دەبران، دواتر بنکەیەکی گومرگی بۆ ڕەواندز گوزرایەوە[2]. سەبارەت بە کۆکردنەوەی باجەکانیش، زۆرجار ئەو فەرمانبەرانەی کە کۆیان دەکردەوە گەندەڵ بوون، یاخود حەزیان بە چارەی دەرەبەگێك، یاخود خاوەن زەوییەك نەدەکرد، بۆیە هەندێ زیادە ڕۆییان لەم خەملاندنە دەکرد، کە بۆ کۆکردنەوەی باجی بەرهەمەکان ئەنجامیان دەدا[3]. هەربۆیە بەهۆی تێوەگلانیان لە گەندەڵی هەندێك کارمەند لەسەر کارەکانیان لابران[4]. (های) لە ڕاپۆرتێکیدا ئاماژە بەوە دەکات، کە پارەیەکی باش لە داهاتی زەوی و زاری ناوچەی هەولێر کۆکراوەتەوە[5]. هەروەها بەپێی ڕاپۆرتێکی (مێجەر مارشاڵ)، کە لە دوای (های) بەرپرسیاریەتی هەولێری گرتەئەستۆ، کۆکرنەوەی داهاتەکانی گەنم لە ساڵی ١٩١٩دا لە هەولێر (٧,٣٩٧) تەن گەنم بوو، لە ساڵی ١٩٢٠دا بۆ (١٧,١٩٠) تەن زیادی کردووە، هەرچی (جۆ)شە، لە ساڵی ١٩١٩دا (٥,٩٥٥) تەن بووە و لە ساڵی١٩٢٠دا بۆ (١٢,٨٥٠) زیادی کردووە[6].

دیارە ئەو مەسەلەیە هەندێ جار بارگرژی توندی لە نێوان سەرۆك هۆزەکان و ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە شارەکە لێکەوتۆتەوە[7]، لەگەڵ ئەوەشدا کۆکردنەوەی ئەو باجانە جگە لەوەی پێدوایستییەکانی خەزێنەی دابین دەکرد، لە هەمان کاتدا وەرگرتنی ئەو باجانە لە

---

(١) - سەربەست کەرکووکی( وەرگێران لە ئینگلیزیەوە)، ڕاپۆرتی کارگێڕی دەڤەری کەرکووك ماوەی ١ی کانوونی دووەم تا ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩١٩،چ١، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ٧٩.

(2) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ...,PP 213- 214.

(٣) - دبليو. هي، م.س، ج١،ص٢٠٧.

(4) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ....,PP 213.

(5) -F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, PP 233-242.

(6) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P 211.

بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ڕێژەی داهات و باجەکان لەساڵی ١٩٢٠دا لە هەولێر، بڕوانە پاشکۆی ژمارە( ٣ ).

(7) - F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray،16 the July,1919, P 3.

هۆزەکان، دەبووە هۆی زیاتر وابەستە بوونیان بە دەسەڵات. هەربۆیە باج نەدان واتای گوێ نەدان بوو بە دەسەڵاتی حکوومەت. بەرپرسانی بەریتانی پێیان وابوو، ئەگەر بە جددی ساتوسەوداییکردنی لەگەڵ نەکرابایە کاریگەری نێگەتیڤی بۆ سەر ئاسایشی گشتیی دروست دەکرد[١]. لە ئەنجامی ئەوەدا ئیدارەی بەریتانی لە هەولێر ودەوروبەری ئامادە بوون بە چەك رووبەڕووی ئەو هۆزانە ببنەوە، کە باجیان نەدەدا، یاخود ساردییان لەم بارەوە دەنواند[٢]. ئەو پرسە لە لایەن سەرۆك هۆزەکانی دزەیی نارەزایی توندی بەدوادا هات، ئەوە بوو یاداشتێکیان بۆ جێگری ئەفسەری سیاسیی لە هەولێر رەوانە کرد، کە ئیمزای هەر یەك لە (ئەحمەد پاشا، ئیبراهیم ئاغا و پیرداود ئاغا)ی لەسەر بوو، تیایدا ئاماژەیان دابوو، کە زۆرینەی فەرمانبەرانی کۆکردنەوەی باجەکان گەندەڵن، بە هۆی کێشەی تایبەتییەوە زیادە ڕۆییان لە هەڵسەنگاندنی بەرهەمە کشتوکاڵی و ئاژەڵییەکان کردووە[٣]. لە بەشێکی دیکەی یاداشتەکەدا هۆشدارییان لە هەمبەر چارەسەرکردنی ئەو پرسەدابوو[٤]. دۆکیۆمێنتێکی بەریتانی ئاماژە بەوە دەکات، دزەییەکان ئارەزوویان لەگەڵ ئەو سیاسەتە نەبووە کە ئیدارەی بەریتانی سەبارەت بە کشتوکاڵ لە هەولێر پیادەی دەکرد و مەیلییان بەلای چاکسازییە کشتوکاڵییەکانەوە نەبووە[٥].

(های) لەیاداشتێکیدا کە بۆ سەروخۆی بەرزکردۆتەوە ئاماژەیداوە:

**"زەینی کوردێك وەك زەینی قوتابییەك وایە... ڕۆژێك دەبێت لێی بدەی، ڕۆژێکی دیکە دەبێت شەربەتی پێ بدەی، توندوتیژی لە ڕادەبەدەر، ڕاگرتنی ناز و دڵدانەوەی لە ڕادەبەدەر تێکی دەدەن، وەك منداڵێکی قوتابخانە بۆ خۆ دەربازکردن، هەمیشە درۆیەکی لەناو جانتاکەیدا**

---

(١) - سیسل ئەدمۆندس، س،پ، ل ٤٢٤.

(2) - F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray،16 the July,1919, P 3.

(٣) - دبليو. هي، م. س، ج١، ص ٢٠٧.

(4)- F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray،16 the July,1919, P 3.

(5) - N.A,F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, PP 233-242.

**هەیە"**[1]. سەبارەت بە سروشتی فەرمانڕەوایەتی کردنی کوردستان بە گشتیی و هەولێر بە تایبەتی، (های) پێداگیری لەسەر پیادەکردنی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی دەکرد[2].

سەرەڕای ئەوەش (های) پەیوەندییەکی توونـدوتۆڵی لەگەڵ کریستیانەکانی عەنکاوە و جوولەکەکان هەبوو، زۆرجار بە جیا پێشوازی لێکردوون[3]. هەوڵیشی داوە تۆی دووبەرەکی لە نێوان موسڵمانان و کریستیانەکانی هەولێر بچێنێت، هەر بۆیە زیاتر ئەوانی لە خۆی نزیك دەکردەوە[4] و توانی بووی دەستەیەك لە کریستیانەکانی عەنکاوە بۆ لای خۆی کێش بکات و چەکداریان بکات و بیانکاتە پاسەوانی تایبەتی خۆی، بە تایبەتی کاتێك هۆزەکانی خۆشناو و سورچی گەمارۆی شاری هەولێریان دابوو[5]. ئەو پێشهاتە دانیشتووانی شاری بێزار کرد. بەڵام هەموو ئەو هەوڵانە نەیان توانی درزو کەلەبەر لە پەیوەندییەکانی نێوان دانیشتووانی موسڵمانی هەولێر و کریستیانەکانی عەنکاوە دروست بکەن[6].

لە لایەکی دیکەوە لە ڕووی کارگێڕییەوە تا تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٩، هەولێر قەزایەك بوو سەر بە لیوای کەرکووك، لە چوارچێوەی ویلایەتی موسڵ دا[7]، بۆ ئەوەی هەولێر ببێ بە لیوایەکی سەربەخۆ، (های) لەگەڵ (ئەحمەد عوسمان)ی سەرۆکی شارەوانی لە ڕێگای هێڵی شەمەندەفەری (شەرگات)ەوە، لە (٢٩)ی تشرینی یەکەمی ١٩١٩ سەردانی بەغدایان کرد[8]، ئەو پرسەیان لەگەڵ (ئارنۆڵد ولسن)ی حاکمی گشتیی عێراق تاوتوێکرد و داواکرا

---

(1) - F.O,371-5068, Note on Rawanduz by Majar W.R.Hey, Arbil, 26December,1919 ,P173.

(٢) - د.عثمان علي، فترة الحكم المباشر ١٩١٩ — ١٩٢٠، إدارة ميجرسون في جنوب كردستان، ئالاى ئيسلام (مجله) ، ع ٢-٣، ايلول ١٩٩٩، ص٥٦.

(٣) - دبليو.هي، م.س، ج١، ص ١٢٣.

(٤) - مەهدی محەمەد، هەولێر لە سەردەمی داگیر...، ل ١٦٧.

(٥) - دبليو. هى، م.س، ج٢، ص ١٢٣ .

(٦) - حنا عبدالاحد روفو، م.س، ص ٣٩.

(٧)- دبليو. هى،م.س، ج١، ص ٢١٩" المس غيرترود بيل، فصول من تاريخ العراق القريب ( كتاب يبحث عن العراق في العهد الإحتلال البريطاني بين سنتي ١٩١٤ -١٩٢٠، ت: جعفر الخياط، بيروت- لبنان، ١٩٧١، ص٢٣٣.

(٨) - دبليو. هي، م.س، ج١، ص ٢١٩.

ئەفسەری سیاسیی لە هەولێر سەربەخۆ بێت و ڕاستەوخۆ سەر بە بەغدا بێت، ئیدارەی هەولێریش ناوچەکانی ڕەواندز و کۆیە و مەخمور لە خۆبگرێت[1]. لە دەستپێکدا (ولّسن) لەم کارە دوو دڵ بوو، بەڵام ئەو پرسە زۆری نەکێشا، وەك (های) باسی دەکات، لە یەکی تشرینی دووەمی ١٩١٩ هەولێر بووە لیوایەکی سەربەخۆ[2]. بەڵام لە ڕاستیدا هەولێر نەبووەتە لیوایەکی سەربەخۆی تەواو، بەڵکو وەك نیچمە لیوایەکی سەربەخۆ ساتوسەوداییکردنی لەگەڵ کراوە، بە شێوەیەك هەر سەر بە کەرکووك مابووە، تا لە نیسانی ساڵی ١٩٢٣ ئینجا بە تەواوی بووەتە لیوایەکی سەربەخۆ و ڕاستەوخۆ سەر بە وەزارەتی ناوخۆی عێراق[3]. (ئەحمەد عوسمان) وەك موتەسەڕیفی هەولێر دەستنیشانکراوە و موچەی مانگانەشی (١٠٠٠) ڕوپییە بوو[4]، جێگەی سەرنجە پێشتر ناوبراو سەرۆکی شارەوانی بوو، وە لە ساڵی ١٩٢١ بووە جێگری موتەسەڕیف[5].

سەبارەت بە سیستەمی کارگێڕی شارەکە، بەریتانییەکان بە دەستکاریەکی کەمەوە درێژەیان بە هەمان پەیڕەوی پێشووی عوسمانییەکان دا، کە لە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەخۆ بەڕێوەیان دەبرد، ئەفسەری سیاسیی بەریتانی ڕۆڵی موتەسەڕیفی دەبینی، کاروباری دادوەریشی رادەپەڕاند[6].

(های) لە دوای دووبارە گەڕانەوەی بۆ شارەکە، ئەنجوومەنیکی پێکهێنا، کە بە هاوشێوەی پەرلەمان ناوی دەبات، لە سەرەتادا دیاردیکەین کەسایەتییەکانی شار و دەوروبەری لە خۆگرتبوو، لەوانە: (مەلافەندی، ئەحمەد پاشا، موفتی شار، عەبدوڵا پاشا، ڕەشید ئاغا و عەلی پاشا دۆغرەمەچی) لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی دیکەی شار، کە لە ڕێگای ئەو ئەنجوومەنەوە

---

(1)-F.O 371/5069, Administration Report of th Arbil Division for the year 1919.

(٢) - دبليو.هی، م.س، ج١، ص ٢٢٣"

I raq Administration Reports1914 – 1932, Vol 3-1919 Archive Edition- 1992,P 434.

(٣) - العراق "جريدة"، ع (٨٨٤)، الخميس١٢ نيسان ١٩٢٣.

(٤) - العراق "جريدة"، ع(٨٧٥)، الاثنين ٢ نيسان ١٩٢٣.

(٥) - العراق "جريدة"، ع(٣٢٩)، الثلاثاء ٢٨ حزيران ١٩٢١.

(٦) - دبليو. هي، م.س، ج١، ص ٢٠٧.

ڕەوشی شارەکەی لەگەڵیاندا باس دەکردو ڕاوێژی پێدەکردن[1]. هەروەها ئەنجوومەنی شارەوانی لە شارەکە هەبوو، کە سەرەڕای ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی وەك ( پاك و خاوێن ڕاگرتنی شار و کۆکردنەوەی باج و... هتد)[2]، ساڵانە کۆبوونەوەی تایبەتی سەبارەت بە دانانی بودجەی هەولێر سازدەکرد[3]. هەروەها پێشنیازی لە بارەی چاکسازی و گۆڕانکاری و خەرجی و تێچوون دەخستەڕوو[4].

زۆرینەی یاساکانی سەردەمی عوسمانییەکان وەك خۆیان هێڵدرانەوە، لەگەڵ کارکردن بە ڕێنماییەکانی ئاینی ئیسلام، (های) خۆشی ڕۆژانە ئیش و کارەکانی خەڵکی ڕادەپەڕاند، ڕۆژانە سەیری (٣٠) داواو سکاڵای دانیشتووانی دەکرد[5]. بە تێپەڕبوونی کات، کاروباری دادوەری جێگیر بوونی بە خۆی بینی، لە لایەن ئەفسەرێکی دادوەری تاوانەکان بەڕێوەدەبرا و ئەفسەرێکی سیاسیی ویاریدەدەرێکی ئەفسەری سیاسیی و سەرۆکی شارەوانی تیایدا ئەندام بوون، بەڵام سەرۆکی شارەوانی دەسەڵاتەکەی سنووردار بوو، نەیدەتوانی قسە لەسەر هەموو تاوانێك بکات[6]. لە ڕووی دادوەرییەوە هەولێر سەر بە دادگەی بەرایی موسڵ بوو، بەڵام کە سەرۆکەکەی بەریتانی بوو، لەگەڵ دوو دادوەری دیکەی عەرەب کێشەکان یەکلایی دەکرانەوە[7]. بەپێی ڕاپۆرتێکی ئەفسەری سیاسیی لە ساڵی ١٩٢٠دا لە هەولێر (٣١١) دۆسیە لە دادگە ساتوسەودابیکردنی لەگەڵدا کراوە، کە (٢٧٥)یان یەکلایی کراونەتەوە و (٢٥)یان بۆ دادگەی تر گواستراونەتەوە و (١١) دۆسیەی دیکەش تاکاتی ئامادەکردنی ئەو ڕاپۆرتە یەکلایی نەکراوەتەوە. هەروەها لە دادگەی شەرعی دا (٩٦٥) دۆسیە ساتوسەوداییکردنی لەسەر کراوە،

---

(١) - م.ن ، ج١، ص ٢١٢.

(2) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P216.

(3) - F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, P241.

(4)- Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P216.

(٥) - هادي الجاوشلي، تراث اربيل...، ص ٢٤.

(6) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., PP208- 209.

(٧) - مس بيل، فصول من... ص ٢٩٣.

که (٧٨٣)یان یەکلایی کراوەتەوە و(١٦٧)یان تا کاتی ئامادەکردنی ئەو ڕاپۆرتە تەواو نـەبووە و (١٥)ی دیکەشیان ماونەتەوە[١].

جگە لەمەش (های) دەستیکرد بە ڕووپێو کردنی سەرجەم زەوییەکانی سنووری ئیدارەکـەی، هەربۆیە ماوەیەك ڕۆژانە لە (٥)ی بەیانییەوە تا (١١)پێش نیـوەڕۆ و هـەروەها لـە (٣)ی دوای نیوەڕۆوە تا (٧)ی ئێوارە سەرقاڵی ڕووپێوکردن بوو[٢]. هاوکات لە هەولێر دەست بە سـەرژمێری مەڕومالاّتەکان کرا[٣]. کاروباری وەقفیش لە هەولێر لە سەرەتادا جـێگیر نـەبوو[٤]، هەربۆیـە بەهۆی نەبوونی بەڕێوەبەرایەتیی وەقف لە شـارەکە، سـەرجەم کاروبـاری وەقـف خرابوونـە ژێـر دەستی موفتی هەولێر[٥]. بەڵام دواتر لە مـانگی (١١)ی سـاڵی ١٩٢٠دا ئەنجوومـەنی وەقـف پێکهات، کە ئەندامانی پێکهاتبوون لە ( موفتی، قازیـەك،٣ کارمەنـدی کـار و ئەفسـەرێکی سیاسیی)[٦].

بە مەبەستی پارێزگاریکردن لـە خـۆی و دەسـەڵاتەکەی، (هـای) دەسـتی بـە پێکهێنـان و ئامادەکردنی هێزی پۆلیس کرد، هەر بۆ ئەو مەبەستە لەژێر سەرپەرشتی و فەرماندەیی یـەکێك لە هاوکارەکانی بە ناوی (مستەر ڕۆبنیس- Mr.H.C.Robbins) نێزیکەی (٣٥) کەس خرانە ژێر مەشق و ڕاهێنان، هەروەها نێزیکەی (١٥٠) کەسی دیکە لـە ژێـر فـەرمانی ئەفسـەرێکی دیکە مەشقیان پێ دەکرا. دواتر ئەو کارە بە عەریف (کینارد)و لـە پاشـان بـە (سـەید عـەلی ئەفەندی) سپێردرا، کە ئەوەی دوایی عەرەبێکی سووری بوو[٧]. دوادیکەش )چـارلس لیتلـدیل)

---

(1) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil …., PP208- 209.

(٢) - دبليو. هي، م.س، ج١، ٢١٠ .

(3) - F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, P240.

(4) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil …, P215.

(5)-F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, P240.

(6) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil …, P215.

(٧) - دبليو.هي، م.س، ج١،ص ٢١٢.

سەرپەرشتی کردنی پۆلیسی لە ئەستۆ گرت[1]، کە بە هۆی ڕۆڵی چالاکانەی لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی لە هەولێر، لەلایەن فەرماندەی گشتیی هێزەکانی بەریتانییەوە، (ویسامی خاچی سەربازی) پێ بەخشرا[2]. هێزی پۆلیسی هەولێر لەژێر سەرپەرشتی یاریدەدەری بەڕێوەبەری پۆلیسی موسڵ بوون[3]. کاپتن (های) ئاماژە بەوە دەکات، کە ئەو هێزە ڕۆڵی بەرچاویان لە دەستەبەرکردنی هێمنی شارەکەو دەوروبەری و پاراستنی سەروماڵ و گیانی دانیشتووان و سەپاندنی یاسا بینی[4]. هەندێك لە دانیشتووانی هەولێریش پەیوەندییان بەو هێزانە کرد[5]. سەرەڕای ئەو ئەرکانەی باسکرا دەکرێت بڵێین ئەو هێزە ئەرکی سەرەکیی لێدان و چاوسوورکردنەوە بوو، لە نەیارانی دەسەڵاتی بەریتانی لە شارەکە، هەروەها بەم هۆیەوە پارێزگاری لە دەسەڵاتی بەریتانی دەکرا.

ئەو هێزەی کە لە ژێر فەرماندەیی (لیتلدیل) رێکخرابوو، بە شێوەیەکی زۆرچاك ڕاهێنرابوون، بەروبوومی ئەو ڕاهێنانە لەکاتی ئەو ڕاپەڕینانە بە دیار کەوت، کە دواتر باسیان دەکەین. هەرچەندە ئەوانە بە پۆلیس ناسرا بوون، بەڵام بە هەموو مانایەك هێزی چیایی بوون[6]. دوادیکەش دەستەیەکی دیکەی سەربازی بەریتانی لە شارەکە جێگیرکرا کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٠ لە سێ فەوج پێکهاتبوو[7]، وە سەر بە سوارەی لیڤی[1] بوون. بەپێی

---

(١) - کاپتن لاین، کورد عەرەب بەریتانییەکان / بیرەوەرییەکانی کاپتن لاین لەمەڕ ڕووداوەکانی باشووری کوردستان ١٩١٩ – ١٩٢٩ ، و: د. یاسین سەردەشتی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٧١.

(٢) - جي. كيلبرت براون، قوات الليفي العراقية ١٩١٥ – ١٩٣٢، ت: د. مؤيد إبراهيم الونداوي، مراجعة: رفيق صالح، السليمانية، ٢٠٠٦، ص ٦٣.

(3) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P210.

لە ١٩٢٠/٢/٢٨ کاپتن کابوت بە یاریدەدەری بەڕێوەبەری پۆلیسی موسڵ دەستنیشان کرا و پشکێنەری گشتی پۆلیسیش لە بەغدا بوو، کە لە ١٩٢٠/٤/١ کۆلۆنێل پریسکۆت بۆ ئەو پۆستە دەست نیشانکرا. مس بیل، فصول من... ص ص ٣٣٢-٣٣٣.

(٤) - سنتان في كردستان، ج١، ص٢١١.

(٥) - مس بیل، فصول من...، ص٣٢٨.

(٦) - کاپتن لاین، س.پ، ل٧٣.

(7) -F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, PP 233-24.2

ڕاپۆرتێکی بەریتانی لە سەرەتای مانگی نیسانی ساڵی ١٩٢٠دا هێزی لیڤی بۆ یەکەم جار لە هەولێر دروست بوو، کە (Lieut.G.F.Barlow) سەرپەرشتی دەکردن[٢]. هەفتانەش ئەو هێزانە ئاهەنگیان دەگێڕا و لەلایەن ئەفسەری سیاسیی دەپشکێنران[٣]. کۆنترۆڵ کردن و ناونووسینی سەربازانی هێزی لیڤی لە دەسەڵاتی ئەفسەری سیاسیی بوون، بەڵام لە ڕووی ئیدارەو داراییەوە سەر بە فەرماندەیی گشتیی هێزی لیڤی بوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئەفسەری سیاسیی دەسەڵاتی هەبوو، ئەو هێزە بۆ هەر کردەیەکی سەربازی بەشداریی پێ بکات[٤]. ژمارەی ئەو هێزە لە هەولێر لە ساڵی ١٩٢٠دا (١٨٥) سوارە و (٧٤)پیادەبوو[٥]. ئەو هێزانەش ڕۆڵی دیاریان لە ڕووبەڕووبوونەوەی بزووتنەوە چەکدارییەکانی ناوچەکە هەبوو.

لە لایەکی دیکەوە هەڵسوکەوتەکانی ئەفسەری سیاسیی خەڵکی شاری هەراسان و بێزار کردبوو، لەوانە هەر کاتێك بە هەر شوێنێك تێپەڕ بووایە، دەبووایە خەڵك لە بەری هەڵبستن[٦]. زۆرجاریش لەسەر ئەو ڕفتارەی تێکگیران و بارگرژی لە نێوان (های) و پیاوماقوڵان بە تایبەتی زانایانی ئاینی دروست دەبوو[٧]. لەبەرئەوەی زانایانی ئاینی لە گۆشەنیگای ئاینییەوە بە دروستیان نەزانیووە، لەبەر کەسێکی ناموسڵمان هەڵبستنەوە، لە کاتێکدا بەرپرسانی بەریتانی لە زۆرینەی ناوچەکانی دیکەش پێداگیریان لەسەر ئەوە دەکردەوە و تەنانەت لە کاتی سەرپێچی کردندا سزایان بە کاردەهێنا.

---

. ستیفن همسلی لونكريك، العراق من ١٩٠٠ الى سنه ١٩٥٠...، ص ١٧١

(١) - لیڤی ئەو هێزە بوون، کە بەریتانیەکان لە دوای داگیرکردنی ناوچەکە پێکیانهێنا، کە لە عەرەب و کورد و کەمە نەتەوەکانی تر پێکهاتبوون، ئەو هێزە ڕۆڵێکی گرنگی لە سەرکوت کردنی بزووتنەوە و ڕاپەڕینەکان هەبوو. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: جي.براون، م.س. ص ١١ ومابعدها.

(2) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P209.

(٣) - کاپتن لاین، س.پ، ل٧٣.

(4) - I raq Administration Reports1914 – 1932, Vol 3-1919,Some Remark on the Differences in Organisation and Suggestions to co-ordinate Control in the Kurdish Levies of Sulaimaniyah and Erbil,P 245.

(5) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P210 .

(٦) - چاوپێکەوتن لەگەڵ د. عەبدوڵڵا حەداد.

(٧) - چاوپێکەوتن لەگەڵ مومتاز حەیدەری" چاوپێکەوتن لەگەڵ د. عەبدوڵڵا حەداد

هەروەها کاتێك (های) گفتوگۆی لەگەڵ هەرکەسێك بکردبایە، ئەو کەسە بۆی نەبوو دەنگ بەرزبکاتەوە، هەربۆیە دەبینین لە یەکەم کۆبوونەوەی لەگەڵ پیاوماقوڵانی شارو دەوروبەری، پێیان دەڵێت: ئێوە بۆ ئەوا لە ئاستی مندا دەنگ بەرزدەکەنە، لەو کاتەدا (سەید عەبدوڵاپاشا) وەڵامێکی ژیربێژانەی دەداتەوە و دەڵێت: **"ئێمە خەڵکی دەشت و ناوچە شاخەکاوییەکانین، وا گۆشکراوین بە ئازادانە دەنگ هەڵبڕین، دەنگی ئێمە لە عەقڵمانەوەیە، بەڵام دەنگی ئێوە لە قورگتانەوەیە"**[1].

سەرباری ئەوانەش بەریتانییەکان بەبێ لەبەرچاوگرتنی بەهای ئاینی و کۆمەڵایەتی و ڕێزگرتن لە داب و نەریتی کۆمەڵایەتی، "تیاترۆخانە"یەکیان لە شارەکە کردەوە، کە ئەوەش بێزاری و توڕەییەکی زۆری لە نێوان دانیشتووان بە شێوەیەکی گشتیی لێ کەوتەوە[2]. هەروەها لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانی داهاتووە، لە دوای هاتنی بەریتانییەکان نێزیکەی (١٠) مزگەت بە بیانووی ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی داخران[3]. بەڵام ئەو مەسەلەیە ڕەنگە زیادە ڕۆیی تێدا بێت، چونکە لە چوارچێوەی ئەو پڕوپاگەندانە بوو کە لە دژی بەریتانییەکان بڵاویان دەکردەوە.

لە بەرامبەر ئەوەشدا ناکرێت نکۆڵی لەوە بکەین، کە لەگەڵ هاتنی دەسەڵاتی بەریتانی بۆ شارەکە، تا ڕادەیەك گرنگی بە دەستەبەرکردنی پاك و خاوێنی شار درا، هەروەها چەند کوچەو کۆڵانێك نۆژەن و چاککراونەوە و سەکۆ و ئاوڕێژگەیان بۆ دروستکرا[4]. جگە لەمەش بەر لە ڕۆژئاوا بوونیش، لەبەر هاتووچۆی هاووڵاتیان فانۆسیان لە دیوارەکان هەڵدەواسی، کە لە نێوان هەر (٢٠) تا (٣٠) هەنگاوێك چرایەك دادەگیرسا، هەموو ئێوارەیەك کارمەندێکی شارەوانی لەگەڵ خۆی دەیهێناو بە دارێکی دوو گوێ هەڵی دەواسی[5]. هەروەها لە دەسپێکی کارەکاندا

---

(١) - چاوپێکەوتن لەگەڵ د. عەبدوڵڵا حەداد. ناوبراو باوکی لە کۆبوونەوەکە بەشداربوو.

(٢) - صدى الاحرار (جريدة)، الموصل، ٢٠ شباط، ١٩٥٣. وەرگیراوە لە: د.کەمال مەزهەر احمد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەغدا،چ١ ، ب١ ،١٩٨٥، ل ١٨٥.

(٣) - نامەیەکی جوفرەکراو کە لە (وان)ەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ( نظارة الداخلية)ی عوسمانی ڕەوانە کراوە. لە بەرواری ١٣٣٥/٨/٦ڕۆمی لە: د.خليل علي، مختارات من كتاب ...، ص ١٧٤ .

(4) -F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, P241.

(٥) - تاریق جامباز و نەژاد بەرزنجی، س.پ، ل ل ١١ - ١٢.

پردێك لە نێوان هەولێرو پردێ دروست كرا و پرۆژەی گەیاندنی ئاوی خواردنەوە لە كارێزەكانی باشووری هەولێرەوە بۆ ناوشار جێ بەجێ كرا[1]، لەم چوارچێوەیەدا عەمبارێكی ئاوی ناوەندی دامەزرا. وێڕای دانانی ژمارەیەك عەمباری ئاوی بچوك لەهەر یەكێك لە گەڕەكەكانی شاردا بە قەلاشەوە، ئاویش لە عەمبارە گەورەكەوە ڕادەگوێزرایە نێو عەمبارە گچكەكان[2]. ئەو پرۆژەیە (٧٦,٣٣٦) روپیەی لەسەر بودجەی سالانی١٩٢٠ و ١٩٢١دا بۆ دابین كرا [3]. هەروەها گرنگی بە چاككردنی ڕەوشی تەندروستی شارەكە دراو پزیشكی نوێ لە هەولێر دامەزرا[4]. هاوكات تەلارێكی نوێ بۆ نەخۆشخانە لە قەراغ شار دیاریكرا ، دكتۆر ولیامسۆن (Dr.H.Williamson) كاری لە نەخۆشخانەكە دەكرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەخۆشخانەكە كەموكوڕی زۆری تیادا بوو، لە ڕووی كەلوپەل و پێداویستی پزیشكی، هەر لەو ماوەیەدا بە هۆی تێكەڵبوونی ئاوی خواردنەوە بە شتی پیسەوە، نەخۆشی مەلاریا لە شارەكە تەشەنەی كرد[5]. بەپێی ڕاپۆرتێكی ئەفسەری سیاسیی هەولێر، لە ساڵی ١٩٢٠دا (٦٤٠) نەخۆش سەردانی ئەو نەخۆشخانەیان كردووە[6]. لەوماوەیەشدا چەند ڕێگەو بانێك كەوتنە قۆناغی دروستكردن، بەڵام بەهۆی باران بارینەوە بۆماوەیەك كاریان تێدا دواكەوت[7].

لە دوای تەواوبوونی جەنگ، ئەو خەڵكانەی كە بە هۆی خۆدزینەوە لە سەربازانی عوسمانی شوێنی خۆیان بۆ ناوچە دوورە دەست و شاخاوییەكان بەجێهێشتبوو، گەڕانەوەو دەستیان

(1) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P216 .

(2) - F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, P241.

(3) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P216 .

(٤) - مس بیل، فصول من...، ص ص ٣٣٨-٣٣٩.

(5)- Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P216 .

(٦) - بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی جۆری نەخۆشیەكان و ژمارەی تووشبووان، بڕوانە: پاشكۆی ژمارە ( ٤ ).

(7) - F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, P241.

بەکارەکانیان و کێڵانی زەوییەکانیان کردەوە[١]، بێگومان لە ئەنجامی ئەوەش ئـابووری ناوچـەکە تارادەیەك بووژایەوە.

هەروەها ئەو عەمبارانەی کە پڕ دانەوێڵەبوون وپێشتر سەربازانی تـورك بـەزۆر لـە خـەڵکی ناوچەیان کۆکردبووەو بەکاریان نەهێنابوو، لـە لایـەن بەریتانییەکانـەوە شـکێنران و بەشـێکیان بەسەر خەڵکدا دابەشکران[٢]. بێگومان لەمەشدا مەبەستیان ڕاکێشانی سـۆزی خەڵکەکـە بـوو، لە کاتێکدا ئەو دانەوێڵەیە لە بنەڕەتدا هی خودی دانیشتووانی ناوچەکە بوو، بۆیە دەتوانین بڵـێین ڕوونی خۆیان لەخۆیان سووتاندەوە.

لەسەر ئاستی باڵای ئیدارەی بـەریتانی لـەم سـەروبەندەدا هـەوڵی ئـەوە لـە ئـارادابوو کـە هێڵێکی شەمەندەفەر لە نێوان (خانـەقین- کفـری — کـەرکووك — پـردێ- هـەولێر- موسـڵ) دروست بکەن، بەڵام لەم ماوەیەدا ئـەو هەوڵـە لـە لایـەن بەریتانییەکانـەوە نەخراوەتـە بـواری جێبەجێکردن. خودی (وڵسن)یش جێبەجێکردنی ئەو پلانـەی بـە کـارێکی گـرنگ دانـاوە، بـۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە بە ئاسانی دەستیان بەم ناوچانە بگات[٣]. چونکە بێگومـان ڕاکشـانی ئـەو هێڵە بـۆ گەیانـدنی کۆمـەك و هێـزی سـەربازی و بەرپەرچـدانەوەی هـەر بزووتنەوەیـەك، کـە لەناوچەکە سەرهەڵبدات بە سوود دەبوو.

لە لایەکی دیکەوە گەیشتنی هێڵی شەمەندەفەر بۆ ناوچەی شەرگات، وایکرد ژمارەیەك لـە لادێیەکانی هەولێر بە ئاسانی بچنە بەغداو لەوسەرە کەمێك شتومەکی بازرگانی لەگەڵ خۆیـان بهێنن و لە بازاڕی گوندەکان بە نرخێکی هەرزانتر لەچـاو بـازاڕی شـاری هـەولێر بیفرۆشـنەوە. بـەپێی دۆکیـۆمێنتێکی بـەریتانی ئـەوەش وایکـرد گونـدەکان بـازاڕی خۆیـان هـەبێت و زەمینەسازییەکی باشیشی بۆ پەرەسەندنی بازرگانی لە دەڤەرەکە ڕەخساندووە[٤].

---

(١) - جەلال خدر، حـاجی احمـدی جامبـازی لاوك و حـەیران بێـژ و مقـامزان (١٨٨٢- ١٩٧٤)، ڕامـان "گۆڤار" ژ (٧٦)، هەولێر، تشرینی یەکەم ٢٠٠٢، ل ١٢٧.

(٢) - چاوپێکەوتن لەگەڵ د.عەبدوڵلا حەداد.

(٣) - بڕوانە: بروسکەیەکی وڵسن نوێنەری باڵای بەریتانیا لـە عێـراق، ژمـارە (٣٩٤٧/ ١٦٣٤٧٧)ی ڕۆژی (٢٨)ی تشرینی دووەمی ١٩١٩ کە بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیای ناردووە. وەرگیراوە لە: د. احمد عوسمان، کوردستان لە سەردەمی ئاشتی، و: موحەممەد نوری تۆفیق، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ل ١٥٩-١٦٠.

(4) -F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, PP 239-240.

سەبارەت بە خوێندنیش دەتوانین بڵـێین لەگـەڵ دەسـتپێکردنی یەکـەمین جـەنگی جیهـانی دەرگای قوتابخانەکان لە هەولێرو زۆرینەی ناوچەکانی دیکە داخران، بـەڵام لـە دوای تـەواوبوونی جەنگ دەرگای قوتابخانەکان لە شارەکە کرانـەوە[1]. لەوماوەیـەدا (٢) قوتابخانـەی فـەرمی لـە شارەکەدا هەبوون، کە لە (٩) پۆل و (٢٢٠) قوتابی و (١٣) مامۆستا پێکهاتبوون، بەڵام هـیچ قوتابخانەیەکی ناوەندی لە شارەکە نەبوو، هەروەها قوتابخانەی فـەرمی ئاینیش(ئیسـلامی) لـەم ماوەیە بەدی نەدەکرا[2]. بەڵام بەرە بەرە خوێندنی فەرمی دەبووژایەوە، ئەوە لە کاتێکدا پێشـتر قوتابخانە ئاینییەکان زیاتر ئـەو ڕۆڵـە گرنگـەیان هـەبوو. هـەروەها قوتابخانەیـەکی ئـەهلی بـۆ کریستیانیان هەبوو، کە پێکهاتبوو لە (٤) پۆل و (٤٩) قوتـابی و (٣) مامۆسـتا[3]. ئیـدارەی بەریتانی لە ساڵی ١٩٢٠دا خەرجی ئەو قوتابخانەیەی لە (٥٠) ڕوپییە بـۆ (٢٠٠) روپیـە زیـاد کرد[4]. هەرچەندە سەرچاوەیەك ئاماژە بەوە دەکات، کـە جوولەکـەکانیش قوتابخانـەی تایبـەتی خۆیان هەبووە[5]. بەڵام لەو ئامارەی کە ڕۆژنامەی (ئەلعێراق) لە سـاڵی ١٩٢١بڵاویکردۆتـەوە، هیچ ئاماژەیەك بۆ هەبوونی قوتابخانەی جوولەکە لە هەولێر لەو ماوەیەدا لە ئارادا نییـە[6]. لـە بارەی ئاستی خوێندن، ڕاپۆرتێکی ئەفسـەری سیاسـیی لـە هـەولێر ئامـاژە بـەوەدەکات، کـە ژمارەی قوتابیانی کەوتوو لە ساڵی ١٩٢٠دا ڕووی لە زیادی کردووە[7].

---

(١) - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت ڕەوتی خوێندنی فەرمی لە هەولێر بڕوانە: د.محمد کاکە سوور، گەشـەکردنی خوێندنی فەرمی....

(٢) - عبدالرزاق الهلالي، تاريخ التعليم في العراق في عهـد الآحـتلال البريطـاني ١٩١٤ – ١٩٢١، بغـداد، ١٩٧٥، ص ٢٥٤ – ٢٥٦" العراق "جريدة"، ع(٣٦٥)، السبت ٦ اب ١٩٢١.

(٣) - العراق"جريدة"، ع(٣٦٥)، السبت ٦ اب ١٩٢١.

(4) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P215 .

(٥) - البرت م. منتشاشفيلي، م.س، ص١٩٧.

(٦) - العراق"جريدة"، ع(٣٦٥)، السبت ٦ اب ١٩٢١.

(7) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P216 .

## تەوەری دووەم

## هەڵوێستی خەڵکی هەولێر بەرامبەر بە داگیرکاری بەریتانی

سەرەڕای ئەو ناسۆریەی کە دانیشتووانی هەولێر لە دوا سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانی بە تایبەتی لە ساڵانی (١٩٠٨ — ١٩١٨) چەشتیان، بەڵام لەگەڵ پێشڕەویی کردنی هێزەکانی بەریتانیا بەشێك لە دانیشتووانی هەولێر، بڕیاری رووبەڕووبوونەوەی ئەو هێزانەیان دا. بۆ ئەو مەبەستە (ڕەشید ئاغا) لە ساڵی ١٩١٤ هێزێکی چەکداری لە بەشێك لە دانیشتووانی هەولێرو دەوروبەری و بە تایبەتی ناوچەی شەمامك پێکهێنا[1]، ئەو هێزەش بەهێزی (شەمامك) دەناسرا، تەنانەت وەك هێزێکی سەربازی ڕێکخراو ئاڵاو تەپڵ و بوقی تایبەتی هەبوو[2].

بەشێکی دیکەی دانیشتووانی هەولێر لە ژێرکاریگەری هەستی ئاینی و لە هەندێ باریشدا لە ژێر فشاری عوسمانییەکان بەشدارییان لە بەرەکانی جەنگ کرد، تەنانەت ژمارەیەکیان لە کاتی جەنگ لە لایەن بەریتانییەکانەوە دەستگیرکران و ڕەوانەی هیندستان کران. لەوانە گەنجێك بە ناوی (یونس مەلا)[3]. هەندێکی تر بەهۆی جەنگەوە بە جۆرێك لە جۆرەکان پەڕاگەندەی وڵاتان بوون. ژمارەیەك گەنجی دیکەی هەولێرو دەوروبەری لە جەنگدا

---

(١)- مەهدی محەمەد، هەولێر لەسەردەمی داگیرکاری...،ل ١٦١.

(٢) - چاوپێکەوتن لەگەڵ د. ئەرسن موسا رشید.

(٣)- یونس مەلا گەنجێکی شاری هەولێر بوو، لەگەڵ دەستەیەك لە گەنجەکانی شارو دەوروبەری بەشداری جەنگی یەکەمی جیهانی کرد، لە یەکێك لە شەڕەکان لە لایەن هێزەکانی بەریتانی بەدیل گیراو نێردرایە شاری حەیدر ئابادی هیندستان، دواتر بە هەرچەشنێك بێت لە بەندیخانەدا لەگەڵ دەستەیەك لە هاوڕێکانی توانیان دەست بەسەر خەزێنەی ئەو سەربازگەیە دابگرن و بەسەر زیندانییەکانیەکان دابەشیان کرد، لە بەرامبەر ئەو کارەدا فەرمانداەی سەربازگەکە بڕیاری کوشتنی بۆ دەرکرد، بەڵام دواتر بڕیارەکە جێبەجێ نەکرا. مولود بێخاڵی، هەولێرم...، ب١، ل ل ٣٠ — ٣١.

کوژران و تەنانەت تەرمەکانیان نەگەڕایەوە[١]. هاوکات بەشێك لە دەوڵەمەندانی شار کە خودان پارەو سامانێکی زۆر بوون، کۆمەك و یارمەتی داراییان بۆ لەشکری عوسمانی دابینکردووە[٢]، کە ڕەنگە زۆرینەشیان بە زۆرەملێ ئەو پارەیان دابێت، چونکە زۆر جار دەسەڵاتداران بە ناوی کۆمەککردن، پارەیان لە دەوڵەمەندەکان کۆدەکردەوە.

ئەو کەسانەش کە بەشدارییان لە ڕووبەڕبوونەوەکانی سوپای بەریتانیا کرد، لەلایەن خەڵکەوە نازناوی (غەزایی)یان[٣] پێدرا، بۆ نموونە هاوڵاتییەکی گوندی قوڵتەپەی ڕەشیدی دەشتی هەولێر ناوی (مستەفا) بوو، لە دوای گەڕانەوەی لە بەرەکانی جەنگ بە (مستەفا غەزایی) دەناسرا[٤].

لە دوای گەیشتنی سوپای بەریتانیا بۆ کەرکووك و پردێ و مۆرکردنی ئاگربەستی مۆدرۆس، سەبارەت بە هاتنی هێزەکانی بەریتانیا بۆ شارەکە، لە کەرکوکەوە نامەیەك ئاراستەی کار بەدەستان و دانیشتووانی هەولێر کرا،[٥]. لێرەدا بەتایبەتی (ئەحمەد عوسمان)ی سەرۆکی شارەوانی ئاگەدارکرایەوە[٦]. _ وەك پێشتر باسمان کرد - دیارە بەریتانییەکان بەم هەڵوێستەیان مەبەستیان بوو زەمینە بۆ چوونە ناو هەولێر خۆش بکەن و ڕووبەڕووی بەرگری دانیشتووان نەبنەوە.

ناوەڕۆکی ئەو نامەیە لە نێو گەورە پیاوان و سەرۆك هۆزەکانی هەولێرو دەوروبەری بڵاوبووە و بەمەبەستی تاوتوێکردنی ئەو پێشهاتە نوێیە گرنگە، دەست بەجێ کۆبوونەوەیەکیان سازکرد [٧]. لەو کاتەدا گەورە پیاوانی هەولێر بۆ دوو بۆچوون دابەشبوون[٨]" بەرەیەکیان بە توندی داگیرکاری بەریتانییان بۆ شارەکە ڕەتکردەوە و

---

(١) - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نورەدین دەباغ.

(٢) - مەهدی محەمەد، هەولێر لەسەردەمی داگیرکاری...،ل ١٦٢.

(٣)- واتە ئەوانەی غەزا و شەڕیان لەدژی کافران کردووە.

(٤) - مەهدی محەمەد، هەولێر لەسەردەمی داگیرکاری...،ل ١٦٢.

-(٥) دبيلو. هي، م. س،ج١، ص ١٤٤.

(٦)- چاوپێکەوتن لەگەڵ ئیحسان موفتی" چاوپێکەوتن لەگەڵ کەنعان موفتی.

(٧)- هادي الجاوشلي، تراث اربيل...، ص ص ٢٣ — ٢٤.

(٨) - مولود بێخاڵی، هەولێرم...، ب١،ل ٢٥.

پێداگیریان لەسەر بەرەنگاربوونەوەو شەڕ لە دژی سوپای بەریتانیا کرد. کە دیاردیکەینیان ( سەید عەبدوڵا پاشا نەقیب، ڕەشید ئاغا، عەلی پاشا دۆغرەمەچی، ئەحمەد پاشای دزەیی، پیرداود ئاغایی دزەیی و جەمیل ئاغای گەردی[1]) بوون . ئەوانە پاشخانەکی عوسمانییان هەبوو، بەرەی دووەم بە سەرۆکایەتی هەریەکە لە: ( مەلافەندی، ئەحمەد عوسمان، ئیبراهیم بایز ئاغای دزەیی) بوون. ئەوانە هەڵوێستیان نەرم بوو، داکۆکیان لە هاتنی هێزەکانی بەریتانی بۆ شارەکە کرد، پێداگیریان لەسەر ئەوە کردەوە، کە پێویستە بەبێ هیچ بەرگرییەك پێشوازی لە هاتنیان بکرێت[2]. دیارە سەرەتا بەشی زۆری کەسایەتییە دیارەکان لەگەڵ بیرۆکەی بەرگری بوون، بەڵام گروپی دووەم ڕوونیان کردەوە: لەبەر ئەوەی سوپای عوسمانی لە زۆرینەی ناوچەکان پاشەکشەی کردووە و لە شکست دایە، بۆیە ئەوانیش ناتوانن بەرەنگاری سوپایەکی پێشکەوتووی وەك بەریتانیا بکەن[3]. لەکۆتاییدا بۆچوونی دووەم زیاتر خۆی سەپاندو بڕیاردرا بەرەنگاری داگیرکاری بەریتانی نەکرێت[4]. بەڵام ناکرێت بڵێین یەك دەنگی تەواو لەم بڕیارەدا هەبوو.

لە لایەکی تر لەگەڵ بڵاوبوونەوەی هەواڵی گەیشتنی هێزەکانی بەریتانیا بۆ هەولێر، بەشێك لە زانایانی ئاینی فتوایان دەرکرد و تیایدا جاڕی ئەوەیان دا، کە: هەر کەسێك دیدەنی داگیرکاران بکات خودا لێی خۆش نابێت، ئەگەر هاتوو هەر کەسێك لە ڕێگادا داگیرکارانی بینی و تووشیان بوو، پێویستە چاوی خۆی بنوقێنێت و بەهیچ شێوەیەك نابێت سەراسوویان بکات[5]. ئەوەش بەهۆی زەمینەی بەهێزی ئایینی خەڵکی ناوچەکە بوو.

---

(١) -جەمیل ئاغای کوڕی کاکل ئاغای کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ عەباس کوڕی عەرەب ئاغای گەردییە، ساڵی ١٨٨٦ لە دێی بەحرکەی سەر بەناوچەی هەولێر لە دایك بووە، لە حوجرە خوێندوێتی، سەرۆکی هۆزی گەردی بوو، ناوبراو لە خولی حەوتەم و هەشتەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، نوێنەری لیوای هەولێر بوو، لە ساڵی ١٩٤٣ مردووە. احمد حەمەد ئەمین، ئەندامە کوردەکانی...، ل ٣٩.

(٢) - بوتان جلال، م.س ،ص ٥٨.

(٣) - هادي الجاوشلي، تراث اربيل...، ص ٢٤.

(٤) - مەهدی محەمەد، هەولێر لەسەردەمی داگیرکاری...،ل ١٦٢" بوتان جلال، م . س، ص ٥٨" مولود بێخاڵی، هەولێرم...، ب١،ل ٢٥.

(٥)- هادي الجاوشلي، تراث اربيل...، ص٢٤.

ئەو فتوایەی زانایانی ئاینی هەولێر، ڕەنگدانەوەی لەسەر دانیشتووانی شارو دەوروبەری هەبوو، تەنانەت خەڵکی ئاسایی شار، بەتایبەتی ئەوانەی هەستی ئاینیان بەهێز بوو، هەرکاتێك فەرمانبەرێکی بەریتانی بە تەنشیتیەوە گوزەری بکردبایە، دوای ڕۆیشتنی تفی ڕوودەکرد، ئەوەش مانای ئەوەبوو، کە بە چاوی گڵاوی سەیری کردووە[1]. بەشێك لە دانیشتووانی هەولێر هەر لە سەرەتادا کارکردنیان لەگەڵ هێزی داگیرکار بە حەرام و لادان لە ڕێساکانی ئاینی ئیسلام لەقەڵەمدا. هەندێکیش لەگەورە پیاوانی شار وەرگرتنی هەر چەشنە پۆستێکیان لە لەلایەن ئیدارەی بەریتانی لە شارەکە ڕەتکردەوە، لەم ڕووەوە هەوڵەکانی (های) سەری نەگرت کاتێك هەوڵیدا (سەید عەبدوڵا پاشای نەقیب) بە چەندین پۆستی باڵا ڕازی بکات، چونکە ناوبراو ئامادە نەبوو لەژێر سایەو سێبەری داگیرکارێکی ناموسڵمان هیچ چەشنە پۆستێك وەربگرێت، ئەو ئەوەی بەلادان لە ڕێنمایەکانی ئاینی ئیسلام دەزانی[2]. هەر بۆیە هەولێر بە گوڵ و چیمەن بۆ هێزەکانی بەریتانیا نەڕازابووە، بەو شێوەیەی کاپتن (های) ئاماژەی بۆ کردووە[3].

(ڕەشید ئاغا) کە بە دیاردیکەین و سەرسەخدیکەیەن نەیاری دەسەڵاتی داگیرکاری بەریتانی لە شارەکە دادەنرا، شانبەشانی (عەتاوڵا ئاغا)ی[4] کوڕی دەستی بە دژایەتی و بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە لەدژی بەریتانییەکان کرد[5]. هەر بۆ ئەو مەبەستە ناوبراو گروپێکی لە دانیشتووانی شارو دەوروبەری لە خۆی کۆکردەوە و لەو ڕێگەیەوە دژایەتی

---

(١) - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نەجمەدین نورەدین بەقاڵ ئەلموختار، هەولێر، ٢٠٠٧/٧/١. ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٦ لە گەڕەکی عەرەبی شاری هەولێر لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩٥٩ تا ١٩٩٢ بە پچڕپچڕی ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی هەولێر بوو، تائێستە لە ژیاندا ماوە لە هەولێر دادەنیشێت.

(٢) - بوتان جلال، م . س، ص ٥٨.

(٣) - سنتان في كردستان، ج١، ص ١٩٧.

(٤) - عەتاوڵا ئاغا لەساڵی ١٨٨٢ لە دایك بووە، لە لای مامۆستای تایبەت و خوێندنگاکانی فەرمی سەردەمی عوسمانی خوێندوویەتی و لە زانستی ئاینی دا شارەزا بوو، لە خولی هەشتەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بە نوێنەرایەتی هەولێر بووەتە ئەندامی ئەنجومەن، لە ساڵی ١٩٦٣ مردووە. احمد حمەد ئەمین، ئەندامە کوردەکانی ..،ل ٦٨.

(٥) - دبليو. هي، م.س، ج١، ص ١٩٩.

بەریتانییەکانی کرد. هەندێ سەرچاوە ئەو گروپە بە ( حزب) ناو دەبەن[1]، بەڵام لە راستیدا تەنیا گردبوونەوەیەك بوو، چونکە خاوەن پەیڕەو و پڕۆگرامێکی نەخشە بۆکێشراو نەبوو. هاوکات لەگەڵ ئەوەدا گروپێکی تر لەشاردا پەیدابوو، کە (عەلی پاشای دۆغرەمەچی) سەرۆکایەتی دەکرد[2] ، کە (های) لەماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا لە شارەکە بە یەکێك لە سەرسەخدیکەی‌ن نەیارانی خۆی ناوی دەهێنێت و دەڵێت بەردەوام بانگەشەی دژایەتیکردنی بەریتانییەکانی لە شاردا بڵاودەکردەوە[3].

ئەو گروپانە هەرچەندە نەیاندەتوانی بەئاشکرا کاروچالاکییەکانیان ئەنجام بدەن، بەڵام بەنهێنی کاریان دەکرد و خەڵکیان لە دەوری خۆیان کۆدەکردەوە[4]. هەروەها توانیبوویان هەست و سۆزی زۆرینەی ئەو کەسانە بۆ خۆیان کێش بکەن، کە لەسەردەمی عوسمانی فەرمانبەربوون و دواتر لەلایەن بەریتانییەکانەوە لەسەر کارەکانیان لادرابوون، جگە لەمانە بەشێك لەدانیشتووان، کە داگیرکاریان رەتدەکردەوە بەرەبەرە خۆیان خزاندە ناو ئەو دوو گروپە[5]. ئەو دوو گروپە لە کۆبوونەوەکانیاندا قسەیان لەسەر نارەزاییەکانی خەڵکی شارو دەوربەری و چۆنییەتی بەرەنگاربوونەوەی هێزی داگیرکار دەکرد و لە مبارەیەوە بیروڕاکانی خۆیان ئاڵوگۆڕو تاوتوێ دەکرد[6].

---

(١) - بڕوانە دەقی ئەو نامەیە جوفرەکراوەی کە لە (وان)ەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ( نظارة الداخلية)ی عوسمانی ڕەوانە کراوە. لە بەرواری ١٣٣٥/٨/٦ڕۆمی لە: د.خليل علي، مختارات من كتاب ..،ص١٧٤" هەروەها بڕوانە: دبليو هي، م.س، ج١، ص ١٩٩.

(٢) - د.خليل علي، مختارات من كتاب ..، ص ١٧٤.

(٣) - سنتان في كردستان ، ج١، ص ٢٠٠.

(٤) - چاوپێکەوتن لەگەڵ د. ئەرسن موسا رشيد.

(٥) - دبليو. هي، م.س، ج١، ص ٢٠٠.

(٦) - عبدالرزاق محمد اسود، موسوعه العراق السياسيه، ج ٢، ط١، بيروت، ١٩٨٦، ص٣٦٢.

(مزگـەوتی شـێخی چـۆلی)[1] یـەکێك بـوو لـە گرنگدیکـەی‌ن ئـەو شـوێنانەی کـە کۆبوونەوەکانی تێدا ئەنجام دەدرا، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە، کە ئەوکات شوێنێکی چـۆڵ و لاپەڕ بوو[2]. لە ڕاستیدا مزگەوتەکان سەکۆیەکی گرنگ و بەرچـاوی پەخشـکردنی بـیرو گیانی دژایـەتی و بەرەنگاربوونـەوەی هێـزی داگیرکـاری بـوون. دیـارە بەریتانییـەکانیش هەستیان بە کۆڕوکۆبوونەوەکانی مزگەوتـەکان کـردووە، بۆیـە بەڵگەنامەیـەکی عوسمـانی ئاماژە بەوە دەکات، کـە بـەبیانووی بڵاوبوونـەوەی نەخۆشـی و ڕێگـرتن لەتەشـەنەکردنی نەخۆشـیەکە، بەریتانییـەکان لـە کـۆی (٢٠) مزگـەوت (١٠) مزگـەوتیان لـە هـەولێر داخست[3]. مەرامی ئەو کارەشیان لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە هەوڵیاندەدا لـە ڕێگـەی کەمبوونەوەی ژمارەی مزگەوتەکان بتوانن بە ئاسانی چاودێری جموجوڵ و کۆڕو کۆبوونـەوە ئاینییەکان بکەن، چونکە ئـەو مزگەوتانـە وێسـتگەیەکی گرنگـی بارگـاویکردنی گیـانی بەرەنگاری و ڕەتکردنەوەی داگیرکاری بەریتانی بوون[4]. دەکرێـت بڵـێین بـەردەوام هەسـتی ئاینی هۆکارێکی بزوێنەر بوو، بۆ دژایەتی کردنی ئیدارەی بەریتانی لە شارەکە.

سەرەڕای ئەوەش بە تێپەڕبوونی کات بە هۆی زیادبوون و پەرەسەندنی بارگرژییەکان لـە شارو دەوربەری، فۆرمی دژایەتیکردن و کۆڕو کۆبوونەوەکان تاڕادەیەك بازنـەی بەرتەسـکی نهێنیـان شـکاندو دژایـەتیکردن و بڵاوکردنـەوەی بڵاوکراوەکـان لـە شـاردا هـەنگاوی فرەوانیکەی بەخۆوە بینی و بە ئاشکرا دروشمی هەڵگرتنی چەك و دژایەتی کردنی گـاوران لێرەو لەوێ بەر گوێی دانیشتووان ڕادەدێران[5]. (ئەحمەد پاشـای دزەیـی و پـیرداود ئاغـای

---

(١) - ئەم مزگەوتە کەوتۆتە کۆتایی گەڕەکی تەعجیل، نزیك منارەی چۆلی یە، مێژووی دروسـتکردنی بـۆ ساڵی (١٨٨١) دەگەڕێتەوە، بۆ زانیاری زیـاتر بڕوانـە: عمـر لطیـف بـەرزنجی، گەشـتێك بـەناو مزگـەوت و تەکییەکانی شاری هەولێر، هەولێر، ٢٠٠١، ل ٣٦" زبیر بلال، الشیخ الجولي، ط١، اربیل، ١٩٨٩.

(٢) - مەهدی محەمەد، هەولێر لەسەردەمی داگیر...،ل ١٧٠.

(٣) - بوونی ئەم ژمارە مزگەوتە ڕەنگە زیادەڕۆیی تێدا بێت، بەڵام دەکرێت بـە ڕاسـت وەربگیرێـت، ئەگـەر دەوروبەریشی لەگەڵ دابێت.

(٤) - نامەیەکی جوفرەکراو کە لە (وان)ەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ( نظارة الداخلیة)ی عوسمانی ڕەوانە کراوە. لـە بەرواری ١٣٣٥/٨/٦ ڕۆمی لە: د.خلیل علي، مختارات من کتاب ..، ص ١٧٤ .

(٥) - عبدالرزاق محمد ، م.س، ص ٣٦٢.

دزەیی) ش لەناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر پشتگیریان لە هەولّەکانی ( ڕەشید ئاغـا) و (عەلی پاشای دۆغرەمەچی) دەکرد، ئەو دوانەش لـە دەشـتی هـەولێر خـاوەن پێگەیـەکی کۆمەلاّیـەتی و ئـابووری بـەهێز بـوون[1]. هـەروەها کۆمـەڵێك لاوی شـارەکەش چـەکیان هەڵگرت و دەستیان بە دژایەتی هێزەکـانی بـەریتانی کـرد، ناوچـەکانی دەشـتی قـەراج و کەندێناوەش بە هەمان شێوە کەوتنە جموجووڵ[2].

بەریتانییەکان لەلایەن خۆیانەوە بەمەبەستی ڕاکێشـانی پیـاو مـاقولاّن و کەسـایەتییە دیارەکانی هەولێر بە ئاراستەی خۆیـان، هەوڵیانـدا سـوود لـە (سـەید تـەهای نـەهری)[3] وەربگرن، هەربۆیە لە ڕێگای چـوونی بـۆ بەغـدا، لـە سـاڵی ١٩١٩دا نـاوبراو بـە شـاری هەولێردا تێپەڕی و لەماڵی (مەلافەندی) لەگەڵ ڕیشسپی و پیاوماقوڵ و سەرۆك هۆزەکانی شارەکە کۆبووە، تیایدا داوای لێکردن هەماهەنگی و هاوکاری ئیدارەی بەریتانی بکەن لـە شارەکەدا. لەبەرامبەردا ئامادە بوو کۆمەك و یارمەتی داراییان لە لایـەن بـەریتانیاوە بـۆ دابین بکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو داوایەی (سەید تەها) لەلایەن بەشـێك لـە پیاومـاقولاّنی شارەکە ڕەتکرایەوە[4]. بەلاّم پـیّ دەچـێت تاڕادەیـەك کـاری لـە هەنـدێکیان کردبێـت[5].

---

(١) - مەهدی محەمەد، هەولێر لەسەردەمی داگیر...،ل ١٧٠.

(٢) - ئەم زانیاریەم لە چاوپێکەوتنێکی جەلال خدر وەرگرتووە، کە لەگەڵ حاجی جـەرجیس عـەلی ئـەنجامی داوە، ئەو کات تەمەنی ١٠٧ ساڵ بوو، حاجی جەرجیس لە ساڵی ١٨٩٩ لە گوندی منـارەی بـرایم ئاغـا لـە دایك بووە. ناوی ئەو کەسانەشـی بـردووە کـە لەگەڵیـدا چـەکیان لـە دژی بەریتانییـەکان هـەڵگرتووە، کـە دیاردیکەی‌نیان (مەلا عومەر عەتار، سەید ئەنەسی سەفارچی، سەید کەریم ) بوون.

(٣) - سەید تەها کوڕی شێخ محەمەد سدیقی کوری شـێخ عوبەیـدولاّی نەهریـە، پەیوەنـدی بـەهێزی لەگـەڵ بەریتانییەکان هەبوو لە ساڵی ١٩٢٣ کردیانە قائیمقامی ڕەواندز. میر بصري، اعلام الکرد، ص ٥٥.

(٤) - تەنانەت هەندێ بەڵگەنامەی عوسمانی باس لەوە دەکەن، کە پیاوانی هەولێر نەفرەتیان لە سـەید تـەها کـردووە، بـەو پێیـەی هەماهـەنگی و هاوکـاری دەسـەلاّتی بـەریتانی دەکـات. بڕوانـە دەقـی ئـەو نامەیـە جوفرەکراوەی کە لە (وان)ەوە بۆ وەزارەتی نـاوخۆ( نظـارة الداخلیـة)ی عوسمـانی ڕەوانـە کـراوە. لـە بـەرواری ١٣٣٥/٨/٦ڕۆمی لە: د.خلیل علي، مختارات من کتاب ..، ص ١٧٤.

(٥) - ڕەفیق حلمی، یادداشت ، ب٢، چ٣، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ٩٦.

بەتایبەتی (مەلافەندی) و (ئەحمەد عوسمان) کە پشتیوانکاری سەرەکیی ئیدارەی بەریتانی بوون لە هەولێر.

هەندێك لە ئاغاکانی دزەیی لە دەشتی هەولێر بە تایبەتی لە سەرەتای داگیرکاری بەریتانیدا نەیاری ئەو ئیدارە نوێیە بوون، بەڕادەیەك بێزاری دایگرتبوون، لە ساڵی ١٩١٩ بڕیاریاندا دوای تەواوبونی وەرزی دروێنەو کاری خەرمانەکانیان، سەری خۆیان هەڵبگرن و شانبەشانی (شێخ مەحمود) لەدژی هێزەکانی بەریتانی چەك هەڵبگرن، وەك بەڵگەنامەیەکی عوسمانی ئاماژە بەوە دەکات[١]. ئەوەش بەهۆی ئەو باجە زۆرانە بوو کە لەسەر بەروبوومە کشتوکاڵییەکانیان دانرابوو، هەروەها زێدەڕۆیی کردنی فەرمانبەرانی بەریتانی لە خەمەلاندنی باجەکان، وەك ڕاپۆرتێکی بەریتانی ئاماژە بەوە دەکات[٢]. ئەوە سەرباری پەراوێز خستنیان لە پێدانی پۆستی کارگێڕی لە ناوچەکانییان، لە کاتێکدا لە هەندێك لە ناوچەکانی دیکە بە تایبەتی سەرۆك هۆزەکانی خۆشناو پۆستی بەڕێوەبردنی ناوچەکانی خۆیان پێ سپێردرا بوو[٣].

لە ئەنجامی ئەو هۆکارانە بیرۆکەی ڕەتکردنەوەی ئیدارەی بەریتانیا لە ناوچەکانییان بە شێوەیەك لەلای ئەو ئاغاو دەرەبەگانە گەڵاڵە بوو[٤]، بۆ ئەو مەبەستەش یاداشتێکی ناڕەزاییان بۆ بەردەم یاریدەدەری ئەفسەری سیاسیی بەریتانیی بەرزکردەوە، کە ئیمزای هەریەك لە (ئەحمەد پاشای دزەیی، ئیبراهیم پاشا، پیرداود ئاغا)ی لەسەر بوو[٥]. هەموو ئەو پێشهاتانە ئیدارەی بەریتانی بە جۆرێك توورە کرد. خەریك بوو پێکدادانی توندی لێبکەوێتەوە، بەتایبەتی کاتێك (کاپتن مۆری) ئەفسەری ئیدارەی بەریتانی لە هەولێر لە بەرامبەر ئەو هەڵوێستەی دزەییەکان لە مانگی تەموزی ساڵی ١٩١٩ لەیاداشتێکی

---

(١) - نامەیەکی جوفرەکراو کە لە (وان)ەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ( نظارة الداخلية)ی عوسمانی ڕەوانە کراوە. لە بەرواری ٨/٦/ ١٣٣٥ڕۆمی لە: د.خليل علي، مختارات من كتاب ...، ص ١٧٤ .

(2) - F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray،16 the July,1919, P 2.

(٣) - دبليو. هي، م.س، ج١، ص ١٩٨ .

(4) - F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray،16 the July,1919, P 2.

(٥) - دبيلو. هي، م.س، ج١، ص ١٩٨.

هەرەشە ئامێزدا پێی ڕاگەیاندن دەبێت سەرۆکەکانیان لەبەرامبەر ئەو هەڵوێستانەیان کە نواندوویانە لەبەردەم دادگەی شارەکە ئامادەبن بۆ لێپرسینەوە لەگەڵیاندا، هاوکات دەنگۆی ئەوەش بڵاوببووە، کە ڕەنگە بە چوونیان بۆ هەولێر ئاغاکانی دزەیی ڕووبەڕووی لە سێدارەدان، یاخود دوورخستنەوە ببنەوە[1].

(کاپتن مۆری) لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکانی کە بۆ سەروی خۆی بەرزی کردۆتەوە، ئاماژەیداوە کە: لەم دواییەدا بەمەبەستی هاتنیان بۆ هەولێر ڕۆژێك بۆ ئاغاکانی دزەیی دیاریکرابوو، لەگەڵ ئەوەی شەش کاتژێر لە وادەی دیاریکراو درێژکرایەوە، بەڵام ئەوان ئامادەنەبوون بێنە هەولێر[2]. هەر بۆ ئەو مەبەستەش ( کاپتن های) سەردانێکی بۆ نێو ئاغاکانی دزەیی ئەنجامداو دوای دانوستان و گفتوگۆ لەگەڵیاندا مەرجی ئەوەی خستەڕوو، کە دەبێت لەماوەی شەش مانگدا دووسەد پارچە چەك لەگەڵ (١٥٠٠) ڕوپییە بدەن، سەرباری ئەوە بۆ دەستەبەری جێبەجێکردنی ئەو داوایە (های) مانەوەی یەکێك لە سەرۆکەکانی دزەیی لە هەولێر وەك مەرجێك دانا[3]. ئەوانیش ئەو مەرجەیان پەسەندکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەترس و ئاگاییەوە سەبارەت بەهاتنیان بۆ هەولێر سەودایان کرد، چونکە مەترسیی ئەوەیان هەبوو بە هاتنیان بۆ شارەکە سەریان تێدابچێت [4]. بەڵام دواتر ئەو مەسەلەیە توانرا بە هاوکاری (مەلافەندی) و (ئەحمەد عوسمان) بەرێککەوتن بگات و سەرۆکەکانی دزەیی داواکاری ئیدارەی بەریتانیان جێبەجێکرد[5].

(کاپتن مۆری) لەبارەی ئەو پرسە دەڵێت:

**"هەرکە ئەو کێشەیە دەستی پێکرد، مەسەلەیەك هاتە ئاراوە، کە جێی بایەخ بوو، ئەویش ئەوەبوو سەرۆکی هۆزی دزەیی بکەینە هەڵسوڕێنەری ئەو شوێنانەی کە لێی نیشتەجێن، بەڵام تاوەکو باجەکانیان لێ کۆنەکرابووایەوە ئەوە کارێکی ئەستەم بوو...،**

---

(١) - م.ن، ج١، ص ١٩٩.

(2)- F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray،16 the July,1919, P 2.

(٣) - دبليو. هي، م.س، ج١، ص ١٩٨.

(٤)- F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray, 16 the July,1919,P 2.

(٥) - بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: دبليو. هي، م.س، ج١، ص ٢٠٧.

**هەروەها دەبێت ئەوان زۆر بەچاکی بزانن، کە تا باجەکان نەدەن ناکرێ حکوومەت لێیان خۆشبێت، ئەگەر باجیش کۆنەکرێتەوە، ئەوا ئەنجامەکانی ئەو کارە لە ئەستۆی خۆیان دەبێت"**[1]. لەمەدا دەردەکەوێ کە بەرپرسانی بەریتانی دەیانویست هەڵوێستیان بەرامبەر دزەییەکان بگۆڕن، بەڵام بۆ ئەوەی لە شانوشکۆی دەسەڵاتی بەریتانی کەم نەبێتەوە، دەیانویست وا پیشان بدەن کە ئەوان لەژێر فشاردا ئەو کارەیان نەکردووە.

دوای کۆتایی هاتنی بارگرژییەکانی ئیدارەی بەریتانی لەگەڵ دزەییەکان دا، سەردانێکیان بۆ (ئەحمەد پاشای دزەیی) و (حاجی پیرداود ئاغایی دزەیی) بۆ شاری بەغدا ڕێکخست، لەمبارەیەوە (های) لە ڕاپۆرتێکیدا دەڵێت:

**"سەردانی ئەو دواییەی (ئەحمەد پاشای دزەیی) و (حاجی پیرداود ئاغایی دزەیی) بۆ بەغدا کارێکی یەکجار زۆری تێکردن، ئەوان دەڵێن تەنانەت لەندەنیش ناتوانێت لە بەغدا جوانتربێ و سوێند دەخۆن ڕۆژی جەژنی سەریساڵ پتر لە سەد هەزار سەربازیان لەناو بازاڕی بەغدا بەچاوی خۆیان دیوە، هەموو هەڵوێستیان گۆڕدراوە و هەستی ئامادەیی خۆیان دەردەبڕن بۆ جێبەجێکردنی هەر شتێك حکوومەت ئارەزووی لێبێت، بۆیە شتێکی زۆرباش دەبێت، گەر بێتوو سەردارانی ناوچەکان بهێنرێنە بڕوا، کە بێن سەردانی بەغدا بکەن، ئەوان ئەوانەیان دوای خۆبەدەستەوەدانی سەردارانی دزەیی لە ئەنجامی یاخیبوونەکەی تەموزی ساڵی ١٩١٩ بۆ ڕەخسا"**[2] .

لەبەشێکی دیکەی ڕاپۆتەکە لە بارەی دزەییەکان، (های) ئاماژە بەوە دەکات، کە: ئەوان جاران وەك چەتەو ڕێگر ناوبانگیان دەرکردبوو، بەڵام ئێستا شانازی بەوە دەکەن کە پارێزگاریی ئاسایشی ناوچەکەیان دەکەن و بەدڵ پشتی سیاسەتی حکوومەت دەگرن بۆ قەدەغە کردنی یەکجارەکی هەڵگرتنی چەك لە ناوچەکانییان دا[3].

یەکێك لە دیاردیکەین ڕووداوەکانی دیکە ئەو ماوەیە، ئەو پێکدادانە بوو، کە لە یانەیەکی شەوانە روویدا[4]. بەریتانییەکان بەبێ ڕەچاوکردنی داب و نەریتی کۆمەڵگەی

---

(1) - F.O,371-4192, Note on unrest amongat Dizai kurds in Erbil District ,by Majar S.Murray, 16 the July,1919,P 2.

(2) -F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, PP 236-237.

(3) --Ibid, pp233 -242.

(٤) - یانەکە لە سەربانی چاپخانەیەکی ژێر قەڵات بوو. مولود بیخاڵی، هەولێرم...،ب١، ل ٢٨ .

شاری هەولێر ئەو یانەیان کردبووە[١]، ئەوەبوو لـە ئێـوارەی (٩)ی تـەموزی سـاڵی ١٩١٩ (یونسی کوڕی سەعید ئاغا) کە لە بنەماڵە دیارەکانی شاری هەولێر بـوو لـە یانەکـەدا[٢] لەلایەن چەند کارمەندێکی بەریتانی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ناشرینی لە بەرامبـەردا ئـەنجام درا[٣]. بۆ ئێوارەی دواتر ناوبراو لەگەڵ دەستەیەك لـە هاوڕێکـانی لەوانـە (ئەحمـەد بـەگی کوڕی ساڵح بەگی خـۆران)ی سـەرۆکی یـەکێك لـە تیرەکـانی هـۆزی خۆشـناو. (عەبـدوڵا فەندی)[٤] کە دانیشتووی شاری کۆیە بوو، لە هەمان شوێن لەگەڵ ئەو کارمەندە بەریتانییە تێککگیران و تەقەکردنی لێ کەوتەوە[٥]. لە ئاکامدا (عـەریف مسـیۆن) کـوژرا، (عـەریف کینارد) و دوو پۆلیسی تر[٦]، لەگەڵ (یونس ئاغا) و یـەکێك لـە پیـاوانی بـاوکی برینـدار بوون[٧]. بەڵام (یونس)و (ئەحمەد بەگ) توانییان لە ڕووداوەکە خۆیان دەرباز بکەن[٨].

بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر (یونس ئاغا) بە بریندار دەستگیرکراو (ئەحمەد بەگ)یش بـەرەو ناوچـە شـاخاوییەکان ڕایکـرد. لـەکاتی ڕووداوەکـەش توانرابـوو لـە ڕێگـەی (عـزەدین باشچاوەش)ی سەرۆك عورەفا، (سەعید ئاغـا)ی بـاوکی (یـونس ئاغـا) و ژمارەیـەك لـە هاوکارانی دەستگیربکرێن. ئەو دەستەیە درانـە دادگـەو بڕیـاری پێـنج سـاڵ زینـدانی بـۆ (سەعید ئاغا) و بەند کردنی هەتا هەتایی بۆ (یونس ئاغا)ی کوڕی دەرکـرا. لەبەرئـەوەش

---

(١) - د.کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك...، ب١ ، ل١٨٥.

(٢) - دبليو هي، م.س، ج١، ص ٢٠٠.

(٣) - مولود بیخاڵی، هـەولێرم...،ب١، ل ٢٨" مەهـدی محەمـەد، س.پ، ل ل ١٧٠ — ١٧١" کۆمەڵـەی )عەهد( ئەو کات ئەم هەواڵەی بە بارەگای سەرەکی خۆی لە شام گەیانـدووە. صدى الاحـرار "جريـده"، ١٣ شباط ١٩٥٣. وەرگیراوە لە: د.کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك...،ب١، ل١٨٧.

(٤)- عەبدوڵڵا فەندی خاڵی دلدّاری شاعیر بوو. بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە: فەیسەڵ دەباغ، یاداشـتەکانی یونس ڕەئووف (دلدّار) بە پێنووسی خۆی، هەولێر،"گۆڤار"، ژ (١٠) بەهاری ٢٠٠١، ل ٧٠.

(٥) - مولود بێخاڵی هەولێرم وادیوە...، ل ب١، ٢٨.

(٦) - کـەمال مەزهـەر بـاس لـە برینـداربوونی دووپـۆلیس و دوو جەندرمـە دەکـات. بڕوانە:چـەند لاپەڕەیەك...،ب١، ل١٨٥.

(٧) - دبليو. هي، م.س، ج١، ص ٢٠١.

(٨) - مەهدی محەمەد، هەولێر لەسەردەمی داگیر...، ل ٢٠١.

ئەو دەمانچەی کە (عەریف مسیۆن)ی پێ کوژرا بوو، لە ماڵی(عەبدوڵا فەندی) هاوڕێی (یونس ئاغا) دۆزرایەوە، بۆیە لە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩١٩سزای لە سێدارەدانی بەسەردا سەپێنرا[١]. سەرچاوەیەك ئاماژە بەوە دەكات، كە بەریتانییەكان پێیان وابوو ئەو كارە بە هاندانی عوسمانییەكان ئەنجام دراوە[٢]. ئەو ڕووداوەش دەنگدانەوەی زۆری لەناو دانیشتووانی شارو دەورووبەر و تەنانەت ناوچەكانی تر لێكەوتەوە[٣].

بەرەنگارییەكانی دانیشتووانی هەولێر تەنیا لەچوارچێوەی وەرگرتنی هەڵوێستی نەگەتیڤ نەمایەوە، بەڵكو رووبەڕبوونەوە و پێكدادانی چەكداریش لە دژی هێزەكانی بەریتانی بەشێكی تر بوو لە هەڵوێستیان، ئەوەتا دەستەیەك لە دانیشتووانی شار بەسەركردایەتی (حەسەنە شەل)[٤] بڕیاریاندا زەبرێك لە بەریتانییەكان بوەشێنن[٥]. ئەو دەستەیە پێكهاتبوون لە چەند گەنجێكی هەولێر، كە دیاردیكەینیان بریتی بوون لە: (مەولود تۆفیقە رەش) (١٨٨٥-١٩٢٠)، (كەریم قادر عەتار)( ١٨٨٤- ١٩٢٠)، (مستەفا كلاودروو) (١٨٨١_ ١٩٢٠)، (مەحمود عارەب) (١٨٨٩ -...)، (قەرەنی جامباز) ناسراو بە (قەرۆك) (١٨٨٣ — ١٩٥٢)، (حوسێن عەولای حەتكی زێدبەگی) ناسراو بە (بەعارەب ئاغای كۆزەپانكەیی) (١٨٨٠ — ١٩٤٩)[٦]. ئەگەرچی ئەوانە لەسەرەوە خۆیان واپیشان دەدا، كە دۆستی ئینگلیزن، بەڵام لەژێرەوە دژایەتی هێزەكانی بەریتانیان دەكرد[٧].

---

(١) - دبليو. هي، م.س، ج١، ص ٢٠١.

(٢) - فەیسەڵ دەباغ، یاداشتەكانی یونس رەئووف (دڵدار)...، ل ٧٠.

(٣) - بڕوانە: د.كەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك...، ب١،ل١٨٧.

(٤) - ناوی تەواوی حەسەنی كوڕی سەكرەی كوڕی احمدی كوڕی حەسەن ئاغای كوڕی بابەكر ئاغا سەكرانە، لە ساڵی ١٨٨٣ لە گوندی سەكران لە دایك بووە، لە تیرەیەكی سەر بەهۆزی بڵباسە، لەكاتی ڕۆیشتن دەشەلی، هەر بۆیە پێی دەگوترا حەسەنە شەل. جلال خدر، حەسەنە شەل...، ل١٥.

(٥) - د. عەبدوڵڵا حەداد، ژیاننامە و شیعرەكانی میهری/ محەمەد شەریف موەزین زادەی هەولێری(١٩٠٣ — ١٩٤٢)، هەولێر، ١٩٩٧، ل ٣٤.

(٦) - جلال خدر، حەسەنە شەل...، ل١٥.

(٧) - - د. عەبدوڵڵا حەداد، ژیاننامە و شیعرەكانی میهری...، ل ٣٤.

دیاره (عەلی پاشای دۆغرەمەچی) پلان دانەری ئەو ڕووداوانە بوو، وە لـە ڕێگـەی ئـەو پیاوانـەوە هەولێـدا زەبـر لـە بەریتانییـەکان بووەشـێنێت، ئەگەرچـی لەسـەرەوە خـۆی بەشێوەیەکی دیکە پێشانداوە. بەتایبەتی (های) پەنجە بۆ جموجوولەکانی (عەلی پاشا) درێژ دەکات، کاتێك دەڵێت: (عەلی پاشا) لەسەرەوە بە بزەو زەردەخەنە بوو، بـەڵام لـە ژێـرەوە سەرقاڵی پیلان گێڕان بوو لە دژمان[1]. هەروەها لە بەیتە فۆلکلۆریەکانیش باس لـە ڕۆڵـی (عەلی پاشا) لەم ڕووداوە دەکرێت[2].

سەرچاوەیەك ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو دەستەیە بڕیاریاندا پۆستەی ئینگلیز لە نێـوان موسڵ و هەولێر بکەنە ئامانجی هێرشەکەیان، ئێوارەی (٤)ی نیسانی ١٩٢٠[3]. لە نێـوان هەولێرو کەڵەکی یاسین ئاغا[4]، بەتایبەتی لە نێوان گوندی (ڕەشـکێن و چـالوك) بۆسـەیان دانا. دوای گەیشتنی کاروانی پۆستەکە هێرشیان کردە سەری و دەستیان بەسەر قاسـەکەدا گرت و کاروانەکەیان ئاگر تێبەردا[5] و زۆرینەی سەربازەکانیش کوژران[6]، لـە بەرامبـەردا

---

(١) - دبليو. هي، م.س، ج١، ص٢٠٠.

(٢) - لەم بارەیەوە بەیتی فۆلکلۆر دەڵێت:

چەندم گۆت حەسەن مەچووە هەرایێ

سەری خۆت مەدە لە دەردو بەرایێ

هەرت دەخەرەتێنێ پاشای سەرایێ (مەبەست لە پاشای سەرایێ عەلی پاشای دۆغرەمەچییە)

جلال خدر، حەسەنە شەل...، ل١٥.

(٣) - جەلال خدر، س.پ، ل ٢١ . سـەبارەت بـە دیـاریکردنی بەروارەکـە، بۆچـوونی جیـا بـەدی دەکرێـت، سەرچاوەیەك بە ١٩٢٠ – ١٩٢١ی دادەنێت. عەبدوڵڵا حەداد، ژیاننامە و شـیعرەکانی میهـری ...، ل ٣٤. بەڵام پێ دەچێت لە سەردەمی کاپتن مارشاڵ دابێت، کە لە دوای های بۆ ماوەیـەکی کـەم بووەتـە ئەفسـەری سیاسی هەولێر. چونکە نە های و نـەك کـاپتن لایـن کـە دواتـر بووەتـە ئەفسـەری سیاسـی لـە هـەولێر لـە یاداشتەکانی خۆیاندا ئاماژەیان بەم ڕووداوە نەکردووە.

(٤)-عەبدوڵڵا حەداد، ژیاننامە و شیعرەکانی میهری ...، ل ٣٤.

(٥)- جـەلال خـدر، حەسـەنە شـەل...، ل ٢١" احمـد حـەیران، سـەرجەلەی بـەیتی حەسـەن، کـاروان" گۆڤار"،ژ(١٢٦)، ١٩٩٨، ل١٠١" د.عەبدوڵڵا حەداد، ژیاننامەو شیعرەکانی میهری...،ل٣٤.

(٦)- چاوپێکەتن لەگەڵ سەید مەولود بێخاڵی ٢٠٠٨/٢/٥" سەرچاوەیەکی دیکـە ئامـاژە بـە کـوژرانی ٢٣ سەرباز دەکات. جەلال خدر، حەسەنە شەل...،ل ٢١.

(مستەفا کلاَودروو) بریندداربوو، دواتـر بـەهۆی سـەختی برینەکـەی گیـانی لەدەسـتدا[1].
جێگەی سەرنجە ئەو شەڕو پێکدادانە لەنێو ئەدەبی فۆلکلۆری هەولێرو دەوروبەری بە ڕوونی ڕەنگی داوەتەوە[2].

بەریتانییەکان سەرەداوی ئەو ڕووداوەیان لە ڕێگای یەکێك لـە باوەڕپێکراوەکانیـان پـێ گەیشت، بەهۆیەوە یـەکێك لـە ئەنجامـدەرانی ئـەو کردەیـە، کـە (مـەحمود عـارب) بـوو دەستگیرکرا و دواتر (حەسەنە شەل) و هاوڕێکانی دەستگیرکران. لەلایەن دەستەی دادگـەی سەربازی لە شار، بڕیاری لە سێدارەدان بۆ هەریەك لە (حەسەنە شـەل) و (کـەریم عـەتار) و(مەولود تۆفیقە ڕەش) دەرچوو. ئەفسەری سیاسیی کۆنووسێکی ئامادەکردو لـە ڕێگـەی (عەریف سێجرین) بە مەبەستی پەسەندکردنی ڕەوانـەی ئەنجوومـەنی شـارەوانی هـەولێری کرد. ئەنجوومەنی شارەوانی بەپەلە کۆبوونەوەو واژۆیان لەسەر پەسەندکردنی بڕیارەکە کرد، بەپێی سەرچاوەیەك تەنیا (عەتاوڵا ئاغا) ڕەتیکردەوە واژۆی بکات[3]. بێگومان ئەفسـەری سیاسیی بە پەسەندکردنی بڕیارەکە لە لایەن ئەنجوومـەنی شـارەوانی هەولێـدا ڕەوایـی بـە بڕیاری لە سێدارەدانەکە بدا.

یەکێك لەسەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکات، لە (١٤)ی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ فـەرمانی لە سێدارەدانەکە بەسەر (مەولودو کـەریم و حەسـەن) [4] جێبـەجێکرا. لـە سـێدارەدانەکە

---

(١) - جەلال خدر، حەسەنە شەل...، ل٢٢. بۆچوونی ئەوەش هەیە، کە ئەویش لـە سـێدارە درابێـت، لـەم بارەیەوە بڕوانە:د.عەبدوڵا حەداد، ژیاننامە و شیعرەکانی میهری ...،ل ١٦، بەڵام لە کاتی لە سێدارەدان لـە بەستە و بەیتیە فۆلکلۆرییەکان ناوی (مستەفا کلاَودروو) نایەت.

(٢) - بۆ نمونە لە بەیتێکی فۆلکلۆریدا هاتووە:

چەندم گۆ حەسەن وانییە وامەکە

لە زورگی ڕەشکینی پۆستەی رووت مەکە

حاکمی سیاسی ئیعدامت دەکا

جەلال خدر، حەسەنە شەل...،ل ٢٦.

(٣) - جەلال خدر، حەسەنە شەل...، ل ٢٧ -٢٦.

(٤) - لەم بارەیەوە فۆلکلۆر دەڵێت:

هە دیارە دیارە هەولێرۆك دیارە

لەبەرچاوی خەڵك جێبەجێ کرا و سەرجەم دوکانەکانی قەیسەری و فەرمانگەکانی شار داخران، بەمەبەستی ئامادەبوون لە کاتی لە سێدارەدانەکە[1]. دیارە هەندێك ئەو ڕووداوە بە کردارێکی بەرەنگاری دژ بە دەسەڵاتی بەریتانی لە قەڵەم دەدەن[2]، بەڵام ئەگەری ئەوەش لە ئارادایە، کە تەنیا کردارێکی ڕێگری بوو بێت، سەرەڕای ئەوەش دەبێ بڵێین لەبەرئەوەی ناوبراوان ئەو کردارەیان لە دژی دەسەڵاتی بەریتانی ئەنجامداوە و لە ئاکامیشدا ئەنجامدەرانی لەلایەن بەریتانییەکانەوە لە سێدارە دراون، بۆیە ئەوە خراوەتە بازنەی دژایەتی کردنی بەریتانی و لە سێدارەدانی ناوبراوانیش هەست و سۆزی خەڵکی هەولێری بزواندووە و بووەتە هۆی زیاتر ڕق هەستانیان بەرامبەر بە دەسەڵاتی بەریتانیا لە شارەکە.

---

ئەورۆ سێ ڕۆژە داندرا سێدارە

سێ کەسیان دەبرد لە بۆ قنارە

یەکیان مەولودە لاوی ڕەشتارە

یەکیان کەریمە بابی عەتارە

ئەوی دی حەسەنە بەخۆی موختارە

سەعدولڵا ئیسماعیل شێخانی، فۆلکلۆری کوردی، بەغدا، ١٩٨٥، ل ٨٦.

(١)- جەلال خدر،حەسەنە شەل...، ل ٢٨" چاوپێکەوتنێك لەگەڵ سەید حوسێن مەریوانی ناسراو بە "سەید نەژاد بەرزنجی"، هەولێر، ٢٠٠٧/١٠/٢٢. ناوبراو لە ساڵی ١٩٢٠ لە قەڵاتی هەولێر لە دایك بووە، شارەزاییەکی باشی لە مێژووی هەولێر هەیە، خاوەنی چەند نووسین و وتارێکە سەبارەت مێژووی شاری هەولێر، تائێستەش لە ژیان داماوە و لە گەڕەکی ئازادی شاری هەولێر نیشتەجێیە" حەنا عەبدولئەحەد، م.س، ص١٧.

(٢) - جەلال خدر، حەسەنە شەل...، ل ٢٨" چاوپێکەوتن لەگەڵ سەید نەژاد بەرزنجی.

## تەوەری سێیەم
## هەولێر لە نائارامی ساڵی ١٩٢٠دا

ئەو پەرەسەندن و ڕووبەڕووبوونەوانەی کە لە ساڵی ١٩١٩دا لە دژی بەریتانییەکان سلێمانی و ناوچەی بادینان بەخۆیەوەیان بینی[١]، ڕێگە خۆشکەربوون بۆ ئەوەی بڵێسەی ڕاپەڕین، زۆرینەی ناوچەکانی باشووری کوردستان بگرێتەوە[٢]، لە نێویاندا هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەریشی.

هەربۆیە کاتێ (کاپتن های) لە (١٢)ی ئابی ١٩٢٠ گەشتێکی بەرەو ناوچەکانی ڕەواندز کرد، لە گەرووی گەلی عەلی بەگ لە لایەن هۆزەکانی ناوچەکە هێرشی کرایە سەرو بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە هەولێکی کووشتن دەربازی بوو[٣]. هەر لە چوارچێوەی ئەو بزووتنەوانەدا چەکدارانی هۆزی سورچی[٤]، لە (١)ی ئەیلولی ١٩٢٠دا[٥] شارۆچکەی

(١)- سەبارەت بە بزووتنەوەکانی سلێمانی و ناوچەی بادینان لە دژی بەریتانییەکان بڕوانە: سروە ئەسعد، کوردستان من بداية الحرب...، ص ص١٩١-٢٠٥.

(٢) - د. سەعدی عوسمان هەروتی، ڕاپەڕینەکانی کوردستانی باشوور (١٩١٤ — ١٩٤٥)/ توێژینەوەیەکی هەڵسەنگێنەرانەی هۆکارەکان و ئامانجەکان، زانکۆ( گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سەلاحەدین-هەولێر)، ژ (٢٥)، حوزەیرانی ٢٠٠٥، ل ٦٤٩.

(٣) - ارنولد ويلسن، الثورة العراقيه، ت: جعفر الخياط، ط١،بيروت، ١٩٧١، ص ١١٦" د.كمال مظهر احمد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقيه، ط١، بغداد، ١٩٧٨، ص ١٣٢.

(٤) - سورچی هۆزێکی گەورەیە لەناوچەکانی ئاکرێ و ڕەواندوز و هەریرو رۆژهەڵاتی کوردستان بڵاوبوونەتەوە. عباس العزاوي، عشائر...، ص ١٣٧.

(٥) - سەرچاوەیەکی دیکە ئاماژە بە ٢٨ی ئابی ١٩٢٠ دەکات. احمد حمەدئەمین، رەواندز...، ل٥٠.

(باتاس)یان لە دەست هێزە بەریتانییەکان ڕزگار کرد[1] و لەوێشەوە بەرەو ڕەواندوز کشان[2].

هەر لەم ماوەیەدا (نوری باویل ئاغا)[3]، کەسایەتی دیاری ناوچەی ڕەواندز بوو، کە خۆی بۆ پلەوپایەی هاوەشێوەی (شێخ مەحمود) ئامادە کردبوو، توانی هۆزەکانی ناوچەکە بە تایبەتی خۆشناو و سورچییەکان بە ناوی (جامیعەی ئیسلامی) لە دەوری خۆی کۆبکاتەوەو ناوچەی ڕەواندز و خۆشناوەتی لە دەسەڵاتی بەریتانییەکان دەربێنێت[4]. هەروەها لە ئەیلولی ١٩٢٠ (کاپتن کیرك)ی ئەفسەری سیاسیی لەژێر فشاری ڕاپەڕیوان بە ناچاری کۆیەی بەجێهشێت و هێلی تەلەگرافی نێوان هەولێرو کۆیەش پچڕا[5]. هەموو ئەوانەش مەترسیی ڕاستەخۆیان بۆ سەر ئیدارەی بەریتانی لە هەولێرو تەنانەت گیانی (کاپتن های) دروست کرد. لە کاتی گەڕانەوەی (های) بۆ هەولێریش، خانووەکەی لە لایەن چەند کەسانێکەوە سووتێنرا[6]. لە دەستپێکی تەنینەوەی بارگرژییەکان (های) هەوڵی زۆری دا بەچاوسوورکردنەوەو هەڕەشەکردن سەرهەڵدانی هەرچەشنە بارگرژییەك خەفە بکات، ناوەناوە لەگەڵ ڕیشسپیانی شار کۆدەبووە، لە بەرامبەر ئەنجامدانی هەرچەشنە

---

(١) - كاظم مظفر، ثورة العراق التحرريه عام ١٩٢٠،ج١،النجف، ١٩٧٢، ص ١٩٤.

(٢) - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت پەرەسەندنەکان لە ڕەواندزو دەوروبەری بڕوانە: احمد حمدئەمین، رەواندز...، ل ل ٥٠ — ٥٣.

(٣) - نوری باویل ئاغا، ناوی ئەبوبەکری کوڕی مەلا عەزیزی کوڕی مەلا عەبدوڵلایە، لەکاتی هاتنی بەریتانییەکان بووە فەرمانڕەوای ڕەواندز، بەڵام دواتر پەیوەندی لەگەڵیاندا تێك دەچێت و لەلایەن بەریتانییەکان دەستگیرکراو دوورخرایەوە، بەڵام توانی لە ڕێگادا خۆی دەرباز بکات و بگەڕێتەوە ڕەواندز و دەستی بە دژایەتی کردنی بەریتانییەکان کردو دوژمنێکی سەرسەختی های بوو. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:اي.ام.هاملتون، طريق في كوردستان،ت:جرجيس فتح لله، ط٢، دار ئاراس للطباعةوالنشر،اربيل،١٩٩٩،ص ص ٢١٧-٢٥١" دبيلو.هي،م.س، ج٢، ص ٧٣.

(٤) - دبليو. هی، م.س،ج٢، ص ص١٢١- ١٣٩.

(٥) - عمار يوسف عبدالله الاعگيدی، السياسة البريطانية تجاه عشائر العراق ١٩١٤ -١٩٤٥، اطروحة دكتوراه، كلية التربية/ جامعة الموصل، ٢٠٠٣، ص ٢٩٤.

(٦) - عوسمان عەبدولڕەحمان ، س.پ، ل ١٠٩.

جموجوولێك دژ بە دەسەڵاتەکەی، سزای لە سێدارەدان یاخود دوورخستنەوەی بەرگوێیان ڕادەدا[1]. سەرەڕای ئەوەش شار بە بارودۆخێکی نالەبار تێدەپەڕی، لە دوای سووتاندنی خانووەکەشی بە مەبەستی پارێزگاری کردن لە خۆی لە بەرامبەر ئەگەری هەر چەشنە ڕووداوێکی دیکە، (های) ماڵەکەی خۆی بۆ سەربازگەی هێزەکانی بەریتانی لە شارەکە گواستەوە و لەویٚ مایەوە[2]، چونکە هەر لە نێو شاری هەولێر بۆ دووەمین جار هەولّی کوشتنی (های) درا و کاتێك لە خەودابوو خانووەکەی درایە بەر ڕێژنەی گوللە. بەڵام ناوبراو هیچ زیانێکی بەرنەکەوت، بۆیە ڕێوشوێنەکانی توندتر کرد و ئەو سەربازگەیەی کە دواتر لێی دەمایەوە زۆر بە چاکی تەلبەند کرد و پاسەوانی بۆ دانا، بە مەبەستی دەستەبەرکردنی سەلامەتی گیانی خۆی[3].

پەراوێز خستنی سەرۆك هۆزەکان و پیاوە دیارەکان لە پێدانی پۆست و پلەو پایە و ناچۆنییەك ڕەفتارکردن لەگەڵیاندا، هەروەها زۆرینەی ئەو فەرمانبەرانەی کە باجیان کۆدەکردەوە کورد نەبوون و زیادەڕۆیان تێدا دەکرد، ئەوانە لەگەڵ چەند هۆکارێکی دیکە[4] هۆزەکانی تووشی نارەزاییەکی زۆرکردبوو[5]. جگە لەمانە (های) باس لە دەنگۆی ڕاپەڕینەکەی تەلەعفەر[6] دەکات، کە لەناو دانیشتووانی هەولێر بڵاوببووە و کاریگەریشی

---

(١) - دبيلو. هي، م.س، ج١، ص ص ١٠٥ — ١٠٦.

(٢) - عوسمان عەبدولڕەحمان ، س. پ، ل ١٠٩.

(٣)- کاپتن لاین، س.پ، ل ٧١ .

(٤) - سەبارەت بەم هۆکارانە بڕوانە: د.كمال مظهر احمد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، مطبعة الحوادث، بغداد،١٩٧٨، ص ص ٧٧- ٩٦.

(٥) - د.سەعدی عوسمان، ڕاپەڕینەکانی کوردستانی باشوور...، ل ٦٥١.

(٦) - لە٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٠ لە تەلەعفەر ڕاپەڕینێك لەدژی دەسەڵاتی بەریتانی بەرپابوو، کە بە هۆیەوە ئەفسەری سیاسی بەریتانی (کاپتن پارلۆ) و فەرماندەی سەربازی (کاپتن ستیورات) کوژران و شارەکە دەستی بەسەردا گیرا، بەڵام زۆری نەبرد بەریتانیەکان لە٩ی حوزەیران دەسەڵاتیان بۆ تەلەعفەر گەڕاندەوە. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: **محمد** يونس السيدعبدالله السيدوهب(عبدالوهاب)، اهمية تلعفر في ثورة العراق الكبرى عام ١٩٢٠،ط١، مطبعة الجمهورية- الموصل، ١٩٦٧.

لەسەر ئالۆزکردنی ڕەوشەکە هەبوو[(١)]. تەنانەت (های) باس لە بڵاوبوونەوەی بەیاننامەی (شەریفی مەککە) لە هەولێر دەکات، کە گوایا کاریان لەسەر گیانی دژایەتی کردنی بەریتانییەکان هەبوو[(٢)].

سەرەڕای ئەوەش بڵاوبوونەوەی بەیاننامەکانی (کۆمەڵەی عەهد)[(٣)] لە شاری هەولێر، کە بیری سەربەخۆخوازی و نیشتمانییان تێکەڵ بە یەکتر کردبوو، بەجۆرێك کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر جۆشدانی دانیشتووانی هەولێر لە دژی بەریتانییەکان[(٤)]. لە بەیاننامەکانی کۆمەڵەی ناوبراو داوا لە دانیشتووانی هەولێر دەکرا بەریتانییەکان وەدەربنێن[(٥)]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێداگیری لەسەر ئەوە دەکرێت، کە هیچ هاودەنگی و هاوکارییەك لە نێوان ڕاپەڕیوانی کوردو عەرەب لەم ساڵە نەبووە و ئەو ڕاپەڕینانەی باشووری کوردستان بەشێك نەبوون لە شۆڕشی بیستی عێراق[(٦)].

بیری ئاینیش، کە خەڵێکی زۆر لە ژێر کاریگەری بیری هاتنەوەی دەسەڵاتی عوسمانی و دەرکردنی بەریتانیا دابوون لە شارەکە، پاڵنەرێکی دیکە بوو. ئەو گروپانەی کە لە هەولێر پێکهاتبوون، بەردەوام پەیوەندییان بە تورکە ناسیۆنالیستەکان دەکردو دۆستایەتی و مەیلیان بۆ جامیعەی ئیسلامی دووپات دەکردەوە و داگیرکاری بەریتانییان

(١) - بڕوانە: دبليو. هي، م.س. ج١،ص ص ٧٣-٧٤" قحطان احمد عبوش التلعفري، ثورة تلعفر ١٩٢٠، بغداد، ١٩٦٩، ص ١٤٤.

(٢) - دبليو. هي، م.س. ج٢، ص٧٤ .

(٣) - کۆمەڵەی عەهد لە سەردەستی کۆمەڵێك روناکبیری عەرەب لە شام دامەزرا، دوای ئەوەی هەستیان بەوە کرد کە وڵاتانی هاوپەیمان رازی نابن، دەوڵەتێکی سەربەخۆی عەرەبی دابمەزرێت، کۆمەڵەکە بۆ دووبەش لەتبوو، کۆمەڵەی عەهدی عێراق و کۆمەڵەی عەهدی سوری ، کۆمەڵەی عەهدی عێراقی لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩١٨ دامەزرا. د. عبدالفتاح علي البوتاني، الحياة الحزبية في الموصل ١٩٢٦ — ١٩٥٨، اربيل، ٢٠٠٣، ص ٨٤.

(٤) - د.کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك...،ب١، ل ١٨٧.

(٥) - د.عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەك... ل ٧٥.

(٦) - د.سەعدی عوسمان، ڕاپەڕینەکانی کوردستانی باشوور...، ل ٦٥١.

ڕەتدەکردەوە[١]. عوسمانییەکانیش بە نهێنی پیاوانی خۆیان بۆ هەولێر ڕەوانە دەکرد، بە مەبەستی هاندانیان بۆ دژایەتی کردنی بەریتانییەکان، وەك لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دەردەکەوێت[٢]، ئەوانە دیاردیکەین هۆکاری ئەو بارگرژیانە بوون کە لە هەولێر لەو ماوەیەدا هاتە ئاراوە.

دوای ئاڵۆزبوونی ڕۆژ لە دوای ڕۆژی ڕەوشی شارەکە، (های) داوای لە (خورشید ئاغا)[٣]ی هاوپەیمانی سەرەکیی کرد، کە لە ناوچەکانی مەخموور نیشتەجێ بوو، بۆ ئەوەی پاسەوانی تایبەتی بۆ بنێرێت بە مەبەستی پارێزگاری کردن لە گیانی، (خورشید ئاغا)ش کوڕەکەی لەگەڵ دەستەیەك لە پیاوانی خۆی لە مانگی ئابی ١٩٢٠بۆ هەولێر ڕەوان کرد[٤]. ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە، کە (های) بە تەواوی تووشی پەشۆکان ببوو، بە جۆرێك متمانەی نەبوو، لە ڕێگەی سەربازەکانی بتوانێ دەستەبەری پاراستنی گیانی خۆی بکات، بۆیە بە ناچاری پەنای بۆ (خورشید ئاغا) برد. لەم بارەیەوە خودی (های) دەڵێت:

**"ئەو سێ ڕۆژەی لە ٢٩-٣١ ئابی ١٩٢٠، کە بەسەرمدا تێپەڕی، لە دڵەڕاوکێیەکی زۆر گەورەدا دەژیام، هەموو شتەکان لە هەولێر هێمن بوون، لەگەڵ ئەوەشدا (حاجی ڕەشید ئاغا) و سەرکردە نەیارەکانی هۆزی دزەیی و (جەمیل ئاغای گەردی) لە بەستنی کۆبوونەوە و پیلانگێڕییەکانیان بەردەوام بوون، بۆیە وەك ڕێگرییەك لە ڕوودانی هەر کودەتایەکی چاوەڕوان کراو، تکام لە (خورشید ئاغا) کرد، بۆ ئەوەی هەندێك لە دەست و پێوەند و پیاوانی خۆیم بۆ ڕەوانە بکات، تاوەکو بە فریام بکەون"[٥].**

---

(١) - د.عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەك...، ل ل ٦٩ -٧٠.

(٢) - نامەیەکی جوفرەکراو کە لە (وان) وە بۆ وەزارەتی ناوخۆ( نظارة الداخلیة)ی عوسمانی ڕەوانە کراوە. لە بەرواری ١٣٣٥/٨/٦ڕۆمی لە: د.خلیل علي، مختارات من کتاب ...، ص ١٧٤ .

(٣)- خورشید ئاغا سەرۆکی لقێکی هۆزی دزەیی بوو لەناوچەکانی مەخمور و قەرەچوغ و کەندێناوە، هاوکارێکی زۆر باشی دەسەڵاتی بەریتانی بوو، لە بەرامبەر ئەو خزمەتانەی کە پێشکەشی کردبوو، بەریتانییەکان لە ساڵی ١٩٢٠ ئۆتۆمبێلکی جۆری (فۆرد)یان پێشکەش کرد. دبیلو. هي، م.س، ج٢،ص ١٧٠.

(٤)- م.ن، ج٢، ص ص١٠٦-١٠٧.

(٥)- م.ن،ج٢، ص ١٢٣.

ئەوە لەکاتێکدا پێشتر (جەمیل ئاغای گەردی) یارمەتی پێشکەش بە ئیدارەی بەریتانی لە هەولێر کرد بوو، لە بەرامبەردا لە لایەن بەریتانییەکانەوە خەڵات کرابوو و پلەی سەرۆکی گەردییانی پێدرابوو[1]. ئەوەش ئەوە بە دیار دەخات، کە ناوبراو هەڵوێستی خۆی لە هەمبەر بەریتانییەکان گۆڕیوەو دەستی بە دژایەتی کردنیان کردووە.

سەرچاوەیەك ئاماژە بەوە دەکات، لەو ماوەیەدا (سەید عەبدوڵای نەقیب) بۆ دژایەتی کردنی دەسەڵاتی بەریتانی لایەنگرانی لە گوندی (قەتەوی)، کە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای هەولێر کۆکردەوەو لایەنگرانی (ئەحمەد پاشای دزەیی)ش پەیوەندییان پێوەکردن. (ڕەشید ئاغا)ش لە گوندی (بنبێرز)ی باشووری ڕۆژئاوای هەولێر، کە دەکەوێتە سەر ڕێگەی گوێڕ لەگەڵ لایەنگرانی دەستی بە جموجووڵ کردبوو[2].

لە بەرامبەردا کریستیانەکانی عەنکاوە بەشێکیان پشتیوانی و پشتگیرییەکی زۆریان لە (های)کرد، بۆ ئەو مەبەستەش لە لایەن (های) پڕچەك دەکران و دەستەیەك لەوانە پاسەوانییەتییان دەکرد[3]. لێرەدا دەکرێ بڵێین هاوئاینی فاکتەرێکی گرنگ بوو بۆ نزیکبوونەوەی کریستیانەکان لە (های)، هەروەها ڕەنگە مەترسیی ئەوەیان لەلا دروست بووبێت، کە ئەگەر هاتوو دەست بەسەر شارەکەدا بگیرێت و دەسەڵاتی بەریتانیای تیادا دەربپەڕێندرێت، ڕەنگە دووچاری کوشتن ببنەوە، ئەوەش بە هۆی ئەو هەماهەنگی و هاوکارییەی کە پێشکێشی ئیدارەی بەریتانییان دەکرد، هەربۆیە مانەوەی دەسەڵاتی بەریتانی خواستی کریستیانەکان بوو.

لەو لاشەوە (های) بەردەوام لە ڕێگەی تەلیگرافەوە لە پەیوەندیکردن دابوو لەگەڵ موسڵ و کەرکووك، ئەوەش بۆ ئەوەی بەها نایەوەی بێن، بۆیە داوای ڕەوانەکردنی هێزی سەربازی لێ دەکردن، تەنانەت هەڵوێستەکەی بە جۆرێك شلۆق بوو، بیریشی لە هەڵاتن دەکردەوە[4]. بۆیە هەڵاتنی لەهەر ئان و ساتێکدا شتێکی چاوەڕوانکراوبوو، فەرمانبەران و دەست و پەیوەندەکانیشی سەرقاڵی تێکنانی کەلوپەلەکانیان بوون، بە مەبەستی چۆڵکردنی

---

(1)-F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, P 237.

(٢) - بوتان جلال، م.س،ص ٥٨.

(٣)- دبليو. هي، م.س ،ج٢، ص ١٢٣.

(٤)- م.ن، ج١، ص ص ١٢٨ – ١٢٩.

شار[1]. ئەگەر کۆمەڵێك پاسەوانی لەگەڵدا نەبوایە، بۆ ئەوەی پارێزگاری لێ بکەن، بە هیچ شێوەیەك (های) نەیدەوێرا لە شوێنی خۆی بێتە دەرەوە[2].

دوای ئەوەی ڕەوشەکە بارگرژی زیادیکەی بەخۆوە بینی، لە (٢)ی ئەیلولی ١٩٢٠دا لە پێشهاتێکی تازەدا، لەسەر داوای ( های) ئەوجارە (خورشید ئاغا) خۆی و (٨٠) لە پیاوانی ڕژانە نێو شاری هەولێر. لە ئەنجامی ئەوەشدا دەسەڵاتی ئەفسەری سیاسیی بەریتانی بەرەو کەنارگیری چوو، تەنانەت (های) خۆشی نایشارێتەوە و دەڵێت:

**"لەگەڵ گەیشتنی (خورشید ئاغا)، ئەو فەرمانڕەوای ڕاستەقینەی شارەکە بوو"**[3].

لەگەڵ ئەوەی (خورشید ئاغا) بە تەواوی کاروباری شاری گرتبووە ئەستۆ، بەڵام مانەوەی (های) لە شارەکەو هەبوونی هێزێکی بچووکی سەربازی بە سەرکردایەتی (چارڵس لیتڵدیل)، بە هەر شێوەیەك بێت، توانیبووی پارێزگاری لە ڕووکاری دەرەوەی دەسەڵاتی بەریتانی بکات[4]. ئەو بەشەی دزەییەکان بە ڕادەیەك خۆیان بۆ لایەنگری بەریتانییەکان یەکلایی کردبووە، بەپێی دۆکیۆمێنتێکی بەریتانی ئامادەیی خۆیان دەربڕیووە، کە شەڕی سورچییەکان بکەن[5].

ئێوارەی (٤)ی ئەیلولی ١٩٢٠ (لۆنگریك)ی ئەفسەری سیاسیی لە کەرکووك، لەگەڵ (مولازم بیکنوور)ی ئەفسەری سەربازی لە کەرکووکەوە بە کەژاوەیەك ئۆتۆمبێلەوە، هاتنە هەولێرو ئەو پارەو پولەی لە خەزێنەی هەولێر بوو، کە سەرچاوەی دڵەڕاوکێی (های) بوو بۆ کەرکووکیان گواستەوە[6]. دیارە ناوبراو هیچ ئاسۆیەکی موژدە بەخشی بەدی نەدەکرد و بە جۆرێك بێ ئومێدی دای گرتبوو، هیچ کاتێك بە تەمای گیانی خۆی نەبوو، قسەکانی خۆشی ئەوە دووپات دەکەنەوە، کاتێك دەڵێت: **"با بخۆین و بخۆینەوەو ڕابوێرین مادامەکی بەیانی ئەورین"**. لەم هەلومەرجەدا یەك بە یەك فەرمانبەرانی بەریتانی شارەکەیان چۆڵ

---

(١)- د.کمال مظهر، دور الکردفي ....، ص ١٣٣.

(٢)- ل. ن. کوتلوف، م.س، ص٢٠٢.

(٣)- سنتان في کردستان، ج٢، ص١٣٧.

(٤)- ارنلود ویلسن، الثورة... ، ص ١١٩.

(5) -F.O,371/5068,Political, Eastren Turky. File 11,1920, Exract From the Diary of the Political Officer,Arbil, for the month of January 1920, PP 236-237.

(٦)- دبلیو. هي، م.س، ج٢، ص١٣٨.

دەکرد، تەنیا (٢) فەرمانبەر لە ئیداری شارەکە مابوون، یەکێکیان بە ناوی (مستەر دلی جاند) ئەویندداری خەزێنە، ئەوەی دیکەیان (مستەر بلوج)ی بەرپرسی پۆستەو گەیاندن بوو، لەگەڵ هێزێکی کەمی سەربازی، کە بریتی بوون لە (٥٠) سەرباز و (٢٠) چەکدار و (٣٥) پۆلیس و لە ژێر فەرمانده‌یی (مستر رۆبێنــز) بوون[١]. هەموو ئەوە لەکاتێکدا دەکرا، کە (های) لە سەرووی خۆیەوە ئاگادارو سەرپشك کرابوو لە هەر ئانووساتێکدا شارەکە بەجێ بهێڵێت[٢].

هەولێر لەم ماوەیەدا لە پیاوەکانی (خورشید ئاغا) جمەی دەهات، تەنانەت ناوبراو دواتر بانگی ڕادا بۆ تەواوی دۆست و لایەنگرانی لەناویاندا هۆزی تەی عەرەبی[٣]، بۆ ئەوەی بێنە ناوشار، بۆیە ژمارەی ئەو هێزانەی گەیشتنە هەولێر لە زیادبووندا بوون، تا خۆی لە (٣٠٠٠) چەکدار دەدا[٤]. بێگومان زۆری ژمارەی ئەو چەکدارانە ڕەنگدانەوەیەکی خراپی لەسەر دانیشتووانی شار دروستکردبوو، لەبەرئەوەی هاتنی ئەو ژمارە بارگرانی بۆ دانیشتووانی شارەکە دروستکردبوو، چونکە لە لایەك دابینکردنی پێداویستی بۆیان لەسەر حیسابی خەڵکەکە بوو و لە لایەکی دیکەش ئاساییە بەشێك لەو چەکدارە خێڵەکییانە ڕەوشی ژیانی خەڵکییان لەبەرچاو نەگرتبێت، ئەوەش بێگومان کێشەی بۆ دانیشتووانی شار دروست دەکرد.

لە ماوەی ئەو نا ئارامییەی شاردا، بەهۆی لاوازی ئیدارەی بەریتانی (حوسێنی مەلا)[٥] کە لەگەڵ هێزەکەی (خورشید ئاغا) هاتبووە هەولێر، خۆی وەك فەرماندەی

---

(١) - م.ن، ج٢، ص ص ١٣٨ -١٣٩.

(٢) - د. عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەك ...، ل ٦٩.

(٣) - هۆزی تەی هۆزێکی عەرەبی بوو بەشـێکیان لـە پـێ دەشـتەکانی شـەمامك و کەنـدێناوە و ناوچـەی قەرەچوغی سەر بە هەولێر بڵاوبوونەوە، پەیوەندییەکی بە هێزیان لەگەڵ دزەییەکان هەبوو، لە ڕێی ژنخـوازی، ئەوکات شێخ حەنەش دیاردیکەیەن شێخی ئەو هۆزە بوو، زیاتر بە کاری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری خەریك بـوون. دبلیو. هي، م.س، ج٢، ص ص،١١٧-١١٩.

(٤) - م.ن، ج٢، ص ١٤٢.

Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P207.

(٥) - حوسێنی مەلا کوڕی بایزئاغای دزەییە، لە ساڵی ١٨٧٠ لە دەشتی هەولێر لە دایك بـووە، کەسـێکی نەخوێندەواربوو، ناوبراو لە خولی شەشەم و نۆیەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، نوێنەری لیوای هەولێر بوو،

پۆلیسی شارەکە سەپاند بوو[1]. بە هاوکاری چەکدارەکانی پاراستنی ئاسایش و تەناهی شاری پێ سپێردرابوو، ئەویش بە دەسەڵات و زەبرو زەنگی توانیبووی کۆنترۆلی شار بکات[2]، بۆیە ئەو سەردەمە لەناو زۆرێك لە تەمەندارەکانی شار بە ماوەی فەرمانڕەوایەتی (حوسێنی مەلا) دەناسرێت[3].

لە لایەکی دیکەدا بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ورەی داتەپیوی (های) و دەست و پێوەندو لایەنگرەکانی، (ئارنۆلد ولسن)ی فەرمانڕەوای گشتیی بەریتانیا لە عێراق، بڕیاری دا سەردانی شاری هەولێر بکات[4]. ( های) بەم شێوەیە گوزارشت لەم پێشهاتە دەکات:

**"بروسکەیەکم لە بەغداوە پێگەیشت، کە فەرمانڕەوای پاشایەتی گشتیی: (ئارنۆلد ولسن) لە رۆژی (٨)ی ئەیلولی ١٩٢٠دا بە (٣) فڕۆکەوە سەردانی هەولێر دەکات، ئەوەش منی لەهەمبەر دەستەبەرکردنی سەلامەتی گیانی خەجاڵەتبارتر کرد، لەگەڵ ئەوەی ئەو هەواڵەم لە شاردا بڵاوکردەوە...، بەڵام لەو ولاشەوە وەها وەڵامی بروسکەکەم دایەوە، کە: بارودۆخی شار خراپە و دەشێ لە هەر ئان و ساتێکدا شار بەجێ بێڵم، لە بەر ئەوە ئەگەر هاتوو لە کاتی هاتنیان ئاڵا لە سەرا هەڵنەدرابوو، ئەوە مانای وایە شارەکەم بەجێ هێشتووە و نیشتنەوەیان مەترسیی تێدا هەیە"[5].**

بەڵام سەرەڕای ئەوەش ڕێوشوێنی ئامادەکاریی بۆ هاتنی (ولسن)کرا، لە ئانوساتی ئامادەکارییەکاندا دەنگۆی ئەوە بڵاوبووە، کە ئاڵاکەی سەر سەرا داگیراوە، ئەوەش لە راستیدا وەك پڕوپاگەندە وابوو بۆ ترساندن و نانەوەی پشێوی زیاتر لە سەروبەندی هاتنی

---

لەساڵی ١٩٥٧ مردووە. احمد حەمەد ئەمین، ئەندامە کوردەکانی...، ل ٤١" مەهدی محەمەد، پێشهاتە سیاسییەکان...،ل ل ٢٤٥ -١٤٦.

(١) - دبليو. هي، م.ن، ج٢، ص ١٤٢.

(2) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P210.

(٣)- مولود بێخاڵی، هەولێرم...، ب١، ل ٢٧ " بوتان جلال، م.س، ص ٥٨.

(٤)- لوسيان رامبو، الكرد والحق، ت:عزيز عبدالاحد نباتي، اربيل، ١٩٩٨، ص ٧٩" د. كمال مظهر، دور شعب...، ص١٣٣.

(٥) - دبليو. هي، م.س، ج٢، ص ص١٤٥ — ١٤٦.

(ولْسن)دا. کاتژێر ٧:٤٥ی بەیانی (٨)ی ئەیلولی ١٩٢٠ فەرمانڕەوای گشتیی بەریتانیا لە عێراق، لەژێر چاودێرییەکی پاسەوانی توندا گەیشتە شار، هەریەك لە (خورشید ئاغا)و (ئەحمەد عوسمان) ڕۆڵی گرنگیان لە گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست هەبوو[1]، هەروەها تەواوی ئەو هێزە بەریتانییەی کە مابووە، لە شوێنە گرنگەکانی شار بڵاوببوونەوە[2]، بەم شێوەیە لەگەڵ گەیشتنی (ولْسن) بۆ شار، لە لایەن دەستەیەك لە گەورە پیاوانی شار بە تایبەتی لایەنگرانی دەسەڵاتی بەریتانی پێشوازی لێکرا[3].

دوای پشوودانێکی کەم، (ولْسن) لەگەڵ گەورە پیاوانی شار کۆبووە، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت، زیاتر ئەو کەسانە ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون، کە لایەنگری دەسەڵاتی بەریتانی بوون. دەکرێت بڵێین: (های) بەڕادەیەك بە تەنگ پەیدانەبوونی مەترسیی لەسەر ژیانی (ولْسن) بوو، ئارەزووی نەبوو هیچ نەیارێکی دەسەڵاتەکەی لە کۆبوونەوەکەدا ئامادە بێت. هەروەها هەوڵیدا کەسایەتییە نەیارەکان کەنارگیرو پەراوێز بکات. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا لە سەروبەندی سازکردنی کۆبوونەوەکەدا، (ئەحمەد پاشای دزەیی)و بەشێك لە هاوکارانی بە مەبەستی ئامادەبوونیان لە دیدارەکەی (ولْسن)دا خۆیان گەیاندە هەولێر، ئەو کارەش (های) تووشی سەرسامی کرد، لەبەر ئەوەی ناوبراو تا ئەوکات نەیاری بەریتانیا بوو. بەڵام دواتر بۆی دەرکەوت، کە (مەلا فەندی) توانیویەتی بۆ لای خۆیانی ڕاکێش بکات، بەو پاساوەی کە دەبێت هەموو بەیەك ڕیز بووەستین لە بەرامبەر هەڕەشەو مەترسییەکانی ئەو هۆزانەی کە دەیانەوێت بەسەر هەولێردا بدەن و ئارامییەکەی تێك بدەن. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا (های) بە وریاییەوە ساتوسەودایکردنی لەگەڵ ئەو پێشهاتە دەکرد. دیارە بەرپرسانی بەریتانی لە شارەکە ئەو ڕۆژە ئەوەندە پەشۆکابوون، تەنانەت مێگەلە مەڕێکیان لە دەرەوە بینی بوو، کە بەرەو شار دەهات، بەوە هاتبووە پێشچاویان، کە ژمارەیەکی زۆری چەکداری هۆزەکانن و هێرش دەکەنە سەر شاری هەولێر، هەربۆیە

---

(١) - م.ن، ج٢، ص ص ١٤٨ -١٤٩.

(٢) - ارنلود ويلسن، الثورة...، ص ١١٩.

(٣) - چاوپێکەوتن لەگەڵ د. ئەرسن موسا رشید.

دەستیان بە ئامادەباشی کرد بوو، بۆ بەرپەرچدانەوەی، بەڵام دوای نزیك بوونەوە بۆیان دەرکەوتبوو، ئەوە مێگلە مەڕە، نەك ئاپۆڕای چەکدارانی هۆزەکان[1].

(وڵسن) سەبارەت بەو سەردانەی بۆ هەولێر وا گوزارشت لە هەڵوێستی خۆی دەکات: **"کاتێك کە چوومە ناو فڕۆکە، کۆپیەکی پەرتووکی (نامەکانی بیکۆن)م لە گیرفاندا بوو کاتێك سەیری کتێبەکەم کرد، لە یەکێك لە لاپەڕەکانیدا ئەو ڕستەیەم خوێندەوە: ( ئازایەتی باش نییە لە ڕاوێژدا، بەڵام باشە لە جێبەجێ کردندا: لەبەر ئەوەی لە ڕاوێژدا باشدیکەیەن شت کە مرۆڤ ببینێت مەترسییەکانە، لە هەمان کاتیشدا ئەو مەترسییانە لە کاتی جێبەجێ کردندا لە بەرچاو نەگرێت کە ئەگەر مەترسییەکان زۆر گەورەش نەبن.) لە ڕاستیدا ئەوەی لە هەولێر هەبوو ساتی جێبەجێکردن بوو نەك ساتی ڕاوێژکردن، ئەوە بوو لە سەرا چاوم بە چەندین شاندی یەك لە دوای یەکی سەرۆکە کوردەکان کەوت، متمانەم بۆیان پیشاندا، لە ڕاستیدا من لەوە دوورتر بووم، کە هەست بەو متمانەیە بکەم"**[2].

(وڵسن) لەو کۆبوونەوەیەدا لەگەڵ گەورە پیاوانی هەولێر، وتارێکی دوورو درێژی پێشکەشکردو تیایدا باسی لەو سەرکەوتنە گەورەیە کرد، کە لە ناوچەکانی فوراتی ناوەڕاست بە دەستهاتووە، هەروەها ئاماژەشی بە هێور بوونەوەی ڕەوشی شاری سلێمانی دا[3]، لەهەمان کاتدا سوپاس و ستایشی خۆشی پێشکەش بەو سەرۆك هۆزانە کرد، کە هەماهەنگی و هاوکارییان دەکەن[4].

لە بەرامبەردا لایەنگرانی بەریتانیا، بە تایبەتی (ئەحمەد عوسمان) و (خورشید ئاغا) تەواوی پاڵپشتی و هەماهەنگی خۆیان بۆ ئیدارەی بەریتانی دووپاتکردەوە، ئەوەش لە پێناو دەستەبەرکردنی سەقامگیری و تەناهی شارەکە و بەرگریکردن لێی، لە هەر هێرشێکی چاوەڕوانکراوی هۆزەکان. بەڵام دوو داوایان خستە بەردەم (وڵسن)، یەکەمیان: ڕێگە نەدرێت جارێکی دیکە تورك بگەڕێتەوە شارەکە و نابێت عەرەب فەرمانڕەوایەتیمان

---

(١) - دبليو. هي، م.ن، ج٢، ص ١٥٠ .

(٢) - ارنولد ويلسن، الثورة... ، ص ١١٩.

(٣) - د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك... ،ب١، ل١٦٨.

(٤) - ارنولد ويلسن، الثورة... ، ص ١١٩.

بکات. دووەمیان: هێزێکی سەربازی بۆ شارەکە ڕەوانە بکرێت[1]. ئینجا سوپاس و ستایشی خۆشیان بۆ بەریتانییەکان دووپاتکردەوە[2].

لە بەرامبەر ئەو داوایانە، (وڵسن) لە دەفتەرێکی تایبەتی خۆی، بەیاننامەیەکی (لوید جۆرج)ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانی دەرهێناو دایە دەست (ئەحمەد عوسمان)، کە تیایدا هاتبوو:

**"لوید جۆرج لە میانەی وەڵامی پرسیارێکی (مستەر لمبرت) لە ئەنجوومەنی گشتیی دەڵێت: کێشەی ئێمە لە عێراق کاتییە، باوەڕمان بەوە هەیە، کە بەسەریدا زاڵ دەبین، حکوومەتی خاوەن شکۆ وا نابینێت دەستبەرداری ئینتیدابی بەریتانی بێت لە عێراق دا".**

دیارە (وڵسن) نەیتوانی هیچ شتێکی دیکەی زیاتر سەبارەت بە ئایندە بڵێت، بەڵام بەڵێنی پێدان ئەو هێزەی کە داوای دەکەن دەگاتە شار، بەبێ ئەوەی شێوەو وادەی هاتنەکە دیاری بکات[3].

دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەکە لەوێدا (وڵسن) بە جیا لەگەڵ (ئەحمەد عوسمان)و (خورشید ئاغا) کۆبووە[4]، زۆر بە کراوەتر پرسەکانی سەقامگیری و چاوەڕوانکردنی گەیشتنی هێزی بەریتانی بۆ شارەکەو ئایندەی ویلایەتی موسڵی لەگەڵیاندا تاوتوێکرد. (ئەحمەد عوسمان)و (خورشید ئاغا) زۆر بە ڕاشکاوانە بە (وڵسن)یان گوت: **"ئەگەر تورکەکان بگەڕێنەوە بۆ شارەکە دەمانکوژن و ئابڕووی ئافرەتەکانمان ئەتك دەکەن و سەرو ماڵ و سامانمان بە تالان دەبەن"**، هەر بۆیە داوای دەستەبەری و دڵنیاییان لە (وڵسن) کرد، بەوەی جارێکی دیکە تورك بۆ شارەکە نەگەڕێتەوە. لەلایەن خۆیەوە (وڵسن) سەرلەنوێ دەفتەرەکەی گیرفانی دەرهێنا، لێدوانێکی (لوید جۆرج)ی کە لە (٥)ی کانوونی دووەمی ١٩١٨ نووسرابوو، خستەڕوو، کە تیایدا هاتبوو:

---

(١) - م.ن، ص ١٢٠. های دەڵێت مەلافەندیش لەگەڵیاندا داوای ڕەوانەکردنی هێزی سەربازی زیادیکەی کردووە. سنتان في كردستان، ج٢، ص ١٤٩

(٢) - دبليوي. هي، م.س، ج٢، ص ١٤٩.

(٣) - ارنولد ويلسن، الثورة...، ص ١٢٠.

(٤) - دبليو. هي، م.س، ج٢، ص ١٤٩.

**"ئێمە سەرکێشی لەسەر تورکیا ناکەین لە چوارچێوەی ئەو ناوچانەی کە تورکی تیادا دەژین، کە پایتەختەکەیان ئەستانبۆلە...، هەروەها پێمان وایە نیمچە دوورگەی عەرەبی، ئەرمینیا، عێراق، سوریاو فەلەستین هەریەك لەمانە مافی ئەوەیان هەیە کیانێکی نەتەوەییان هەبێت، بەڵام شێوەو چۆنییەتی دانپیانانیان پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا مومکین نییە سەروەری پێشووتر [مەبەست سەروەری عوسمانی بوو] جارێکی دیکە بۆ ئەو ناوچانە بگەڕێتەوە"**(١).

لەو سەروبەندەدا (حوسێنی مەلا) بە مەبەستی ڕازیکردن و دانووستان سەردانی ناوچەی خۆشناوەتی کردبوو، کە گەڕایەوە شاری هەولێر نامەیەکی (قادر بەگ)(٢)ی گەیاندە (های) کە تیایدا ئاماژەی دابوو:

**"ئەگەر هاتوو حکوومەت لە سەرجەم ئەو کارانەی کە ئەنجامی داوە لێی ببوورێت و هیچ سزایەکی نەدا، ئەوا خۆی و دەستوپێوەند و پیاوەکانی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی حکوومەت دەبن".**

(های) ئەو پێشنیازەی بە دەرفەت زانی، لە ڕێگای (ئەحمەد عوسمان)ەوە لە کاتی سواربوونی فڕۆکەکەیدا خستیە بەردەم (وڵسن)، ئەویش ڕەزامەندی خۆی لەسەر پێشنیازەکە پێشاندا و لە کاتژێر (٢)ی دوای نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ، دەستبەجێ شارەکەی بەجێهێشت(٣).

---

(١) - ارنولد ویلسن، الثورة...، ص ١٢١.

(٢) - قادر بەگ کوڕی مستەفا بەگی کوڕی حەمەد بەگی سەرۆکی تیرەیەکی هۆزی خۆشناوە لە ساڵی ١٨٦٥ لەدایکبووە، توانیویەتی هەرسێ بەرەی خۆشناو میر مەحمەلی، میر یوسفی و پشتگەلی بخاتە چوارچێوەی دەسەڵاتەکەی، لە دەستپێکدا نەیاری بەریتانیەکان بوو، بەڵام لە ژێر کاریگەری مەلا فەندی ئاراستەی گۆڕاوە و کرایە فەرمانڕوای شەقڵاوە، بۆ ماوەیەك پەیوەندی لەگەڵ شێخ مەحمود بەهێز بوو، لەگەڵ هاتنەوەی تورکەکان بۆ ڕەواندز پەیوەندی پێیان کرد و یارمەتی داون، ناوبراو لە خولەکانی چوارەم تا حەوتەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق نوێنەری لیوای هەولێر بوو. لە ساڵی ١٩٣٩ مردووە. کەمال خورشید میران، خۆشناو و خۆشناوەتی (مێژوو، جوگرافیا، یاداشت)، ئامادەکردن و پێشکەشکردنی سالار کەمال میران، بەغداد، ١٩٨٥، ل ٨٣" احمد حەمەد ئەمین، ئەندامە کوردەکان...، ل٧٥ " دبلیو. هي، م.س،ج١، ص ١٨٥.

(٣) - دبلیو. هي، م.س،ج١، ص ١٥٠.

(ولّسن) ئەو نائارامیەی هەولێری بە تەواوی بۆ دەرکەوت، کە لە ئەنجامی فشاری هۆزەکان و هەڕەشەکردنیان بۆ گرتنی هەولێرو وەدەرنانی دەسەڵاتی بەریتانی لە ئارادابوو[1]. دەتوانین بڵێین هاتنی (ولّسن) بۆ هەولێر، وەك پاڵپشتیەکی واتایی و دەروونی بوو، بۆ دەسەڵاتدارێتی بەریتانیاو لایەنگرانی لە هەولێر، هەروەها پێداگیریەکیش بوو لەسەر ئەوەی ئەستەمە دەستبەرداری شارەکە بن. لە هەمان کاتیشدا هەڕەشەیەك بوو بۆ لایەنی نەیاری دەسەڵاتی بەریتانی، سەرەڕای ئەوەش زۆر نەمانەوەی (ولّسن) لە شارەکە سەرلەبەری ترسناکی و مەترسیی ڕەوشەکە دووپاتدەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ( ولّسن) توانی لە ڕاکێشانی سۆزی هەندێك لە سەرۆك هۆزەکانی دزەیی و پیاوماقوڵانی شار تا ڕادەیەك سەرکەوتوو بێت[2].

لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین ئەو هەڕەشانەی کە (ولّسن) لە میانەی دیداریدا لەگەڵ پیاوماقوڵان و دانیشتووانی هەولێر، نەبووە هۆی ساردکردنەوەی گوڕوتینی ئەو هەولانەی، کە بە ئاراستەی وەدەرنانی دەسەڵاتی بەریتانی لەناو هەولێرو دەرووبەری خرابوونە گەڕ، ئەوەتا لەدوای ڕۆیشتنی (ولّسن) بە ماوەیەکی کەم پلانێك بە مەبەستی وەدەرنانی دەسەڵاتی بەریتانی و دانانی دەسەڵاتێکی خۆجێیی لە شارەکە لەلایەن ئیدارەی بەریتانی و دەست و پێوەندەکانی ئاشکراکران، ئەو پلانە کە لە سەروبەندی جێبەجێکردن دابوو، بەڵام هەر زوو توانیان ڕەوشەکە بە گوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان ئاراستە بکەن[3].

لە لایەکی دیکە، ئەو هێزانەی لەژێر سەرکردایەتی (قادر بەگ) و (ساڵح بەگی خۆران)[4] و (عارەب ئاغای گەردی)[1] و (مستەفا ئاغا کۆڕێ)[2]و (میرانی خدر بەگ)[3]

---

(١) - ارنولد ویلسن، الثورة...، ص ١٢٢.

(٢) - د. عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەك ...،ل ٦٩.

(3) - A.L.Haldane, The Insurection Mesopotamia, Edinburgh, 1922, p 159.

(٤)- ساڵح بەگ سەرۆکی لقی میر یوسفی هۆزی خۆشناو بوو، کە یەکێك بوو لەو سێ لقەی هۆزی خۆشناوی پێکدەهێنا، بنکەی سەرەکی لە گوندی خۆران بوو، کە دەکەوێتە بناری چیای سەفین، نزیکەی ٤٠ کیلۆمەتر لە ناوەندی هەولێرەوە دوورە. ناوبراو لە ساڵی ١٩٢٠دا بزووتنەوەیەکی لەدژی هێزەکانی بەریتانیا بەرپاکرد و توانی لە ناوچەکانی دەریان بپەڕێنێت، بەڵام دواتر لەلایەن بەریتانیەکانەوە بەتوندیکەیەن شێوە بەرپەرچ درایەوە. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی بزووتنەوە و ڕاپەڕینەکەی ساڵح بەگی خۆران بڕوانە: هاشم خۆرانی، انتفاضة صالح بك خوشناوفي ثورة العشرين الوطنیه التحرریه في قریة خوران علی سفح جبال سفین، مجلة گولان العربي،ع (٤٥)، ٢٩/شباط ٢٠٠٠، ص ص ٣٤ –٣٦.

دابوون، لەو سەروبەندەدا گەیشتبوونە (گوندی مەلا ئۆمەر)[٤]. لەگەڵ ئەوەی ئەوانە گفتوگۆیان لەگەڵ (حوسێنی مەلا) ئەنجامدابوو، بەڵام ئەو هەنگاوە نەبووە هۆی سارکردنەوەیان و بەرەو هەولێر لە پێشڕەوەی دابوون و مکوڕبوون لەسەر ئەوەی ئیدارەی بەریتانی لە شارەکە دەربپەڕێنن و دەست بەسەر شارەکەدا بگرن[٥]. ئەوە سەرباری هێزی سورچییەکان و (نوری باویل ئاغا) بە ناوی هێزی موحەممەدییە لە گوندی (دێرێ)ی ناوچەی (بەستۆڕە)، کە نێزیکەی (٢٠) کیلۆمەتر لە شار دووربوون. نزیك بوونەوەی ئەو هێزانە بە ڕادەیەك بوو، شپرزەیی لە هێزەکانی (خورشید ئاغا) دروستکرد، بەڵام توانرا بەر بەم پێشهاتە بگیرێت[٦].

ڕاپەڕیوان گەیشتنە دەوروبەری شار، بەڵام هەر زوو (مەلا فەندی) پێشی لێگرتن، بەمەبەستی رازیکردنیان و وازهێنان لەو هەوڵانەی کە بەمەبەستی رزگارکردنی شارەکە خستبوویانە گەڕ، لەگەڵیاندا کەوتە گفتوگۆکردن[٧]. (ئەحمەد عوسمان)یش خۆی گەیاندە کۆبوونەوەکە. پیاو ماقووڵانی خۆشناو لە سەرەتا هێرشی توونديان کردە سەر (ئەحمەد عوسمان) و لە بەرامبەر ئەو یارمەتی و هەماهەنگییەی کە پێشکێشی بەریتانییەکانی کردووە، بە یارمەتیدانی کافران و خیانەتکار تۆمەتباریان کرد[٨]. بەڵام دوای دانووستان و گفتوگۆکان، (مەلا فەندی) توانی ڕازیان بکات دەست بەسەر شارەکە دا نەگرن، هەروەها

---

(١) -ئاغای گوندی ئەشکەو سەقا بوو کە دەکەوێتە نزیك دێگەلە لە نێوان هەولێرو کۆیە.

(٢) - مستەفا ئاغا، ئاغای کۆڕێ بوو پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ شێخ مەحمود هەبوو، تەنانەن شێخ مەحمود لە ساڵی ١٩١٩دا بە نوێنەرایەتی خۆی لە کۆڕێ دەست نیشانی کرد. دواتر لە تەوەرەی دووەم لە بەشی چوارەمی ئەم توێژینەوە باسی لێوەدەکەین.

(٣) - میرانی خدر بەگ سەرۆکی بەرەی میروسوویانی خۆشناو بوو. کەمال میران، س.پ، ل ٥٣ .

(٤) - گوندی مەلا ئۆمەر دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی هەولێرو لەو ماوەیەدا نزیکەی ١٥ کیلۆمەتر لە شاری هەولێر دوور بوو. دبلیو. هي، م.س،ج٢ ، ص ١٥١.

(٥) - کەمال میران، س.پ، ل ٨٥.

(٦) - دبليو. هي، م.س،ج٢ ، ص ١٥١.

(7) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P207 .

(٨) - دبليو. هي، م.س،ج٢ ، ص ١٥٢ .

زەمینەسازیشی بۆ دیداری ئەوان لەگەڵ (های) ڕێکخست[1]. توانیشی ڕازیان بکات لەشکریان لە باداوە پاشەکشە بکەن و لە گوندی بنەسلاوە نیشتەجێ بن، کە نێزیکەی نۆ کیلۆمەترو نیوو لە شاری هەولێر دوورە[2].

لە لایەکی دیکە ئەو شەوەی هێزەکە لە باداوەی قەراغی هەولێر بوون، (های) لە دڵەخورپەیەکی زۆر دابوو، تەنانەت کەلوپەلەکانی تێکنابوو، تاوەکو لە هەر ئانوساتێکدا شار بەجێبهێڵێت، چونکە تەواو ترسی داگرتبوو، کە دەشێ دەست بەسەر شارەکە دابگیرێت[3]. بەڵام بە هەوڵەکانی (مەلافەندی) و (ئەحمەد عوسمان)، توانرا هەوڵەکانی ئەو هۆزانە سڕ بکرێت و ئارامی و دڵنیایی بۆ دڵی (های) بگەڕێتەوە.

بۆ ڕۆژی دواتر لە دوای نیوەڕۆ ئەو سەرۆك هۆزانە لەگەڵ (های) لە سەرای هەولێر کۆبوونەوە، لەم بارەیەوە (های) دەڵێت:

**"دەمەو عەسر لە نێو قەرەباڵغییەکی زۆردا، قادر بەگ هاتە ژوور، دواتر خورشید ئاغای دزەیی، دوای ئەوانیش هەر یەك لە ساڵح بەگ و ڕەشید بەگ و مستەفا ئاغا و عارەب گەردی هاتنە ژوور، ئەوەش شتێکی سەیرو سەمەرە بوو، چونکە بە درێژایی دوو ساڵ من بە دوای دەستگیرکردن و پەلکێشکردنیان بووم، کەچی ئێستا ئەوان هاتوون و کارەکە بە پێچەوانە بووەتەوەو ئەوان ئێستا مەرجیان داناوە...، قادر بەگ بە ناوی ئەوانەوە قسەی دەکرد، جارجارەش ساڵح بەگ تێبینی لەسەر قسەکان دەدا"[4].**

ڕاپەڕیوان ئامادەیی خۆیان پێشاندا ئەو کەلوپەل و چەکانە بگەڕێننەوە، کە لە میانەی وەدەرنانی بەریتانییەکان لە ناوچەکانییان دەستیان بەسەر داگرتبوو. لە بەرامبەردا داوایان کرد، ئەوەی کە پێشتر ڕوویداوە چاوپۆشی لێبکرێت و ئەو پلەو پایەیان بۆ بگەڕێتەوە، کە پێشتر لە ناوچەکانییان هەیانبوو، هەروەها بەر لەهەر ئاڵۆزییەك پێویستە بە شێوەیەکی ڕاستگۆیانە سەودایان لەگەڵدا بکرێت. لەلایەن خۆیەوە (های) بەخۆشحاڵییەوە ڕەزامەندی

---

(١) - کەمال میران، س.پ، ل ٨٥.

(٢) - دبليو. هي، م.س،ج٢ ، ص ١٥٤ .

(٣) - م.ن، ج٢، ص ١٥٢.

(٤) - م.ن، ج٢، ص ١٥٣ .

لەسەر پێشنیازەکان دەربڕی [(١)]. هەروەها ڕاپەڕیوانی سورچیش دوای ئەو پێشهاتە ساردبوونەوەو بە هەمان شێوە بۆ ناوچەکانی خۆیان گەڕانەوە، هەر چەندە ئەوەی لە سەرەتادا مکوڕبوون، کە بچنە ناو شارەکە، بەڵام بە جۆرێك لە جۆرەکان توانرا ئەوانیش هێور بکرێنەوە[(٢)]. (مێجەر مارشاڵ) ئاماژە بەوە دەکات، کە بە هۆی ڕاپەڕینی هۆزەکان ڕێگەی ڕەواندز داخرا، بەمەش داهاتی گومرگ کەم بوونەوەی بەرچاوی بەخۆ بینی، تەنانەت بەو هۆیەوە، ئیدارەی بەریتانی لە هەولێر (٦٠) هەزار ڕوپییە زیانی بەرکەوت[(٣)]. هەروەها ئەو هۆزانە لەکاتی ڕاپەڕینەکەیاندا کاتێك ئیدارەی بەریتانیان لە شەقڵاوە وەدەرنا، سەرجەم تۆمارەکانی ساڵی ١٩٢٠ی تایبەت بە کۆکردنەوەی باج و داهاتیان لەناوبرد، هەربۆیە لەم چوارچێوەیەدا لەگەڵ ئیدارەی بەریتانی لە هەولێر لە بارەی وەرگرتنی باج لێیان، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە پشت بە هەڵسانگاندن و تۆماری ساڵی پێشوو ببەسدیکەیت[(٤)]. لێرەشدا دەردەکەوێت ئەو سەرۆك هۆزانە زیاتر بە تەنگ پلەوپایەی خۆیان بوون، نەك ئامانجە نەتەوەییەکان. بێگومان ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زەمینە دەرەبەگایەتی و هۆزایەتیەی، کە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی ئەو قۆناغە لەسەری بنیادنرابوو.

سەبارەت بە ڕەوشی ڕووداوەکانی دواتر، دەتوانین بڵێین هێورکردنەوەی هۆزەکان لە ڕێگەی ئەو گفتوگۆیانەو گەیشتنی هەواڵی هاتنی هێزی بەریتانی لە کەرکووکەوە بۆ شاری هەولێر، بە ڕادەیەکی بەرچاو ئاراستەی ئەو ڕووداوانەی گۆڕی و کۆتایی بەو ڕەوشەهێنا، کە ماوەیەك بوو هەولێر بە هۆی گەمارۆدرانی لەلایەن ئەو هۆزانەوە بەخۆیەوەی دەبینی. لە لایەکی دیکە هەندێك لەو هۆزانەی کە تا ئەو کات نەیاری دەسەڵاتی بەریتانی بوون، بە ئاراستەی ئەو دەسەڵاتە هەڵیان کرد[(٥)]. ئەو پێشهاتانەش بە تەواوی وای لە هۆزەکانی خۆشناو و گەردی و سورچی کرد، دەست لە گەمارۆدانی هەولێر هەڵبگرن و بە ئاراستەی

---

(١) - م.ن، ج٢، ص ١٥٤.

(٢) - بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: م.ن، ج٢، ص ص١٥٤ — ١٥٥.

(3)- Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P214 .

(4) - Ibid,P 213.

(5) - A.L.Haldane, op.cit, p247 .

ناوچەکانییان پاشەکەشە بکەن[1]، ئیتر لە (١٣)ی ئەیلول ١٩٢٠دا کۆتایی بە گەمارۆدانەکە هێنرا. ئەوەبوو سریەکی پیادەی بەریتانی لە کەرکووك، هەروەها لە موسڵیش سریەکی سوارەی هیندی و دوو فەسیلی پیادەی هیندی گەیشتنە هەولێر[2]. بە گەیشتنی ئەو هێزانە، چەکدارەکانی دزەیی لە شارەکە پاشەکشەیان کرد[3].

لە ئەنجامی ئەوەدا بەرە بەرە هەوری نائارامی لە هەولێر ڕەوییەوە، لەم نێوەندەشدا گەورە پیاوانی کۆیە، بە مەبەستی سەرلەنوێ گەڕانەوەی ئیدارەی بەریتانی بۆ دەڤەرەکەیان نیاز پاکی خۆیان پێشاندا، ئەوە بوو دەستەیەك لە پیاوماقوڵان لەم ماوەیەدا گەیشتنە شاری هەولێر، بە ڕێنمونی (مەلا فەندی) لەگەڵ (های) کۆبوونەوە، تیایدا ئامادەیی خۆیان بۆ پێشوازیکردن لە گەڕانەوەی ئیدارەی بەریتانی بۆ شارەکەیان دووپاتکردەوە، بەمەش جارێکی تر ئیداری بەریتانی بۆ کۆیە گەڕایەوە و پۆستە ئیدارییەکانیش بەسەر گەورە پیاوانی دەڤەرەکە دابەش کران[4].

سەبارەت بە ناوچەی خۆشناوەتیش (قادر بەگ) کرایە فەرمانڕەوای دەڤەرەکە[5]، بەڵام (ساڵح بەگ) نەچووە ژێر باری ئیدارەی بەریتانی و بزووتنەوەیەکی لە ناوچەی خۆران بەرپا کرد، بەوهۆیەوە فڕۆکە جەنگییەکانی بەریتانی گوندەکەیان بە سەختی بۆردوومان کرد. دواتر دوای پێکدادانی توند بە چاوساغی و هاوکاری چەکدارەکانی (قادر بەگ) بەریتانییەکان دەسەڵاتییان بۆ خۆران گەڕاندەوەو لەو پێکدادانەشدا چەند کەسێکی گوندەکە کوژران[6].

---

(١) - د. عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەك ...،ل ٦٩.

(٢) - دبلیو. هي، م.س،ج٢ ، ص ص١٥٧ -١٥٨ .

(3) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P214 .

(٤) - بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: دبیلو. هي،م.ن،ج٢، ص ١٦٩" طاهر حەوێزی، س.پ. ب١، ل١٤٥" جەمال فەتحولا، س.پ، ل ٧٨ .

(٥) - دبلیو. هی،م.س، ج٢، ص١٦٩ — ١٧٠.

(٦) - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت، بزووتنەوەکەی ساڵح بەگی خۆران بڕوانە: هاشم خوراني، م.س، ص ١٦٨.

دیارە ناوچەکانی هەریر و باتاس و ڕەواندز تا ئەوکات لە نائارامیی و پشێوویی دابوون، وەك لە ڕۆژنامەیەکی ئەو سەردەمە دەردەکەوێت[1]. سەبارەت بە ناوچەکانی (هەریرو باتاس)یش بەریتانییەکان بە زەبری هێز دەسەڵاتییان بۆ دەڤەرەکە گەڕاندەوە[2]. هەروەها گوندی (ماوەران)[3]، کە بنکەیەکی گرنگی خوێندنی ئاینی بوو لە ناوچەکە، سووتاندیان[4]. بەڵام ئەوەی تایبەت بێت بە ڕەواندز، ئەوا ڕەوشێکی تایبەتی خۆی هەبوو، لەبەرئەوەی بەریتانییەکان نەیانتوانی کۆنترۆڵی بکەن، بۆیە ئیدارەیەکی تایبەتی لەوێ دامەزرا[5].

دیارە ڕەوشی ناو شاری هەولێریش ئاسایی بوونەوەی تەواوی بە خۆی بینی و فەرمانبەرانی ئیدارەی شار گەڕانەوە سەر کارەکانیان. لە ڕاگەیەنراوێکی فەرمی هێزەکانی بەریتانیا لە عێراق، کە لە بەرواری (٢٧)ی ئەیلولی ١٩٢٠ بڵاوبووە، هێوربوونەوەی ڕەوشی هەولێری دووپاتکردەوە[6]. چەند ڕۆژێك پێشدیکەش بە وردی لە (٥)ی ئەیلول بە هۆی بروسکەیەك، (های) ئاگەدارکرایەوە، کە لە ئیدارەکردنی شارەکە بەخشراوەو لە شوێنی ئەودا (مێجەر مارشاڵ) دانراوە، (مارشاڵ) لە (٢)ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠ گەیشتە هەولێر، ئەو هاتنەی بۆ وەرگرتنی ئەرکەکانی بوو لە شارەکە[7]. لادانی (های) پێناچێ بە هۆی کەمتەر خەم کردنی بێت، چونکە لە ئەرکەکەیدا سەرکەوت، بەڵام دیارە لەبەر ئەوە بوو، کە دەسەڵاتدارانی بەریتانی دەیانویست دوای ئەو ڕووداوانە سیاسەتێکی نوێ پەیڕەو بکەن، بۆیە کەسایەتی نوێیان دانا.

---

(١) - العراق "جريدة"، ع (١٠١)، ٢٨ ايلول ١٩٢٠.

(٢) - دبليو. هي، م.س، ج٢، ص ١٧٠.

(٣) - ماوەران بنکەیەکی گرنگی ئاینی بوو، لە لایەن بنەماڵەی حەیدەرییەکان سەرپەرشتی دەکرا. لەم بارەیەوە بڕوانە: د.عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة في كردستان،ط٢، اربيل،٢٠٠٨، ص ص ١٥٦ -١٥٩.

(٤) - دبليو. هي، م.س، ج٢، ص ١٧٠.

(٥) - بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئیدارەی ڕەواندز بڕوانە: احمد حەمەد ئەمین، ڕەواندز...، ل ٥٨.

(٦) - العراق (جريدة )،ع (١٠١)، ٢٨ ايلول ١٩٢٠.

(٧) - دبليو. هي، م.س،ج٢ ، ص ١٧٠.

بەر لەوەی (های) هەولێر بەجێبهێڵێت، لە (١٧)ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠، (نەقیب لیتلدیل) بە هەماهەنگی لەگەڵ ڕەتلێکی سەربازی موسڵ، (ڕەشید ئاغا)یان لە گوندی تەرجان[١] دەستگیرکردو بردیانە سەربازگەی بەریتانی لە شارەکە، لەوێش دواتر دەستبەجێ ڕەوانەی موسڵیان کرد[٢]. دیارە پێشتر بەریتانییەکان بە هۆی شلۆقی هەڵوێستیان نەیانتوانیوە ئەو کارە بکەن و ئەو نەیارە، کە سەرچاوەی ئاشووب بوو بۆیان، دەستگیربکەن. بەڵام لەگەڵ هاتنی هێزی زیاتر، بۆیان دەرکەوتووە، کە ئەوەیان بۆ دەکرێت، دیارە لەبەر ئەوەش ڕەوانەی موسڵیان کردووە، تا لایەنگرانی نەتوانن ئازادی بکەن.

لە لایەکی دیکە، بە مەبەستی پێشاندانی شان و شکۆی دەسەڵاتیان، ئیدارەی بەریتانی لە مانگی تشرینی دووەم و کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠دا نمایشێکی سەربازییان لە هەولێر ئەنجامدا،لە پاشان ئەو هێزە سەربازیە چوونە باتاس و شەقڵاوە و وکۆیە و تەق تەق و پردێ و دواتر گەڕانەوە هەولێر[٣].

سەبارەت بەو ڕاپەڕین و بزاڤە چەکدارییانەی کە لەوماوەیەدا لە ئارادابوون، تێبینی دەکرێت، ئەوانە نەیانتوانیووە بگەنە ئاستی شۆڕشێکی کوردی سەرتاسەری، بەڵکو خۆیان زیاتر لە ڕاپەڕینی چەکداری پچڕپچڕ نواندووە، ئەوەش لەگەڵ نەبوونی سەرکردەیەکی یەکگرتووی هۆشیارو بەرنامەیەکی تۆکمە، ئەوەش ئەرکی دەسەڵاتی بەریتانی ئاسانتر کرد بۆ لە نێوبردنیان، هەروەك یەکێ لە مێژوونووسان ئاماژە بەوە دەکات[٤]. هەروەها ئەو ڕاپەڕینانە زیاتر پەرچەکرداری پێوە دیاربووە و زۆرێك لەو داواکاریانەی کە هەڵیان گرتبوو، داواکاری بەرتەسك و کورت بینانە بوون، کە دواجار لە بازنەی دەستخستنی پلەو پایە و باج و پیتاك خۆی بینییەوە.

بێگومان دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین، کە ئەوانەی دژایەتی دەسەڵاتی بەریتانییان دەکرد، زۆرینەیان پاشخانێکی عوسمانییان هەبوو، بەجۆرێك لە جۆرەکان لە سەردەمی

---

(١) - تەرجان گوندێکە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای هەولێر لە دەشتی شەمامك.

(٢) - دبلیو. هي، م.س،ج٢ ، ص ١٧١. بۆ زانیاری سەبارەت بە چۆنیەتی بردنی ڕەشید ئاغا بۆ موسڵ بڕوانە: مولود بێخاڵی، هەولێرم...، ب٢، ل١٣٠.

(3) - Iraq Administration Reports 1914-1932, Vol 5,1920, Administration Report Of The Arbil ..., P215 .

(٤) -سەعدی عوسمان، ڕاپەڕینەکانی کوردستانی باشوور...، ل ٦٥٠.

عوسمانییەکان خودان پلەوپایەبوون و لەژێر کاریگەری هاتنەوەی دەسەڵاتی عوسمانی و دەرکردنی بەریتانیا بوون لە شارەکە[1]. کە دیارترنیان ( سەید عەبدوڵا پاشای نەقیب، عەلی پاشای دۆغرەمەچی، ئەحمەد پاشا و رەشید ئاغا) بوون، کە دیارە ئەوەی کۆتایی نەبێت، ئەوانیتر هەرسێکیان لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە پلەی پاشایەتیان پێ درابوو.

(١) - د. عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەك ...،ل ل ٦٩ -٧٠ .

## تەوەری یەکەم

## هەڵوێستی هەولێر سەبارەت دانانی مەلیك فەیسەڵ

دوای کۆتایی هاتنی یەکەمین جەنگی جیهـانی، لـە ئـەنجامی دانوسـتان و مشـتومڕی نێوان هاوپەیمانان لە کۆنگرەی ئاشتی پاریس لە سـاڵی ١٩١٩، (سیسـتەمی ئینتیـداب - ماندات)[١] بە باشدیکەی‌ن شێواز دانرا، بۆ ئەوەی لـەو ناوچـانەی کـە دەسـتیان بەسـەردا گرتبوو، پیادەی بکەن[٢]. لەم چوارچێوەیەدا لە (٣)ی ئایاری ساڵی ١٩٢٠ بـە شـێوەیەکی فەرمی سیستەمی ئینتدابی بەریتانی بەسەر عێراقـدا سـەپێنرا[٣]. جێگـەی سـەرنجە ئـەو سیستەمە ڕێگەی لە پێکهێنانی حکوومەتێك لە ناوچە کوردییەکان نەگرتبوو[٤].

یەکێك لە دەرهاویشتەکانی شۆڕشی ساڵی بیست[٥] لە عێراقدا، ئەوەبوو کـە (پێرسـی کۆکس)ی نوێنەری باڵای بەریتانی لە عێراق (عەبدولڕەحمان ئەلنـەقیب)[١]ی، ڕاسـپارد بـۆ

---

(١) - بیرۆکەی ئینتیداب (Manda) لە لایەن ژەنەراڵ جان سمنتس (Samnts)ی سەرۆك وەزیرانی باشووری ئەفەریقیا خرایەڕوو، بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان و بەرژەوەندی وڵاتانی هاوپەیمانان ، توێژەرانیش لە بارەی پێناسەی ئینتیداب بۆچوونی جیاوازیان هەیە، لەم بارەیەوە بڕوانە: رجاء حسين الخطـاب، العـراق بـين ١٩٢١-١٩٢٨/ دراسة في تطور العلاقات العراقية البريطانية واثرها في تطورالعراق السياسي مـع دراسـة الـراي العـام العراق، ط٢، بغداد، ١٩٧٧، ص ١٩. سەبارەت بەو سیستەمە لە مادە(٢٢)ی گەلاڵەنامـەی کۆمەڵـەی گـەلان هاتووە: ئەو گەلانەی کە ناتوانن بەتەنیا کاروباری خۆیان بەڕێوەببەن، خۆشگوزەرانی و پێشکەوتنیان بەپیرۆزیـەوە دەسپێردرێتە جیهانی پێشکەوتوو. مجيد خدوري، نظام الحكم في العراق، ط١، بغداد، ١٩٤٦، ص ٢.

(٢) - خليل مصطفى عثمان الاتروشي، كوردستان الجنوبية(العراق) في سنوات الاحتلال و الانتداب البريطانيين ١٩١٨ – ١٩٣٢، رسالة ماجستير، كلية الاداب/جامعة دهوك، ٢٠٠٥، ص ٥٣.

(3)-Feors Antonuis, the Arab Awaking, the story of the Arab National Movment , (London – 1945), P 306.

(4) - F.O.(371,5069), Office of the civil commissioner, Baghdad, 8the, October 1920.

(٥) - لە بارەی شۆڕشی بیست وهۆکار و دەرئەنجامەکانی بڕوانە: ل.ن. کوتلوف، م.س.

ئەوەی حکوومەتێکی کاتی لەژێر سەروەری بەریتانیا لـە (٢٥) تشـرینی یەکـەمی ١٩٢٠ پێك بهێنێت[٢]. لەگەڵ دامەزراندنی ئەو حکوومەتە وەك ڕاپۆرتە کارگێڕییەکانی بـەریتانی بە دیاری دەخەن، هەولێر بە توونـدی ڕەتیکـردەوە وەك بەشـێك لـە کـەرکووك بمێنتـەوە و لەچوارچێوەی لیوای کەرکووکدا ساتوسەوداییکردنی لەگەڵدا بکرێت[٣].

دواتر لەبەیاننامەیەکدا حکوومەتی بەریتانی هەڵوێستی خۆی سەبارەت بە ناوچە کوردییەکان ڕوونکردەوە" سەبارەت بە هەولێر ئاماژەیدا، کە نوێنەری باڵای بەریتانی بڕیاریدا ئەفسەرانی بەریتانی بەڕێوەبردنی هەولێر و کۆیە و ڕەواندز لە ئەستۆ بگرن، هەروەها لە دانانی فەرمانبەرانی حکوومەت ڕەچاوی دانیشتووانی ناوچەکان بکرێت[٤]. لە لایەن خۆیەوە هەولێر پێشوازی لەم بەیاننامەیە کرد[٥]. زیاد لەمەش لەسەرەتادا بەپێی دۆکیۆمێنتێکی بەریتانی هەولێر سەرپشك کرابوو لەوەی کە لەگەڵ دەوڵەتی باشووری کوردستان دەبێت، یاخود دەچێتە پاڵ دەوڵەتی عێراق[٦]. هەر لەم چوارچێوەیەدا بەپێی دۆکیۆمێنتێکی بەریتانی، (٦٢) سەرۆك هۆزی باشووری کوردستانی کە بەشێکیان کەسایەتی و سەرۆك هۆزەکانی هەولێر بوون، لە مانگی حوزیرانی ساڵی ١٩٢٠دا یاداشتێکیان ئاراستەی لایەنی بەریتانی کردووەـ تیایدا داوایان کردووە لە باشووری

---

(١) - ناوی عەبدولڕەحمان کوڕی عەلی کوڕی سەلمان نەوەی شـێخ عەبـدولقادر گەیلانییـە، لـە ٧ی تـەمموزی ١٨٤٥ لە شاری بەغدا لە دایك بووە، شارەزایەکی باشی لە زانستە شەرعییەکانی ئاینی ئیسلام هـەبوو، بـۆ ماوەیەك ئەندامی دادگای تەمیز و ئەندامی ئەنجومەنی ئیـداری لیـوای بەغـدا بـوو، لـە حـوزەیرانی ١٨٩٨ پۆستی نەقیبی پیاومـاقوڵان (**نقابـة الاشـراف**) وەرگـرت، لـە تشـرینی یەکـەمی ١٩٢٠ یەکـەم حکومـەتی نیشتیمانی عێراقی پێکهێناوە، لە حوزیرانی ١٩٢٧ مردووە. میر بصري، اعلام السياسـة في العـراق الحـديث، ج١، دار الحكمة لندن، ٢٠٠٥، ص ص ٦٣ — ٧٣.

(٢) - زكي صالح، مقدمه في دراسة العراق المعاصر،ط١، بغداد، ١٩٥٣، ص ٥٣.

(٣) - عبدالرزاق الحسني، العراق في دوري الاحتلال و الانتداب، ج١،صيدا، ١٩٣٥، ص ٢٩٨.

(٤) - سەلمان عەلی( وەرگێڕان)، کوردستانی عێراق لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا، پێشەکی و پێداچوونەوەی: سـدیق سـاڵح، ب١، سـلێمانی، ٢٠٠٥، ل ل ١١- ١٢" د. حامـد محمـود عيسـى، القضـية الكردية في العراق من الاحتلال البريطاني الى الغزو الامريكي ١٩١٤ — ٢٠٠٤، القاهرة، ٢٠٠٥، ص ٦٢.

(٥) - عبدالرزاق الحسني، العراق في دوري... ، ص ٢٩٩" د. حامد محمود ، القضية الكردية في ...، ص٧٣.

(6) -F.O, 371/5068.Kurdistan, India Office Recommendations,20 December1919.

کوردستان دەوڵەتێك لە ژێر چاودێری بەریتانیا بۆ کورد دابمەزرێت و ڕێکخستنی کارەکانی لەسەر بنەمای یاساو دەستور بێت، لەژێر ڕەزامەندی بەریتانیادا گرەنتی پاراستن و مانەوەی هەبێت[١].

دوای ئەوەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خەرجی و تێچوونی ماددی بەریتانییەکان لە عێراق ڕووی لە زیادبوون بوو، سەرباری بەرزبوونەوەی دەنگی ناڕەزایی لە ناوخۆی بەریتانیا سەبارەت بە ئاراستەکردنی سیاسەتەکانی. بەریتانییەکان بیریان لە دامەزراندنی ڕژێمی پاشایەتی لە عێراق کردەوە[٢]. لەگەڵ ئەوەشدا بیرۆکەی پیادەکردنی ڕژێمی کۆماری لە ئارادابوو، کە لە لایەن (جۆن فیلبی) ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوەخۆی عێراق بانگەشەی بۆ دەکرا، بەڵام دواتر ئەو بیرۆکەیە کورتی هێناو وەلانرا[٣].

لە کۆنگرەی قاهیرە، کە لە (١٢ تا٣٠ )ی مانگی ئازاری ساڵی ١٩٢١ بەسترا[٤]، تاوتوێکردنی پرسی ئایندەی عێراق و مەلەسەی کورد تەوەری سەرەکیی باسەکان بوون[٥]. لە ئەنجامدا پیادەکردنی سیستەمی پاشایەتی یەکلایی کرایەوە و (فەیسەڵ)[٦]یش بە شیاودیکەیەن کەس دانرا، بۆ ئەوەی تاجی پاشایەتی عێراق لەسەر بنرێت، لە کاتێکدا پێشتر ناوی چەند کەسێکی تر بۆ ئەو پۆستە دیاری کرابوون[١].

---

(1) -F.O, 371-5069, Civil Commissioner, Baghdad, 3rd July 1920.

(٢) - كاظم هاشم نعمة، الملك فيصل الاول( الانكليز و الاستقلال)، ط٢، بيروت، ١٩٨٨،ص ٧٤.

(٣) - د. أبراهيم خليل أحمد و جعفر عباس حميدي، تاريخ العراق المعاصر،ط١، الموصل، ١٩٨٩،ص ص ٢٩- ٣٠.

(٤) - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت کۆنگرەی قاهیرە بڕوانە: د.عثمان علي، دراسات في الحركة الكوردية المعاصره ١٨٣٣- ١٩٤٦/ دراسه تاريخيه وثائقية، اربيل، ٢٠٠٣، ص ص ٣٧٥-٣٨٥" سروه اسعد، كوردستان من بداية...، ص ١٥١.

(٥) - سروه اسعد، كوردستان من بداية...، ص١٥١.

(٦) - فەیسەڵ کوڕی حوسێن لە شاری تائیف لە حیجاز، لە ٢٠ی ئایاری ١٨٨٣ لە دایك بووە، بەهۆی کێشەیەکی نێوان باوکی لەگەڵ "شەریف عون"ی مامی، خێزانەکەیان ڕەوانەی ئەستەنبوڵ کران، لەوێ دەچێتە بەر خوێندن و زانست و زانیاری وەرگرت، جگە لە عەرەبی زمانەکانی تورکی و فەڕەنسی و دواتر ئینگلیزی زانیووە، دواتر دەبێتە یەکێك لە نەیارانی دەسەڵاتی عوسمانییەکان، لە ساڵی ١٩١٨ دەبێتە مەلیکی سوریا، دواتر فەڕەنسیەکان وەدەری دەنێن، لە ساڵی ١٩٢١ دەبێتە مەلیکی عێراق، لە ساڵی ١٩٣٣ لە تەمەنی ٥٠

ئیتر ئەوەبوو بە مەبەستی ئامادەکاری بۆ دانانی(فەیسەڵ) وەك مەلیکی عێراق، بەریتانییەکان دەستیان بە پەخشکردنی پڕوپاگەندەکانیان کرد[٢]. بۆ ئەوەش کارەکە مۆرکێکی یاسایی وەربگرێت، نوێنەری باڵای بەریتانی داوای لە حکوومەتی کاتی کرد، زەمینەسازی بۆ ئەنجامدانی ڕاپرسیەك بکات. ئەو هەواڵە لە (١٥)ی تەموزی ساڵی ١٩٢١ لە ڕۆژنامەکان بڵاوکرایەوە[٣] و بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو ڕاپرسییەش چەند لیژنەیەك پێکهات[٤].

هەربۆ ئەو مەبەستە دەسەڵاتدارانی بەریتانی کەوتنە خۆیان، ئەوەی تایبەت بێت بە هەولێر، بەردەوام بە تەلیگراف بە شێوەیەکی نهێنی پەیوەندی بە (کاپتن لاین)[٥]ی ئەفسەری سیاسیی هەولێر دەکرا، بۆ ئەوەی هەوڵەکانی خۆی بۆ ڕازییکردنی دانیشتووانی

---

ساڵی مرد. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ناوبراو بڕوانە: محمد مظفر الادهمي، الملك فيصل الاول / دراسات و ثائقية في حياته السياسية و مماته، بغداد، ١٩٩١، ص ١٢" جمال مصطفى مروان، ملوك العراق(فيصل الاول_ غازي – فيصل الثاني)، بيروت، د.ت، ص١٥.

(١) - دیاردیکەی‌ن ئەوانەی بۆ ئەم پۆستە دیاری کرابوون ( عەبدولڕەحمان ئەلنەقیب، تالب ئەلنقیب، عەبدولهادی ئەلعومەری) کە عێراقی بوون، هەروەها لەگەڵ چەند کەسانێکی ناعێراقی. خليل مصطفى،م.س،ص٧٢.

(٢) - عبدالرزاق الحسني، احداث عاصرتها (مجموعة بحوث تاريخيه لاحداث عاصرت بعضها واسهمت في بعض الاخر فهى بمثابة مذكرات نادرة)، بغداد، ١٩٩٢،،ص ص ٦٠ – ٦١ " عامر سلطان قادر مصطفى الاسحاقي، العراق و عصبة الامم ١٩٢٠ – ١٩٣٩/ دراسه تاريخيه سياسيه، رسالة ماجستير، كلية التربيه، جامعة الموصل، ٢٠٠٠،ص ١٦.

(٣) - العراق "جريدة، ١٥ تموز ١٩٢١.

(٤) - عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ط،٧، ج١، دار الشؤن الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٨، ص٥٨.

(٥) - والاس لاین(١٨٩٢-١٩٧٧) لە بنەماڵەیەکی ئاینیی سکۆتلاندی لە ئێرلەندا لەدایك بووە، لە ساڵی ١٩١٢ چووەتە هیند بووەتە بەڕێوەبەری لقێکی کۆمپانیای توتنی بەریتانی- ئەمەریکی، لە ساڵی ١٩١٨ ڕەوانەی میسۆپۆتامیاکرا، لەدوای کاپتن های و مارشاڵ، تا ساڵی ١٩٢٦ ناوبراو ئەفسەری سیاسی بەریتانی بوو لەشاری هەولێر، تا ساڵی ١٩٤٤ لە عێراق مایەوە و لە ساڵی ١٩٤٩ خانەنشین کرا. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی کارو چالاکییەکانی ناوبراو بڕوانە، کاپتن لاین.س.پ.

هەولێر بخاتەگەڕ، تا دەنگ بۆ بەرژەوەندیی (مەلیك فیسەڵ) بدەن[1]. بە نووسراوێکی فەرمیش هەولێر وەك یەکە ئیدارییەکانی تر لە لایەن ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق بۆ گرتنەبەری ئامادە باشییەکان ئاگەدار کرایەوە[2]. (کاپتن لاین) لەم بارەیەوە دەڵێ: **"ئەو پرسە بۆ ئەو کارێکی زۆر گران بوو، چونکە زۆرینەی دانیشتووانی هەولێر کورد بوون و بایەخی ئەوتۆیان بە میرێکی عەرەب نەدەدا"**[3].

دانیشتووان دەبوایە لە ڕێگەی فۆرمێکی لەم شێوەیە دەنگ لەسەر ڕاپرسیەکە بدەن:

**"ئێمە کە لەخوارەوە مۆرمان کردووە، دانیشتووانی گەڕەکی ... لە ناحییەی... لە قەزای... لە لیوای ... بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیرانمان پێ گەیەنرا، کە لەسەرەوە نووسراوە، زۆرینەی سەرنجمان لێدا ئەنجامی ڕەزامەندی ... بێ موعاریز موبایەعەی ئەویر کرا"**[4].

بەر لە بەڕێوەچوونی ڕاپرسییەکە (کاپتن لاین) تەواوی پیاو ماقوڵانی شاری هەولێری کۆکردەوە و داوای لێکردن ئیمزا بۆ (فیسەڵ) کۆبکەنەوە و پاساوی ئەوەی هێنایەوە، کە ناوبراو ئەویرێکی عەرەبەو نەوەی پێغەمبەرە و لە ساڵەکانی جەنگ هاوکاری بەریتانییەکانی لە دژی تورکەکان کردووە. بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت زۆرینەی پیاوماقوڵانی هەولێر لە دژی دانانی (فیسەڵ) بوون و داوای کەسێکی دیکەیان دەکرد[5].

بەڵام (لاین) پێداگری لەسەر ئەوە کردۆتەوە" کە (فەیسەڵ) کاندیدی (لوید جۆرج)ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیایە و ئەگەر ڕەزامەندی لەسەر وەرنەگیرێت، ئەوا بەدوور نازانرێت دەستەیەکی سەربازی ڕەوانەی شار بکات. دوای مشتومڕێکی زۆر (لاین) کۆتایی بە

---

(١) - هـ.س، ل ٨١.

(٢) - المركز الوطني لحفظ الوثائق، ملفات البلاط الملكي، ملفة عرائض و كتب خاصة مقدمه الى حضرة جلال الملك فيصل الاول، رقم ك/١١، ورقه رقم (١٩٩)، بغداد.

(٣) - کاپتن لاین، کورد عەرەب...، ل ٨١.

(٤) - عەلی خالد حەمید(کاکە مەم بۆتانی)، لە دووتوێی یاداشتی شاردا، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ١٩٠" د. سعد بشير، من التخطيط الى التجزئة/ سياسة بريطانيا العظمى تجاه مستقبل كردستان ١٩١٥ -١٩٢٣، السليمانية ، ٢٠٠٧،ص ٢٩٣.

(٥) - بەڵام لاين باسي ئەو كەسەي نەكردووە.

دانیشتەکانی خۆی لەگەڵ پیاو ماقوڵانی هەولێر هێنا، دیارە دەرئەنجامی ئەوتۆی لێ بەدەست نەهات[1].

هەر لە چوارچێوەی هەوڵەکانی ئیدارەی بەریتانی بۆ ڕازیکردن و لە نزیکەوە ئاگادار بوون لە هەڵوێستی دانیشتووان، بەریتانییەکان لە بەغداوە شاندێکی بالآیان ڕەوانەی شارەکە کرد، کە پێکهاتبوون لە (کۆلۆنێل کینهان کۆرنوالیس)، کە دواتر شوێنی (فیلبی) گرتەوە، وەك ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق و (کۆلۆنێل پی. جۆیسی) کە یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی سوپای عێراق. ئەو شاندە لە دوای هاتنیان بۆ هەولێرو ئەنجامدانی دیدار و کۆبوونەوە بە تایبەتی لەگەڵ ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە شارەکە، بۆیان دەرکەوت، کە وا بە ئاسانی ناتوانن دەنگی دانیشتووانی هەولێر بە (بەڵێ) بۆ (مەلیك فەیسەڵ) مسۆگەر بکەن[2]، بۆیە موتەسەڕیف و کاربەدەستانی بەریتانی دژی ئەو هەڵوێستە وەستان و هەوڵیاندا نەیارەکانیان بە هەڕەشە یاخود دەم شیرین کردن خەفە بکەن[3].

شایانی باسە شێوازی بەڕێوەچوونی ڕاپرسیەکە، بە جۆرێك بوو، کە زۆرینەی سەرۆك هۆزو پیاو ماقوڵان لە شوێنێکی دیاریکراو کۆدەکرانەوە لەگەڵ بەشێك لە خەڵکی گەڕەك و گوندەکان، دوای خوێندنەوەی چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز و وتارێك پێشکەش دەکرا، کە تیایدا هانی دانیشتووان دەدرا بۆ ئەوەی دەنگ لە بەرژەوەندیی (فەیسەڵ) بدەن. دواتر بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران دەخوێنرایەوە. لە پاشان بە شێوەیەکی زارەکی پرسیاریان لێ دەکرا، کە ئاخۆ ڕازین یاخود نا، لە هەندێك ناوچە تەنیا دەست بەرزدەکرایەوە وەك پێشاندانی ڕەزامەندی. لە دوای تەواوبونی پرۆسەکەش، هەر لیوایەك موتەسەڕیفی خۆی لەگەڵ ژمارەیەك پیاوماقوڵان و سەرۆك هۆزەکانی شار سەردانی (فەیسەڵ)یان دەکرد و مەزبەتەکەیان ڕادەستی وەزارەتی ناوخۆ دەکرد[4]. لەو ڕاپرسیەدا دەبوو بەشداربووان

---

(١) - کاپتن لاین، س.پ، ل ٨١.

(٢) - هـ.س، ل ٨٢.

(٣) - ڕفیق حلمی، یادداشت، ب ٥، ل٢٧٤.

(٤) - محمد مظفر الادهمي، المجلسي التأسيسي العراقي/ دراسة وثائقية في التاريخ السياسي لمقدمات و انتخابات ومناقشات او مؤسسة تشريعية في العراق، ،ط٢، ج١، بغداد، ١٩٨٩ ص ١٥٥.

وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە، کە بریتی بوو لە:"ئایا ڕازی فەیسەڵ ببێتە مەلیکی عێراق؟ وەڵامی یەکەم: لام پەسەند نییە، وەڵامی دووەم: لام پەسەندە[1].

سەبارەت بە دەنگدانی هەولێر، کە ئەو کات لیوایەکی لاوەکی بوو سەر بە لیوای کەرکووك[2]، دانیشتووانەکەی ڕازی کران دەنگ بۆ بەرژەوەندیی دانانی (مەلیك فەیسەڵ) بدەن[3]. بەڵام لەگەڵ ئەوەی خەڵکی هەولێر دەنگیان بۆ (مەلیك فیسەڵ) دا. کەچی دەتوانیین بڵێین دەنگدانەکە دەستکردی (لاین)[4]ی ئەفسەری سیاسیی بەریتانی بوو لە شارەکە، تەنانەت ناوبراو نایشارێتەوە، کە زۆرینەی کارەکانی لە هەولێر بە فڕوفێل بەڕێکرد و بەبێ ئارەزووی خەڵکەکە (مەلیك فەیسەڵ)ی بەسەریاندا سەپێنرا. تەنانەت دەڵێ هەڵبژاردن پێشوەختە کرابوو و هەموو شتێك تەواو ببوو[5]. سەرەڕای ئەوەش دانیشتووانی هەولێر مەرجی تایبەت بەخۆیان هەبوو بۆ دەنگدان بە (فەیسەڵ)، کە ئەوانە بوون:

١- بەردەوام بوونی ئینتدابی بەریتانی لەسەر عێراق.
٢- داننان بە ڕەسمییەتی زمانی کوردی لە قوتابخانە و دادگە و دامەزراوە کارگێڕییەکان.
٣- دەستەبەرکردنی مافی کورد لە عێراقدا.

---

(١) - حامد محمود عيسى،المشكلة الكردية في الشرق الاوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١، القاهرة،١٩٩٢، ص٨٢.

(٢) - د. سروه اسعد صابر، كوردستان الجنوبية ١٩٢٦ -١٩٣٩ / دراسه تاريخيه سياسيه،ط١، دار سردم للطباعة و النشر، السليمانيه، ٢٠٠٦، ص ٢٣.

(٣) - كاپتن لاين، س.پ، ل ٨٢" عبدالرزاق الحسني، احداث عاصرتها ، ص ٦٣"محسن محمد المتولي، كرد العراق منذ الحرب العالمية الاولى ١٩١٤ حتى سقوط الملكيه في العراق ١٩٥٨، بيروت، ٢٠٠١، ص ٢٦١" جەعفەر عەلی رسول، ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی، سلێمانی ، ٢٠٠٤، ل ٢١٣.

(٤) - د.عوسمان عەلی ناوی بە کاپتن لیۆن بردووە. چەند لێکۆڵینەوەیەك...، ل ١١٦.

(٥) - بڕوانە: کورد عەرەب بەریتانییەکان...، س.پ، ل ٨٣.

٤- لەكاتێ كە باكووری كوردستان بووە دەوڵـەتی سـەربەخۆ، كـوردی باشـوور مـافی ئەوەیان هەبێت بچنە پاڵ ئەو دەوڵەتەی كە بە پێی پەیماننامەی سیڤەر لە داهاتوو دادەمەزرێ[1].

لەو یاداشتەی كە خەڵكی هەولێر بەرزیان كردبووە بە ڕوونی ئاماژەیاندابوو، كە ئەگەر ڕەوشەكە گۆڕا، ئەوا بەپێی مادەی (٦٤)ی پەیماننامەی سیڤەر دەچنەپاڵ دەوڵەتە كوردییەكە[2]. بەڵام ئەو داواكاریانە نەهاتنە بواری جێبەجێكردن، ئەوەش كاریگەری گەورەی لەسەر ویلایەتی موسڵ و لەم چوارچێوەیەدا هەولێریش هەبوو كە بووە هۆی ئەوەی ئەو ناوچانە بە زۆری بە عێراقەوە بلكێنرێن[3].

هاوكات لەگەڵ ئەوەدا ئەنجوومەنی لیوای كەركووك بە زۆرینـەی دەنگـی ئەندامـەكانی (فەیسەڵ)یان بۆ ئەو پۆستە ڕەتكـردەوە[4]. شـاری سـلێمانیش لـە بنەڕەتـدا ڕەتیكـردەوە بەشداریی لەم ڕاپرسیە بكات، لەبەر ئەوەی داوای ئیدارەی سەربەخۆی دەكرد[5]،لە كاتێكدا بەریتانییـەكان ڕوونیـان كردبـووە، كـە ئەگـەر دانیشـتووانی كـەركووك و سـێلمانی لـە ڕاپرسییەكە بەشدار نەبوون، ئەوا ئازادن و دەكەونە دەرەوەی بازنەی دەسەڵاتی حكوومـەتی

(1) - F.o, 371/ 6397, Intelligence Report Iraq ،Nov 1923 .

(2) - British Colonial Officer ,Special Report by his Majestys Government in the United Kigdom of Great Britain and Northen Ireland, to the Councll of the League Nations the Progress of Iraq During the Period 1920 – 1931, London, P254;

د. كمال مظهر احمد، موقف الملك فيصل الاول من المسألة الكردية في العراق، بحث ضمن مؤلف: بنـاء الدولـة العربية الحديثة/ تجربة فيصل بن حسين في سورية والعراق ١٩١٨ -١٩٣٣، منشورات جامعة ال بيت، الاردن، ١٩٩٩، ص ٥٤٤ .

(٣) - ليورا لوكيتز، العراق والبحث عن الهوية الوطنية، ت: دلشاد ميراني، اربيل، ٢٠٠٤، ص ٥٧.

(٤) - فاضل حسین، كێشەی ویلایەتی موسڵ/ لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی دیبلۆماسـیەتی عێـراق- بـەریتانیا- توركیا و رای گشتی، و:محەمەد شاكەلی، چ٢، كەركووك، ٢٠٠٧، ل ٣٢.

(٥) - پێشكەوتن"رۆژنامە"، ژ(٥٦)، ساڵی دووەمی، ٩ی ١٩٢١، ل ٣" د.غانم محمد الحفـو و عبـدالفتاح البوتاني، الكورد والاحداث الوطنية في العراق خلال العهد الملكي ١٩٢١ – ١٩٥٨، دهوك، ٢٠٠٥، ص١٩" نادر ئینتسار، ئیتنۆ نەتەوایەتی كوردی، و: عەتا قەرەداغی، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١١٤.

عێراق[1]. شایانی باسە لە ڕەواندزیش دەنگ وەرنەگیرا، چونکە ئەو کات لە دەرەوەی دەسەڵاتی حکوومەتی عێراقدا بوو[2]. قەزاو ناحییەکانی ناوچەی بادینانی سەر بە لیوای موسڵیش دەنگیان لە بەرژەوەندیی (فەیسەڵ) دا، بەڵام وەکو هەولێر مەرجیان هەبوو[3]. دواتر ئەنجامی راپرسیەکە ئاشکرا کرا، کە ٩٧٪ دەنگیان بۆ بەرژەوەندیی (فیسەڵ) دابوو[4].

لە بارەی دەنگدانەکەی هەولێر نوێنەری باڵای بەریتانی بە (مەلیك فەیسەڵ)ی راگەیاندبوو، کە بەشدارییکردنی دانیشتووانی هەولێر و ناوچەکانی دیکەی کوردستان لە دەنگدانەکەی بەومانایە نایەت، کە دەست بەرداری مافەکانیان بوونە، بەڵکو دەرفەتی ئەوەیان هەیە بە ئایندەی خۆیان دابچنەوە، ئەو هەڵوێستەش لە لایەن (مەلیك فەیسەڵ)ەوە ڕەخنەی توندی لێگیرا[5].

دوای ئاشکراکردنی ئەنجامی راپرسیەکە، لە ڕۆژی (٢٣)ی ئابی ١٩٢١ ئاهەنگی تاج لەسەرنانی (فەیسەڵ) بەڕێوەچوو، تیایدا نوێنەری زۆرینەی ناوچەکان ئامادەبوون جگە لە نوێنەرانی سلێمانی و کەرکووك[6]. نوێنەری هەولێریش ئامادەی ئاهەنگی تاج لەسەر نانەکە بوو[7]، دوای ئەوەی (عەبدولڕەحمان ئەلنەقیب)ی سەرۆك وەزیران داوەتنامەیەکی فەرمی ئاراستەی (سەید عەبدولاپاشا نەقیب) کرد، بۆ ئەوەی بە سیفەتی نوێنەرایەتی

---

(١) - د.عزيز الحاج، م.س،ص٤٥" د.جاسم تۆفیق، مەسەلەی کورد و یاسای نێودەوڵەتان، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ١٧٠.

(٢) - غسان العطيه، العراق نشاة الدولة ١٩٠٨ -١٩٢١، ت: عطا عبدالوهاب، دارالسلام - لندن، ١٩٨٨،ص ٤٧٦.

(٣) - د. سروه اسعد، كوردستان الجنوبية...، ص ٢٣.

(٤) - محمد الادهمي، المجلس التاسيسي...،ج٢، ص ١٦.

(٥) -خليل الاتروشي،م.س، ص ٧٨.

(٦) - ئیدمۆندس، س.پ، ل١٥٥" د.كمال مظهر، كركوك و توابعها...، ص ١٤١" عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، ج١، دار الشؤن الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٩، ص ٢٣٣.

(٧) - جعفر الخياط ( ترجمة و تعليق)، العراق في رسائل المس بل، تقديم و تعليق: عبدالحميد العلوجي، بغداد، ١٩٧٧،ص ٣٤٦ .

هەولێر لە ئاهەنگی تاج لەسەر نانەکە ئامادەبێت، بە تایبەتی کە ناوبراو لەگەڵ (فەیسەڵ) پەیوەندییەکی دێرینیان هەبوو. یەکێك لە نووسەران ئاماژە بەوە دەکات، هەر لە بەغدا ناوبراو لە لایەن (فەیسەڵ)ەوە ڕادەسپێردرێت، بۆ ئەوەی پۆستی وەزیری ئەوقاف وەربگرێت، ئەویش قبوڵی دەکات[1]، بەڵام لەو ماوەیەدا هەر لە شاری بەغدا نەخۆشی تەنگی پێ هەڵچنی و لەوێ گیانی لە دەستدا و بە کەژاوەیەکی شکۆدار تەرمەکەی هێنرایەوە هەولێر[2].

هەر سەبارەت بە هەولێر و ( مەلیك فەیسەڵ)، دەبێ ئاماژە بۆ یەکەمین سەردانی ناوبراو بکەین بۆ شارەکە. دەسەڵاتدارانی بەغدا بە باشیان زانی کە (مەلیك فەیسەڵ) سەردانی لیواکانی کوردستان بکات جگە لە سلێمانی، چونکە ئەو کاتە لە دەرەوەی بازنەی دەسەڵاتی حکومەتی عێراق دابوو و لە سایەی بەڕێوەبەرایەتیی ڕاستەوخۆی نوێنەری باڵای بەریتانی بەڕێوەدەبرا[3]. بێگومان ئەو سەردانە هەنگاوێك بوو، بۆ بەرقەرارکردنی پێگەی خۆی لەم ناوچانەداو ڕاکێشانی سۆزی دانیشتووان بۆ لای خۆی.

لەم چوارچێوەیەدا ناوبراو، لە ١٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٤ سەردانی هەولێری کرد، بەر لە گەیشتنی بۆ شارەکە، هەر یەك لە (ئەحمەد عوسمان)ی موتەسەڕیف و (کاپتن لاین)ی ئەفسەری سیاسیی شار و (چارلس لیتلدل)ی فەرماندەی پۆلیسی هەولێر، بەمەبەستی پێشوازی لێکردن بەرەو سنووری لیواکەیان لە (گوێڕ) بەڕێکەوتن[4]، چونکە لە دوای موسڵ، هەولێر دووەمین وێستگەی سەردانەکەی (فەیسەڵ) بوو، هەربۆیە لەم ڕێگەیەوە بۆ هەولێر هات[5].

---

(١) - بوتان جلال، م.س، ص ٥٨.

(٢) - مصطفى اربيللي، م.س.

(٣) - کاپتن لاین، س.پ،ل ١٦٠.

(٤) - هـ.س، ل ١٦٠.

(٥) - جەلال خدر، حەسەنە شەل...، ل ١٧.

دیاردیكەین یاوەرانی ( مـەلیك فەیسـەڵ) بـریتی بـوون لـە خێزانـی خـۆی و (ئـەویر زەید)ی[1] برای و (كۆلۆنێل كۆرانوالیس)ی ڕاوێـژكاری نـوێی وەزارەتـی نـاوخۆ[2]، لەگـەڵ وەزیری ئەوقاف (ئیـبراهیم حەیـدەری)[3]. دیـارە ئـەوەی دوایـی وەك كـوردێكی خـەڵكی هەولێر، بە مەبەستی زیاتر ڕاكێشانی سۆزی دانیشتووانی ناوچە كوردییەكان و بە تایبەتی شاری هەولێر، یاوەری (مەلیك فەیسەڵ)ی دەكرد.

خەڵكی گوندەكان و دانیشتووانی شاری هەولێر بۆ دیدەنی و پێشوازی مەلیك هـاتبوون و لەمبەرو ئەوبەری شەقامی سەرەكیی شار وەستابوون، (ئەحمەدی عوسمان)یش لـە یەكـەم دیدەنی لەگەڵ كەژاوەی ئۆتۆمبێلـەكانی مـەلیك سـەركەوتبوو[4]، قوتابیـانی شـاریش بـە سرودی نیشتیمانی پێشوازییان لێ كرد[5].

وەك نەریتێكی عـەرەبی لـە دەروازی شـار بـە بۆنـەی هـاتنی مـەلیك حوشـدیكەیەك سەربڕا[6]. دوای گەیشتنی بۆ شاری هەولێر (مـەلیك فەیسـەڵ) لـە مـاڵی ( مەلافەنـدی) میوانداری كرا و لەوێ مایەوە[7]. هەندێك ئاماژە بەوە دەكەن، هەر لـە حیجـازەوە بـاوكی (فەیسەڵ) ئامۆژگاری (فەیسەڵ)ی كردبوو، كـە سـەردانی (مـاڵی مـەلا فەنـدی) بكـات،

---

(١) - پێشدیكەیش لە سەرەتای مانگی نیسانی ١٩٢٣دا ئـەمیر زەیـدی بـرای مـەلیك فەیسـەڵ سـەردانی هەولێری كردبوو. العراق"جریدة"،ع (٨٧٧)، ٤ نیسان ١٩٢٣.

(٢) - كاپتن لاین، س.پ، ل ١٦١.

(٣) - جلالة الملك في اربيل، العراق "جريدة"، ع (١٤١٧) الجمعة كانون الثـاني ١٩٢٥ م/ الموافـق ٥ جمـادي الاخرى سنة ١٣٤٣هـ.

(٤) - كاپتن لاین، س.پ، ل ١٦١.

(٥) - جەلال خدر، حەسەنە شەل...، ل ١٧.

(٦) - كاپتن لاین، س.پ،ل ١٦٠.

(٧) - مەلا محەمەدی كۆیە( مەلای گەورە)، تەفسیری كوردی لە كەلامی خواوەندی، دەفتـەری سـێزدەهەم، دەستنووس، ل ١١٢ . لە نووسینگەی تەفسیر لە شاری هەولێر ئێستە كاری لەچاپدانی بۆ دەكرێت.

ئەوەش بەهۆی ئەو پەیوەندیە لەمێژینەیەی کە لە نێوان ئەو دوو بنەماڵەیەدا هەبوو[١]. ئەو پەیوەندییەش لەلایەن بنەماڵەی (مەلافەندی) پێداگیری لەسەر دەکرێت[٢]. لە ڕاستیدا هەرکات (مەلیك فەیسەڵ) سەردانی هەولێری بووایە، ماڵی (مەلا فەندی) شوێنی حەوانەوەی بوو[٣]، هەر بۆیە پەیوەندی توندوتۆڵ لە نێوان (مەلافەندی) و کۆشکی مەلەکی هەبوو.

لە بەیانی ڕۆژی دواتر، (مەلیك فەیسەڵ) بە جیا لەگەڵ بەرپرسی بەریتانی لەشارەکە (کاپتن لاین) کۆبووەوەو ڕەوشی شارەکە و ئاشنابوون بە تەواوی وردەکارییەکان و کەسایەتییەکانی ناوچەکەی لەگەڵ (لاین) باسکرد وپرسیاری زۆری سەبارەت بە دەڤەرەکە لێکرد[٤].

هەروەها (مەلیك فەیسەڵ) کۆبوونەوەیەکی جەماوەری لە شاری هەولێر بەستا، کە ڕۆژنامەیەکی هاوچەرخ دەقەکەی بە وردەکارییەوە بۆ تۆمار کردووین" لە سەرەتای کۆبوونەوەکەدا وەزیری ئەوقاف (ئیبراهیم حەیدەری) وتارێکی کورتی بە زمانی تورکی پێشکەش کرد، تیایدا سوپاس و ستایشی دانیشتووانی کرد، بۆ ئەو پێشوازییە گەرم و

(١) - کەریم شارەزا، لاپەڕەیەك لە مێژووی ژیانی نەمران/ زانای ناوداری کورد مەلافەندی و بنەماڵە و پێگەیشتن و زانیاری و خزمەتگوزارییەکانی، بەشی سێیەم، برایەتی "ڕۆژنامە"، ژ(٢٠٤٦)، شەممە ١٩-٩-١٩٩٤" چاوپێکەوتن لەگەڵ عوسمان موفتی" چاوپێکەوتن لەگەڵ ئیحسان موفتی.

(٢) - ئەم بنەماڵە باس لەوە دەکەن حاجی عومەرە فەندی کوڕی مەلافەندی مەلای گچکەی هەولێر، کە دەکاتە باوکی "مەلافەندی" و مامی "احمد عوسمان" و "محەمەد موفتی"یە بەر لە کۆچکردنی لە ساڵی ١٨٩٢، دەچێتە حیجاز لەوێ دەرسی ئاینی تەفسیر و حەدیسی گوتووتەوە، خەڵکی حیجازیش زۆرجار لە دەوری کۆبوونەتەوە، شەریف حوسێن کە ئەوکات لە هەرەتی گەنجییەتی بووە ڕۆژێکیان پێکەوە دادەنیشن، "حاجی عومەرە فەندی" وەك پێشبینی پێی دەڵێت: تۆ دوا ڕۆژ دەبیتە شەریفی مەککە و کوڕەکانیشت لەچەند شوێنێك دەبنە مەلیك، جا دوای دانانی فەیسەڵ بە مەلیکی عێراق، شاحوسێن ئامۆژگاری دەکات پەیوەندی بەم بنەماڵەیەوە بکات. ئیحسان موفتی، س.پ، ل ١٨" چاوپێکەوتن لەگەڵ عوسمان موفتی.بەڵام ئەم زانیاریە چیرۆك ئامێزە لە هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی دووپات نەکراوەتەوە.

(٣) - چاوپێکەوتن لەگەڵ نورەدین دەباغ.

(٤) - کاپتن لاین، س.پ، ل ١٦٢.

گەورەیەی کە لە مەلیکیان کرد[1]. دواتر (مەلا محەمەدی کۆیە) وتارێکی بە زمانی کوردی پێشکەش کرد، تیایدا دڵسۆزی و خۆشەویشی دانیشتووانی بۆ مەلیك پیشاندا، لە دوای ئەوە، ئینجا (مەلیك فەیسەڵ) وتارێکی بە زمانی تورکی پێشکەش کرد[2] و گوتی:

**"زۆرم حەز دەکرد ئەو وتارەم بە زمانی کوردی پێشکەشبکردبایە، بەڵام بە داخەوە بەهۆی نەزانینی زمانی کوردی ناتوانم بە کوردی ئەو وتارەم پێشکەش بکەم، بەڵێن بێت و هیواخوازم لە داهاتوویێکی نزیکدا بە دیدارتان بگەم، ئەو جارە بە زمانی کوردی وتارێك پێشکەش بکەم و نەهاتنیشم لە کاتێکی زووتر بۆ شارەکە، بۆ سەرقاڵیم و نەبوونی دەرفەتی پێویست دەگەڕێتەوە".**

مەلیك لە وتارەکەیدا دەست بۆ ئامادەبووان درێژ دەکات و دەڵێت:**"مێژوو گەواهیدەرە کە کوردەکان موسڵمان و نیشتمانپەروەرن و سەلاحەددینی ئەیوبیش پابەندبوونی بەهێزی کوردی بە ئایین و ئاکارەوە سەلماندووە و جێگیرکردووە، هیچ جیاوازییەکیش لە نێوان کورد و عەرەب نییە، (ئامادەبووان لەو کاتەدا دەست بە چەپڵە لێدان دەکەن). هەروەها ئاماژەیدا کە ئەگەر هاتوو موسڵمانان یەکگرین، ئەوا بەرز دەبنەوە، هەربۆیە تەمەندارانی ئامادەبوو باوکمن و هاوتەمەکانیش برامن و تەمەن بچوکەکانیش کوڕمن"** (ئامادەبووانیش لەو کاتەدا دووبارە دەستیان بە چەپڵە لێدان کردەوە). مەلیك لە بەشێکی دیکەی وتارەکەیدا بەڵێنیدا تەواوی ئەو ئیمتیازاتانە بە کورد دەبەخشێت، وەك ئەوەی لە یاسای بنەڕەتی (قانون الاساسي) هاتووە، هەولێریشی بە مرواریيەکی گران بەها لە عێراقدا وەسفکرد (ئامادەبووانیش دیسانەوە بە چەپڵە لێدان ئافەرینیان بۆ دەکرد). هەر لە درێژەی وتارەکەیدا ( مەلیك فەیسەڵ) ئاماژەی بەوەشدا، کە **"هەر کەسێك لەم ناوچەیە نیشتەجێیە، نەوەی ئەو نیشتمانەیە بەبێ جیاوازی، هەموو هیواو ئاواتیشم ئەوەیە، کە**

---

(١) - سەرچاوەیەکی دیکە باس لەوە دەکات مەلافەندیش وتاری پێشکەش کردووە. بڕوانە: ئیحسان موفتی، هەولێر لە سەردەمی مەلافەندی و محەمەد موفتی و احمد ئەفەندی قورسایی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆی هەبوو، بەدرخان "مانگنامە"،ژ(٨٨)، کانوونی یەکەم ٢٠٠٧/١٢/١٢، ل١٨.

(٢) - لە لایەن مەلا محمەدی کۆیە وتارەکە بۆ ئامادەبووان کراوەتەوە کوردی. مەلا محەمەدی کۆیە. تەفسیری کوردی لە کەلامی خواوەندی، دەفتەری سێزدەهەم.

**پێکەوەو بەیەك دەست لەپێناوی بەرزکردنەوەی ئەو نیشتمانە کاربکەین"** (ئامادەبووانیش لەو کاتەدا بۆماوەیەك دەستیان بە چەپەڵە لێدان کرد)[1].

دوای تەواوبوونی وتارەکەی (مەلیك فەیسەڵ)، قائیمقامی ڕەواندز (سەید تەهای نەهری) بە زمانی کوردی وتارێکی پێشکەش کرد، دوای ستایشکردنی مەلیك باسی لەوە کرد، کە: دانیشتووانی هەولێر دەنگیان بۆ جەلالەتی داوە و داوای دابینکردنی پێداویستییەکانی دەڤەرەکەی کرد. لە کۆتایی قسەکانیشیدا سێ جار بە دەنگی بەرز دروشمی (بژی مەلیکی) گوتەوە. لە پاشان (ئەحمەد عوسمان)ی موتەسەڕیف، قائیمقامی قەزاکانی سەر بە هەولێرو ڕیش سپی و پیاوماقوڵان و گەورە پیاوانی ئاینی و سەرۆك هۆزەکانی ناوچەکەی بە مەلیك ناساند[2].

(مەلیك فەیسەڵ) لەسەردانەکەیدا بڕیاریدا (١٠٠) ڕوپییە بە هەژارانی شارەکە ببەخشێت، بەڵام ئەوەی تێبینی کرا لەو کاتەی (ئەحمەد عوسمان) جانتای پارەکەی لە گەورە بەرپرسانی کۆشکی مەلیك وەرگرت و سەیری کرد، تەنیا (٥٠) ڕوپییە بوو، هەربۆیە (ئەحمەد عوسمان) بە پەلە کوڕزێ پرسیاری ئەوەی کرد، کە ئەوە نیوەی ئەو پارەیەیە، کە (مەلیك فەیسەڵ) بڕیاری لێدابوو، لەوکاتەدا زۆر بە خێرایی لەلایەن سەرۆکایەتی و دەست و پێوەندەکانی کۆشك دەمکوت کرا و پێی گوترا، مادام مەلیك (١٠٠) ڕوپییەی گوت، هەرچەندبوو هەر بە ناوی (١٠٠) ڕوپییەکە وەریبگرە. هەربۆیە ناچاربوون پارسەنگی ئەو بڕەیەی کەمبووە لەسەر حیسابی بودجەی شارەوانی شارەکە دابینی بکەن، ئەوە وەك ئەوەی (لاین) باسی لێوە دەکات[3]. ئەوەش لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ گەندەڵی دەست و پێوەندەکانی کۆشك.

سەرچاوەیەك باسی ئەوە دەکات، کە لەسەر تکاو نزای کەسوکاری هەندێك لە زیندانییەکانی شار، مەلیك سەردانی بەندیخانەی هەولێری کرد و ناوی هەندێك لە زیندانییەکانی نووسی و دوای گەڕانەوەی بۆ بەغدا بە لێبووردنێکی کۆشکی پاشایەتی

---

(١) - جلالة الملك في اربيل، العراق "جريدة"، ع (١٤١٧).

(٢) - م.ن.

(٣) -کاپتن لاین، س.پ، ل ١٦٢ .

ژمارەیەکیانی ئازاد کرد[1]. لەم بارەیەوە (لایـن)ی ئەفسـەری سیاسـیی بـەریتانی لـە هـەولێر ئاماژەیداوە:

**"کەسـوکاری زینـدانییان بـە جۆرێـك لـە دەوروبـەری مـەلیك کۆببوونـەوەو داوای ئازادکردنی ڕۆڵەکانیان دەکرد، کە ئەگەر هاتوو مەلیك کەمێك زیاتر لە شارەکە بمابووایە، چاوەڕێ دەکرا، تەواوی ئەو دز وجەردانەی کە زۆر بە زەحمەت کۆکرابوونەوە و لە زیندان دا بوون، بێنە دەرەوەو بگەڕێنەوە سەر ئیشەکانی پێشـووی خۆیـان".** هـەر بۆیـە دەسـتەی ئیدارەی بەریتانیا پێداگیریان لەسەر زیاتر نەمانەوەی مـەلیك لـە شـارەکە کـرد[2]. وەکـو تێبنی دەکرێ، لێرەدا (لاین) تەواوی زیندانیانی شار بە دزو جەردەو ڕێگر دادەنێـت، ئـەوە لە کاتێکدا بێگومان بەشێکیان بەهۆی دژایەتیان بۆ ئیدارەی بەریتانی دەستگیرکرابوون.

پێشتر بۆ چەند جارێك هەوڵی دروستکردنی قوتابخانەیەکی گەورەتر لە هەولێر درابـوو، بەڵام لەلایەن وەزارەتی دارایی عێراق سـاڵانە ڕەت دەکرایـەوە، بۆیـە هـاتنی مـەلیك بـە دەرفـەت زانـرا، (کـاپتن لایـن) نەخشـەی قوتابخانەیـەکی خسـتە بـەردەمی و مـەلیکیش ڕەزامەندی لەسەر دروستکردنی ئەو قوتابخانەیە پێشاندا[3]. هەر لەم سـەردانەی مەلیکـدا بەردی بناغەی نەخۆشخانەیەکیش لە شـارەکە دانـرا[4].هـەروەها (مـەلیك فەیسـەڵ) بـە مەبەستی ڕاکێشانی هەست وسـۆزی سـەرۆك هـۆزو پیاومـاقوڵانی هـەولێرو دەوروبـەری، خەڵات و دیاری بەسەریاندا دابەشکرد[5].

---

(١) - جەلال خدر، حەسەنە شەل.... .

(٢) - کورد عەرەب بەریتانییەکان...، ل١٦٥.

(٣) -هـ.س، ل١٦٣.

(٤) - جلالة الملك في اربيل، العراق "جريدة"، ع (١٤١٧).

(٥) - لەوانە دیاری پێشکەش بە (کاخدری کاشین)ی سەرۆك هۆزی (سیان) کرد، کە لە گونـدی (جاسـتان)ی دەشتی کەندێناوە بۆ پێشـوازی مـەلیك هـاتبوو. چـاوپێکەوتن لەگـەڵ مەدحـەت بێخـەو، ٢٠ /٢٠٠٨/٢. هەروەها چەند سەرۆك هۆزێکی دیکەیش دیاریان وەرگرتووە لەوانە: خدری پاشا، مـەعروف ئاغـای دزەیـی، حوسێنی مەلا. ئەمەش لە بەیتە فۆلکلۆرییەکاندا ڕەنگیداوەتەوە:

مەلیك هاتە ناو کوردان لە بۆ کەیف و سەفایێ

لێی کردە بەفروبـــاران عالەم ڕووی خۆی نەدایێ

لە ڕۆژی (٢٠)ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٤ لە ڕێگەی (قوشتەپە)ەوە مەلیك بەرەو کەرکووك بەڕێ کەوت و لە ژێر ڕێژنەی بارانێکی بەخوڕ لە لایەن ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆك هۆزەکان وپیاوماقولان و سوارەکانی دزەیی تا پردێ بەڕێکرا. بەشێك لە خەڵکی ناوچەکە ئەو بارانەیان بۆ خێروبێری سەردانەکەی مەلیك دەگەڕاندەوە[1]، بێگومان ئەوەش سادە و ساکاری خەڵکەکە دەگەینێ. هەروەها دەکرێت بڵێین ئەو سەردانەی (مەلیك فەیسەڵ) هەولێك بوو بە ئاراستەی بەرقەرارکردنی دەسەڵاتی عێراق و ڕاکێشانی سۆزی دانیشتووانی شارەکە، بە تایبەتی کێشەی ویلایەتی موسڵ، کە ئەو کات لە هەرەتی گەرمی دابوو.

---

خدر و مەعروف و حوسێن لەگەڵ حەسەنی یایێ

هەرسێك دەچوونە کنێ بێك وعەبای دەدانێ

عەبای خدری پاشای بنۆکی بزنە زایێ

عەباس سلێمان سمایل، مێژووی دەشتی هەولێر، ب١، هەولێر،٢٠٠٤. ل ١٦١.

(١) - کاپتن لاین، س.پ، ل ١٦٦ " جلالة الملك في اربيل ،العراق "الجريدة"، ، ع (١٤١٧).

# تەوەری دووەم

# هەولێرو ئەنجوومەنی دامەزراندن (المجلس التأسیسی)

کاتێ (فەیسەڵی کوڕی حوسێن) تەختی عێراق پێ سپێردرا، حکوومەتی کاتی عێراق پشتگیری خۆی پێشاندا، بەو هیوایەی ڕژێمێکی پاشایەتی و حکوومەتێکی دەستووری و دیموکراتی بێتە ئارا. ئەوەش پێویستی بە ئەنجوومەنیکی دامەزراندن هەبوو، لەلایەکی دیکەش ڕێککەوتننامەی (عێراق ـ بەریتانی)، کە لە ساڵی ١٩٢٢ ئیمزای لەسەر کرا[١]، پێویستی بەوە هەبوو لە لایەن ئەنجوومەنیکی دامەزراندن پەسەند بکرێ[٢]. بۆ ئەو مەبەستە (مەلیك فەیسەڵ) لە (١٩)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ دا، بە مەرسومێکی مەلەکی، داوای پێکهێنانی ئەنجوومەنی دامەزراندنی کرد[٣]. ئەو ئەنجوومەنە سێ کاری سەرەکیی لە بەردەم دابوو، بۆ ئەوەی جێبەجێیان بکات:

١ - دانانی دەستوورێك (قانون الاساسي) بۆ عێراق.

٢- دانانی یاسای هەڵبژاردن بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران.

---

(١)- لەسەر ئەو بنەمایەی کە ڕێککەوتنێك شوێنی سیستەمی ئینتیداب بگرێتەوە، لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ لە نێوان عەبدولڕەحمان ئەلنەقیب سەرۆك وەزیرانی عێراقی و پێرسی کۆکسی نوێنەری باڵای بەریتانی ڕێککەوتننامەیەك ئیمزا کرا، کە بە ڕێککەوتنامەی ساڵی ١٩٢٢ی عێراقی- بەریتانی دەناسرێ. احمد رفيق البرقاوي، العلاقات السياسية بين العراق و بريطانيا ١٩٢٢-١٩٣٢، بغداد، ١٩٨٠، ص ٣٥ و مابعدها" د.ليلى ياسين حسين الامير، المعاهدة العراقيه الاولى عام ١٩٢٢ و التوقيع عليها، في: مجموعة باحثين، المفصل في تاريخ العراق المعاصر، ص ٣٨٠ و مابعدها.

(٢) - احمد محمد امين قادر، موقف مجلس النواب العراقي من القضية الكرديه في العراق ١٩٢٥ — ١٩٤٥، بنكەی ژین، السليمانيه، ٢٠٠٧، ص ٤٨.

(٣) - خليل الاتروشي، م.س، ص ٨٩.

٣- پەسەندکردنی ڕێککەوتنامەی عێراق — بەریتانی ساڵی ١٩٢٢، ئەو سێ خاڵەش لە وتارەکەی (مەلیك فەیسەڵ) خرایەڕوو، کە لە کاتی کردنەوەی یەکەم دانیشتنی ئەنجوومەنی دامەزراندن لە (٢٧)ی مانگی مارتی ساڵی ١٩٢٤پێشکێشی کرد[١].

لە (٢٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ (عەبدولموحسین سەعدون)[٢]ی وەزیری ناوخۆی حکوومەتی عێراق، داوای لە سەرجەم موتەسەڕیفەکان کرد، ڕێوشوێنی پێویست بۆ هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی دامەزراندن بگرنە بەر، هەولێر لەگەڵ کەرکووك و موسڵ و سلێمانی لە بازنەی یەکەمی هەڵبژاردن دانرابوو[٣]. حکوومەتیش ڕۆژی (٢٤)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ ی بۆ دەسپێکردن بە هەڵبژاردنەکان دیاری کرد[٤]. ئەوە لەکاتێکدا سیستەمێکی کاتی بۆ هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی دامەزراندن لە (٤)ی ئایاری ١٩٢٢ دەرچوو، کە لە پێشەکییەك و (٧) بەند و (٧٢) مادە پێکهاتبوو، هەڵبژاردنەکانیش بە دوو قۆناغ بەڕێوە دەچوون[٥].

لە سەروبەندی ڕاپرسییەکەدا وەزیری داگیرگاکانی بەریتانی لە(١١)ی تەموزی ١٩٢٢دا لە وتارێکیدا، کە: لە بەردەم ئەنجوومەنی گشتیی بەریتانی( **مجلس العموم البريطاني**) پێشکێشی کرد، ئاماژەیدا کە نایانەوێت دانیشتوانی باشووری کوردستان ناچار

---

(١) - الحكومة العراقيه، مجموعة مذكرات المجلس التأسيسي العراقي، الجلسة الافتتاحيه للمجلس التأسيسي، المنعقد في ٢٧ مارت سنة ١٩٢٤ و ٢١ شعبان ١٣٤٢، ج١، مطبعة دار السلام بغداد، ١٩٢٤،ص ٧.

(٢)- عەبدولحسین سەعدون لە شاری ناسریە لە ساڵی ١٨٧٩ لە دایك بوو، بۆ چەند جارێك بە ئەندامی ئەنجومەنی مەبعوسانی عوسمانی هەڵبژێردرا، لە ساڵی ١٩٢٤ بووەتە سەرۆکی ئەنجومەنی دامەزراندنی عێراق و دووجار پۆستی سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران و سەرۆکایەتی چوار کابینەی وەزاریشی کردووە، لەماوەی ژیانیدا چەندین پۆستی دیکەی وەرگرتووە، لە ١٣ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٩ خۆی کوشت. لە بارەی ڕۆڵ و کەسایەتی ناوبراو بڕوانە: د .لطفي جعفر فرج عبدالله، عبدالمحسين السعدون/ دوره في تاريخ العراق السياسي المعاصر، مكتبة اليقظة العربية، بغداد، ١٩٨٨.

(٣) - خليل الاتروشي، م.س، ص ٨٩.

(٤)- غانم الحفو و عبدالفتاح البوتاني، م.س،ص ٢٠.

(٥) - بۆ دەقی یاساکە بڕوانە: الحكومة العراقية، قانون انتخابات المجلس التاسيسي العراقي، بغداد،١٩٢٣.

بکەن بچنە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتەکەی (مەلیك فەیسەڵ)، بەڵکو ئـەوان ئـازادن لـەوەی بەشداریی لەم راپرسیەدا بکەن، کە بەم نزیکانە ئەنجام دەدرێت[1].

بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی ئەنجوومـەن لـە لایـەن زۆرینـەی چـین و توێـژەکان دووچـاری بەرهەڵستکارییەکی توند بووە[2]، بەجۆرێك بۆ ماوەیەك کارەکانی پەکی کەوت، هەروەها بۆ چەند جارێك گۆڕانکـاری لـە کابینـەی حکوومـەتی عێـراق لێکەوتـەوە[3]. دواتـر لـە کۆبوونەوەیەکی حکوومـەتی عێـراق کـە بەسەرپەرشـتی (مـەلیك فەیسـەڵ) بەڕێوەچـوو، ئەنجوومـەنی وەزیرانـی عێـراق بڕیاریـدا ڕۆژی (پێنجشـەمە)ی (١٢)ی تـەموز ١٩٢٣ هەڵبژاردن دەست پێ بکاتەوە[4]. ئەوەش وەك قۆناغی دووەمی هەڵبژاردن وابوو[5].

لەم چوارچێوەیەدا لە (١٤)ی تەموزی ١٩٢٣ وەزارەتی ناوەخۆی عێـراق بروسـکەیەکی بۆ پشکێنەری کارگێڕی لیوای هەولێر نارد، تیایدا سەبارەت بـە چـۆنییەتی بەڕێوەچـوونی کاروبـاری هەڵبـژاردن پرسـیاری لێکـرا. چـونکە دەبـوو ئـەو لەگـەڵ (ئەحمـەد عوسمـان) موتەسەڕیفی هەولێر، تەواوی هەوڵەکانییان لەم بارەیە بخەنەگەڕ. پشکێنەری ناوبراویش لە وەڵامی ئەو بروسکەیەدا ئاماژەیداوە، کە هیچ پارتێکی توندڕە ۆ و سیاسییی لە هەولێردا بوونیان نییە. بەڵام دەکرێت دانیشتووان بۆ دوو بەش دابەش بکـرێن: ئەوانـەی دەترسـێن و یاخود نایانـەوێت دەنـگ بـدەن. ئەوانەشـی ڕەزایـین و ئامـادەیی دەنگدانیان نوانـدوە. سەبارەت بە(ڕانییە)ش، کە ئەو کات بەهۆی باڵادەستی (شێخ مـەحمود) لـە سـلێمانی بـە

(١) - محمد مظفر الادهمي، المجلسي التأسيسي العراقي،ج ٢، بغداد، ١٩٨٩، ص ٣٠.

(٢) - ناجي شوكت، سيرة و ذكريات ثمانين عاما ١٨٩٤ — ١٩٧٤،ج١، بغداد، ١٩٩٠، ص٦٩. سـەبارەت بە هۆکارەکانی ئەم بەرهەڵستکاریە بڕوانە: محمد الادهمي، م.س،ج٢، ص ص ٣٣-٣٦.

(٣) - نبيل عگيد محمود المظفري، دور نـواب كركوك في مجلس النـواب العراقـي في العهـد الملكـي ١٩٢٥-١٩٥٨/ دراسة تاريخية عن دورهم الوطني، رسالة ماجستر، كليـة الاداب/ جامعـة الموصـل، ٢٠٠٠،ص ٣٢" رجاء حسين الخطاب، العراق بين ١٩٢١- ١٩٢٧،بغداد، ١٩٧٦، ص ٩٦.

(٤) - عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات... ،ج١، ص ١٧٨.

(٥)- غانم الحفو و عبدالفتاح البوتاني، م.س، ص ٢٠.

لیوای هەولێر لکێنرابوو، پشکێنەری کارگێڕی گومانی لە بەشدارییکردنیان هەبوو، یاخود ئەگەر بەشدارییش بکەن بە شێوەیەکی ڕێك نابێت[1].

دوای ئەوەی هەوڵی زۆر بۆ لابردنی ئەو لەمپەرانە درا، لە (٢٣)ی تەموزی ساڵی ١٩٢٣ پرۆسەکە دەستی پێکردەوە، سەرەتا هەولێر دوو دڵ بوون لە هەڵبژاردنی نوێنەریان، دەترسان ئەوە قبوڵکردنی دەسەڵاتی عەرەبی بێت لە کوردستان و بێ بەشیان بکات لە چوونە پاڵ دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی، کە لە هەرێمەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا(باکووری کوردستان)، وەك ئەوەی لە بەندی (٦٤)ی پەیماننامەی سیڤەری ساڵی ١٩٢٠ دا هاتووە بڕیاربوو دابمەزرێت[2].

یەکێك لەو گرفتانەی کە ڕووبەڕووی پرۆسەی هەڵبژاردن بووە لە لیوای هەولێردا ئەوەبوو، کە دانیشتووان ئامادە نەبوون ناوی خۆیان بۆ دەنگدان تۆمار بکەن، چونکە ترسیان لەوە هەبوو ئەو ناو تۆمارکردنە بۆ مەبەستی سەربازگەی بەخۆرکی (التجنيد الاجباري) بەکاربهێنرێت. ئەوەی تێبینیش دەکرێت بەشێك لەو تۆمارانەی کە بۆ تۆمارکردنی دەنگدان ڕەوانەی قەزاکانی هەولێر کرابوون بە بەتاڵی گەڕێنرانەوە، بۆیە پشکێنەری کارگێڕی لە لیوای هەولێر داوای لە وەزارەتی ناوخۆ کرد، کە حکوومەت لەم بارەیە دڵنیایی و ڕوونکردنەوە بە دانیشتووان بدات، بەوەی ئەو دەفتەرە بنەڕەتیانە بۆ مەبەستی بە زۆرکردنی سەربازی بەکار ناهێنرێن. لە لایەکی ترەوە لیواکە بە دەست کەمی ڕێژەی فەرمانبەران گیری خواردبوو، بۆ ئەوەی خێرا کارەکان ڕاپەڕێنن و ناوەکان تۆمار بکەن. لە کاتێکدا (ئەحمەد عوسمان) و پشکێنەری کارگێڕیش لە توانایاندا نەبوو فەرمانبەری نوێ دابمەزرێنن، بەهۆی ئەو ڕۆتینەی کە وەزارەتی ناوخۆ لە ئەنجامی خراپی ڕەوشی ئابووری هەیبوو، ئەوەش ئاستەنگ و لەمپەری لەبەردەم کارەکان دروست کردبوو. بۆیە پشکێنەری کارگێڕی لەم بارەیەوە ئاگاداری وەزارەتی ناوخۆی کردەوە، هەروەها ئاماژەی بەوەشدا، کە وەزارەتی ناوخۆ دەتوانن دوو فەرمانبەری دیکە بە شێوەیەکی کاتی بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکان و تەواوکردنی تۆمارکردنی دەفتەرەکان دابمەزرێنن. لەلایەن

---

(١) - م.ح.و، ملفات وزارة الداخلية، ملف الانتخابات في لواء اربيل، رقم M/4/1/S تسلسل ١٢٣.
وەرگیراوە لە: محمد الادهمي، م.س، ج٢، ص ص ٩٥ .

(٢) - د. عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەك ...،ل ١٣٢.

خۆیەوە وەزارەتی ناوخۆ بۆ بەخشینی دڵنیایی بە دانیشتووان، موتەسەڕیفی هەولێری ئاگادار کردەوە، کە بە هەموو لایەك ڕابگەیێنت، کە تۆمارکردنی ناوی دەنگدەران لە دەفتەرەکانی هەڵبژاردن بە هیچ شێوەیەك بۆ مەرامی بە زۆرکردنی سەربازی بەکار نایەت[1].

یەکێك لە مێژوونووسان باس لەوە دەکات، کە لەئەنجامە سەرەتاییەکانی ناونووسین بۆ هەڵبژاردن، حکوومەتی بەریتانی بۆی دەرکەوت (هەولێر) بەشداریی هەڵبژاردنەکان ناکات، بەڵکو سەرکردە دیارەکانیان بە شێوەیەکی گشتیی زیاتر لایەنگری (شێخ مەحمود)و حکوومەتەکەی بوون[2]. بەڵام حکوومەتی عێراق وای دەردەخست، کە بەشداریی نەکردنی کورد لەم هەڵبژاردنە بە مانای هاوسۆزی لەگەڵ (شێخ مەحمود) نییە، بەڵکو ترسی ئەوەیان هەیە، کە ئەو تۆمارەیان پەل بۆ خزمەتی سەربازی بە زۆری و سەپاندنی باج بهاوێژێت، ئەوەش حکوومەتی عێراق ناچار کرد، دەنگدان بۆ تشرینی دووەمی ١٩٢٣ دوا بخات[3]. هەروەها سەرچاوەیەکی دیکە پەنجە لەسەر ئەوە دادەنێت، کە خواست و ویستەکانی (شێخ مەحمود) بۆ فرەوانکردنی پانتایی دەسەڵاتەکەی و بانگەشەی ئەو کاتەی تورکەکان، هۆکار بوون، کە لەمپەریان لەبەردەم بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکان دروستکرد[4].

ئەوە لەکاتێکدابوو، پێشتر لە ساڵی ١٩٢٢ بە مەبەستی زەمینەسازی بۆ هەڵبژاردن سەرژمێری دانیشتووانی هەولێر کرابوو. لەم چوارچێوەیەدا سەرژمێری دانیشتووانی هەرسێ گەڕەکی قەڵاتی هەولێر ئەنجامدرا، بە پێی ئامارەکە، گەڕەکی سەرا (١٧٦) ماڵ، گەڕەکی تەکیە (٢١٢) ماڵ و گەڕەکی تۆپخانە (١٣٢) ماڵ بوون. سەرجەمی دانیشتووانی هەرسێ گەڕەکەکە بە پێی ئەو ئامارە لە (٥٢٠) ماڵ پێکهاتبوو. لە ئامارەکەدا ناوی سەرۆك خێزان و جۆری کارو و پیشە و تەمەنیان تۆمارکراون، ئەوە لە کاتێکدا وەك لە ئامارەکەدا هاتووە تەنیا ناوی نێرینەی دانیشتووی قەڵا تۆمارکراوە و مێیینەیان هەژمار نەکردووە، ئەگەر هەر خێزانێك شەش کەس بن، ئەوا تەنیا دانیشتووانی سەر قەڵات (٣٠٢٠) کەس

---

(١)- م.ن، ج٢، ص٩٦.

(٢) - جطة لةمةش ضاوةرِواني جيَبةجصكردني بةندةكاني ثةيماننامةي سيظةر بوون، بة مةبةستي دامةزراندني دةولَةتي كوردي.

(٣) - د. عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەك ...،ل ل ١٣٢- ١٣٣.

(٤)- غانم الحفو و عبدالفتاح البوتاني، م.س، ص ٢٠.

دەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا کەموکوڕی لە ئامارەکەدا هەبوو و هەندێك بنەماڵە لە ئامارەکەدا ناویان تۆمار نەکراوە و فەرامۆش کراون[1].

لە (٥)ی مانگی ئابی١٩٢٣، (ئەحمەد عوسمان)ی موتەسەڕیفی هەولێر، وەزارەتی ناوخۆی عێراق ئاگادارکردەوە، کە لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششەکان بۆ بەڕێکردنی هەڵبژاردنەکان، تۆماری شاری (کۆیە) تەواو بووە، بەم نزیکەش ناوچەکانی سەر بە کۆیەش تەواو دەبێت. هەروەها تۆماری ناحییەی (گوێڕ)یش دوومانگی پێهاتووە، لەگەڵ ئەوەی تۆماری شاری (هەولێر)یش تەواو بووە، بەڵام بە هۆی ئەو کەموکورِیانەی کە تیایدا بەدیکرا، دووبارە ڕەوانەی دەستەی سەرپەرشتیکردنی تۆمارکردن کراوەتەوە، تاوەکو بە شێوەیەکی دروست ڕێکبخرێتەوە. کارکردنیش بۆ تۆمارکردن لە ناحییەکانی (شەقلاوە) و (قوشتەپە) بەردەوامە. بەڵام کارەکانی ناحییەی (قوشتەپە) و (مەخموور) بە سستی بەڕێوە دەچن. هەربۆیە پاڵپشت بە ڕەزامەندی وەزارەتی ناوخۆ، دوو فەرمانبەر لەوێ دامەزراون، بۆ ئەوەی کارەکانی تۆمارکردن لە دەفتەری سەرەکیی تەواو بکەن. فەرمانیش بە(سەید تەها)ی قائیمقامی (ڕەواندز) دراوە، کە سێ فەرمانبەر بە کرێ بگرێت، (١٠٠) ڕوپییەش بۆ هەر یەکەیان تەرخان بکات. هەروەها ڕێنماییەکانی بۆ ڕوونکراوەتەوە و وێنەیەك لە سیستەمی هەڵبژاردنی پێدراوە، دواتر ناوبراو هەولێری بەرەو ڕەواندز بە جێهێشتووە. قائیمقامی (کۆیە)ش فەرمانی پێدراوە، فەرمانبەرێکی دیکە بە کرێ بگرێت، بۆ تۆمارکردن لە (ڕانییە) کە بە قەزای (کۆیە) لکێنراوە[2].

لە دوای دەسپێکردنەوەی هەڵبژاردنەکان لەسەر پێشنیازی نوێنەری باڵای بەریتانی، نوێنەری هۆزەکانی ناوچە کوردییەکان لە ئەنجوومەنی دامەزراندن بۆ دووکەس زیادکرا[3]. کە ئەوەش ڕەنگدانەوەی لەسەر زیادبوونی نوێنەرایەتی هۆزەکانی هەولێر هەبوو.

لە (٢٣)ی ئەیلولی ١٩٢٣دا موتەسەڕیفی هەولێر نووسراوێکی بۆ وەزارەتی ناوخۆ بەرزکردەوە، تیایدا ژمارەی دەنگدەرانی خستۆتەڕوو. لەگەڵ ئاماژەدان بەوەی کە هەڵبژاردن

---

(١) - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەم ئامارە بڕوانە: تاریق جامباز و نەژاد بەرزنجی، س.پ.

(٢) - محمد الادهمی، م.س، ج٢، ص ص٩٦ — ٩٧. ئەدهەمی پێنجوێنیشی سەر بەقەزای کۆیە داناوە، بەمەش دووچاری هەڵە بووەتەوە، ڕەنگە چوار قوڕنەبێت، نەك پێنجوێن.

(٣) - الوقائع العراقية "جريدة"، ع(١٣٣) بغداد، ١٤ شباط ١٩٢٤، ص١.

بۆ دوو ڕۆژ دەبێت و لە (هەولێر) و (كۆیە) بەڕێوە دەچێت و دەفتەری سەرەكییش سبەی لە (ڕەواندز) هەڵدەپەسێردرێ[1]. دیارە ژمارەی دەنگدەرانیش لە لیوای هەولێر (٧٧٣٢٧) كەس بوو[2]. بەڵام بەشێك لە ژمارەی دانیشتووان بە خەمڵاندن دانرا، نەك بە ئامارێكی ڕاست و دروست[3].

جێگای سەرنجە هەڵبژاردنەكان بە شێوەیەكی دروست و دادپەروەرانە بەڕێوەنەچوون و بەریتانییەكان و دەسەڵاتدارانی عێراق، ڕێگای ترس و هەڕەشە و خۆ نزیك كردنەوەیان بەكارهێنا، بۆ ئەوەی ئەو كەسانەی لایەنگری سیاسەتی بەریتانی و حكوومەتی عێراق نەبوون، نەچنە نێو ئەنجوومەنی دامەزراندن. ئەوەش بۆ ئەوە بوو، تا زەمینەسازی بۆ پەسەندكردنی ڕێككەوتننامەی (عێراق — بەریتانی) ١٩٢٢ و ئەو پڕۆژانەی كە خۆیان مەرامیان تێدا هەبوو، بەبێ گرێ بەدی بهێنرێت[4].

لە ئەنجامدا زۆرینەی ئەوانەی چوونە نێو ئەنجوومەنی دامەزراندن بە ئاراستەی سیاسەتی حكوومەتی عێراق و بەریتانی هەڵیان كرد. نوێنەرانی لیوای هەولێر بۆ ئەنجوومەنی دامەزراندن پێكهاتوون لە ( ئیبراهیم حەیدەری، صبیح نەشئەت[5]، عەبدولا موخلیس[6]، محەمەد شەریف،

(١) - م.ح.و، ملفات وزارة الداخلية، ملف الانتخابات في لواء اربيل، رقم ١٣/٤/ Sتسلسل ١٥٦.

(٢) - خليل الاتروشي، م.س، ص ٩٦.

(٣) - محمد الادهمي، م.س، ج١، ص ٩٨" غانم الحفو و عبدالفتاح البوتاني، م.س، ص ٢٢.

(٤) - غانم الحفو و عبدالفتاح البوتاني، م.س، ص ٢٣ و٩٧.

(٥) - احمد سەبیح نەشئەت بەكر هەولێری لە ساڵی ١٨٨٢ لە سەماوە لە خانەوادەیەكی هەولێری لە دایك بووە، لە ئەستەنبۆڵ لە قوتابخانەی سەربازی بە پلەی ملازمی دووەم دەرچووە، دواتر قوتابخانەی ئەركانی سەربازی لە ساڵی ١٩٠٣ تەواو كرد، چەندین پلەو پایەی سەربازی لە سوپای عوسمانی وەرگرتووە، لەچەند كابینەیەكی حكومەتی عێراقی وەزیر بوو، لە ساڵی ١٩٢٤ نوێنەری هەولێر بوو لە ئەنجومەنی دامەزراندن، لە ساڵی ١٩٢٥ -١٩٢٧ نوێنەری هەولێر بوو لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق. لە ١٩ی تەمموزی ساڵی ١٩٢٩ لە ئەستەنبۆڵ مرد. میر بصری، اعلام الكرد، ص ص ١٨٣ -١٨٤.

(٦) - عەبدوڵلا موخلیس بەگ كوڕی ئەسعەد بەگی كوڕی ڕەسول پاشایە، لە ساڵی ١٨٥٩ لە بەغدا لە دایك بووە، پاشان چووەتە كەركوك، لە چەند ناوچەیەك بووەتە قائیمقام لەوانە لە ساڵی ١٩٠٦ قائیمقامی ڕەواندز

پیرداود ئاغای دزەیی، داود حەیدەری[1]، حوسێنی مەلا[2]، جێگەی سەرنجە هیچ مەسیحی و جوولەکەیەك، لەنێو نوێنەرانی لیوای هەولێر بەدی ناکرێن. بێگومان دیارە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستی حکوومەتی عێراق.

یەکەمین دانیشتنی ئەنجوومەنی دامەزراندن لە (٢٧)ی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٢٤دەستی پێکرد، (مەلیك فەیسەل) لەم دانیشتنەدا وتارێکی پێشکەش کرد، تیایدا کاکڵەی کاری ئەنجوومەنەکەی خستەڕوو، کە دانانی دەستوورێك و یاسای هەڵبژاردن وپەسەندکردنی رێککەوتنامەی عێراق — بەریتانی ساڵی ١٩٢٢ بوو-وەك پێشتر باسمانکرد-[3].

هەر لەو دانیشتنەدا نوێنەری بەسرە (عەبدولموحسین سەعدون) بە (٥٠) دەنگ وەك سەرۆکی ئەنجوومەنەکە هەڵبژێردرا، دوای ئەوەی توانی لە ڕکابەرە سەرەکییەکانی بباتەوە، کە هەر یەك لە نوێنەری بەغدا (یاسین هاشمی) و نوێنەری هەولێر (ئیبراهیم حەیدەری) بوون. ئەوەی یەکەمیان (٢٣) دەنگ و دووەمیشیان (٨) دەنگی بەدەستهێنا[4]. سەرچاوەیەك ئاماژە بەوە دەکات، کە بەریتانییەکان لە شکانەوەی تای تەرازو بۆ لای (عەبدولموحسین سەعدون) رۆڵیان هەبوو[5].

---

بوو، سەرەڕای ئەنجومەنی دامەزراندن، لە خولی یەکەمی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق نوێنەری هەولێر بوو، لە ساڵی ١٩٤١ لە شاری بەغدا مردووە. احمد حەمەد ئەمین، ئەندامە کوردەکانی...، ل ٦٦.

(١) - داود وەهبی ئیبراهیم لە ساڵی ١٨٨٦ لە هەولێر لە دایك بوو، لە ساڵی ١٩٠٨ لە ئەستەنبۆل حقوقی تەواو کرد، لە ساڵی ١٩٢٢ ئەمینداری دیوانی مەلەکی عێراقی بوو، لە ساڵی ١٩٢٥ بە نوێنەری هەولێر لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی هەڵبژێردرا، لە چەندین کابینەی حکومەتی عێراقی وەزیر بوو، هەروەها ئەندامی ئەنجومەنی پیاوماقوڵان بووە. لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٥ لە ئەستەنبۆڵ مرد. میر بصري، اعلام الکرد، ص ص ١٨٩ -١٩١.

(٢)- الحکومة العراقية، مجموعة مذكرات المجلس التأسيسي العراقي، ج٢، ص١٣٣٧.

(٣) - سەبارەت بە دەقی وتارەکەی مەلیك فەیسەل بڕوانە: م.ن، الجلسة الافتتاحية للمجلس التأسيسي، المنعقد في ٢٧ مارت سنة ١٩٢٤ و ٢١ شعبان ١٣٤٢، ج١، ص٧.

(٤) - م.ن، ج١، ص ص ٨- ٩ .

(٥) - علاء جاسم محمد، جعفر العسكري و دوره السياسي و العسكري في تاريخ العراق حتى عام ١٩٣٦، بغداد، ١٩٨٧،ص ٩٠.

لە دووەمین دانیشتنی ئەنجوومەنی دامەزراندن، نوێنەری هەولێر (داود حەیدەری)، بە جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنەکە هەڵبژێردرا. کاتێك بە (٣٥) دەنگ لە ڕکابەرە سەرەکییەکانی بردەوە، کە بریتی بوون لە نوێنەری (بەغدا) (یاسین هاشمی) کە (٣٢) دەنگ و (علوان ئەلیاسری) نوێنەری (دیوانییە)، کە (٣٠) دەنگی بەدەستێهنا[1]. دیارە (داود حەیدەری) لە ئەنجوومەنەکەدا ڕۆڵی خۆی هەبووە و وەك جێگری یەکەمی سەرۆکی ئەنجوومەنەکە، سەرۆکایەتی چەند دانیشتنێکی ئەنجوومەنی دامەزراندنی کردوە، لەوانە دانیشتنی (چوار، شەش، بیست و شەش، چل و چوار و چل وپێنج)[2].

بەمەبەستی ڕاییکردنی ئەرك و کارەکانی، ئەنجوومەنی دامەزراندن چەند لیژنەیەکی پێکهێنا. نوێنەرانی هەولێریش لە هەندێکیاندا ئەندام بوون" لەوانە (داود حەیدەری) ئەندامی لیژنەی یاسای بنەڕەتی (قانون الاساسي) بوو، کە لە دانیشتنێکی ئەنجوومەنەکە پێکهات[3]. جێگەی ئاماژەیە پێشدیکەش لە دانیشتنێکی ئەنجوومەنەکەدا بە هۆی گرنگی یاسای بنەڕەتی و زۆری مادەکانی، نوێنەری هەولێر (داود حەیدەری) پێشنیازی کردبوو، لیژنەیەکی (١٥) کەسی لە نوێنەری هەموو لیواکان بۆ دانانی یاسای بنەڕەتی پێك بهێنرێت[4]. هەروەها لیژنەیەکی تر لە ئەنجوومەنەکە هەبوو بە ناوی لیژنەی پێداچوونەوەو وردبینی کردنی یاسای هەڵبژاردن (لجنة تدقيق و درس قانون الانتخابات)، (داود حەیدەری) لەوەشیان ئەندام بوو[5]. لە دوای پەسەندکردنی یاسای بنەڕەتی (قانون الاساسي)ش[6]، (محەمەد شەریف) بووە ئەندامی

---

(١) - الحكومة العراقية، م.س، الجلسة الثانية المنعقدة في السبت ٢٩ مارت سنة ١٩٢٤، ج١، ص ١٥.

(٢) - بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: م.ن، الجلسة الرابعة ٣ نيسان ١٩٢٤، ج١، ص٦٧" م.ن، الجلسة السادسةو العشرون، الاثنين في ١٦ حزيران ١٩٢٤،ج١،ص٥٠٥ " م.ن، الجلسة الرابعة و الاربعون، الاحد في ٢٧ تموز سنة١٩٢٤، ج٢، ص١١٣٦" الجلسة الخامسة و الاربعون يوم الاثنين في ٢٧ تموز سنة ١٩٢٤، ج٢، ص ١١٤٠.

(٣)- م.ن، الجلسة السادسة، يوم الخميس ١٠ نيسان١٩٢٤، ج١،ص ص ١٢٧ — ١٣٠.

(٤) - م.ن، الجلسة الخامسه، المنعقد يوم الاثنين في ٧ نيسان ١٩٢٤، ج١، ص ١٠٦.

(٥) - م.ن، الجلسة الثانية و الاربعين للمجلس التأسيسي المنعقد في ٢١ تموز سنة ١٩٢٤، ج٢، ص ١١١٢.

(٦) - م.ن، الجلسة الحادي و الاربعين للمجلس التأسيسي المنعقد في ٢١ تموز سنة ١٩٢٤، ج٢، ص ١٠٧٨.

لێژنەی چاودێریکردنی لە چاپ دانـی یاسـاکە[1]. لێژنەیـەکی تـر بەمەبەسـتی پێداچـوونەوە و وردبوونەوە لە پەیماننامەی (عێراق — بەریتانی) ساڵی ١٩٢٢ پێکهات، نوێنـەری هـەولێر لـەم لێژنەیە (محەمەد شەریف) بوو[2].

یەکێك لەئەرکەکانی ئەنجوومەنی دامەزراندن، کە خرابووە بەردەمی وەك پێشـتر ئاماژەمـان بۆ کرد، پەسەندکردنی پەیماننامەی (عێراق - بەریتانی) بـوو، ئـەوەبوو لـە دانیشـتنی (٣١)ی مانگی ئازاری ساڵی ١٩٢٤ سـەرۆکی ئەنجوومـەن ڕایگەیانـد، کـە سـەرۆکایەتی ئەنجوومـەنی وەزیران پەیماننامەکەی ئاراستەی ئەنجوومەن کردووە و داوای پەسەندکردنی دەکات[3].

سەبارەت بە هەڵوێستی نوێنەرانی هەولێر لە هەمبەر ئەو پەیماننامەیـە، دەبیـنین هـەر لـە سەرەتاوە داوایان کرد پەسەندکردنی ئەو پەیاننامەیە تا دوای یەکلاییکردنەوەی کێشەی موسـڵ دوابخرێت، تەنانەت لەسەر پێکهێنانی خودی ئەو لێژنەیەی کـە بـۆ تـاوتوێکردنی پەیماننامەکـە پێکهات سەرنج و تێبینی خۆیان هەبوو. لەم بارەیەوە (محەمەد شەریف) لەسەروبەندی قسەکردن بۆ پێکهێنانی ئەو لێژنەیە لە یەکێك لە دانیشتنەکانی ئەنجوومەن ڕایگەیاند:

**" بەپێی مادەی (٣)ی پەیڕەوی ناوخۆو وتاری پاشایەتی [ مەلیك فەیسەڵ: لێتۆژ] مـافی ئەوەمان نابێت پەیماننامەکە ڕەت بکەینەوە، یاخود بە هەمـوارکردنەوە پەسەندی بکەین، بۆیە دروستکردنی ئەو لێژنەیە لە پای چییە؟ بۆ چییە؟ ئەگەر مەبەست ئەوەیە کە ئەو پەیماننامەیە تاوتویێ بکرێت و بۆچوون و تێبینی و پێشنیازەکان بخرێتەڕوو، پێویستە مـافی هـەموارکردنی هەندێك لە مادەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە بدرێتە ئەندامانی لێژنەکـە...، هەربۆیـە ئەگـەر دەتانەوێت تەنیا سەیری ڕێککەوتننامەکە بکرێت، بەبێ ئەوەی مافی هەموار کردنمان هەبێت، پێویست ناکات لێژنەکە پێکبهێنرێت، چونکە یاوەرو هاوڕێیانی سـەیریان کـردووە، پێویسـت ناکات خۆی پێوە سەرقاڵ بکرێت و لێژنەی بۆ پێکبهێنرێت، هەربۆیە داوا دەکەم پێشنیازەکەم لەبەرچاو بگیرێت، بەوەی لێژنەکە لە هەموارکردنی ڕێککەوتننامەکە سەرپشك بکرێت، لەگەڵ خستنەڕوو و دیاریکردنی ئەرکەکانی سەبارەت بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی هەموارکردنەکە"**[4].

---

(١) - م.ن، الجلسة الحادي و الاربعين، ج٢، ص ص ١٠٧٩- ١٠٧٨.

(٢) - م.ن، الجلسة الخامسه، المنعقد يوم الاثنين في ٧ نيسان ١٩٢٤،ج١، ص ص ١٠٠- ١٠١.

(٣) - حسين جميل، العراق/ شهادة سياسية، لندن ١٩٨٧،ص ١١٣.

(٤)- الحكومة العراقية، الجلسة الخامسة، المنعقد يوم الاثنين في ٧ نيسان ١٩٢٤،ج١، ص ص ٨٧ — ٨٨.

لەو دانیشتنانەی کە لەئەنجوومەنی دامەزراندن، سەبارەت بەم ڕێککەوتننامەیە ساز دەکرا، نوێنەرانی هەولێر پێداگیریان لەسەر ئەو هەڵوێستەیان دەکردەوە، کە پێویستە تا ئەو کاتەی کێشەی موسڵ یەکلایی دەکرێتەوە ئەو پەیماننامەیە دوابخرێت[1]. ئەو داوایەیان لە دووتوێی یاداشتێکدا بۆ سەرۆکایەتی ئەنجوومەن بەرزکردەوە، تیایدا داوایان کردبوو، ئەو داواکارییەیان لەبەرچاو بگیرێت. ئەو ئەندامانەی کە ئیمزایان لەسەر کردبوو بریتی بوون لە:( حوسێنی مەلا، پیرداود ئاغا، عەبدوڵا موخلیس، محەمەد شەریف، داود حەیدەری) لەگەڵ (ئیسحاق ئەفرایم ئەفەندی و سالح بەگ نەفتچی) کە هەردووکیان نوێنەری کەرکوك بوون[2]، ئەو یاداشتەش لەلایەن نوێنەری هەولێر (محەمەد شەریف) خوێنرایەوە، تیایدا هاتووە:

**"ئەوەی گومانی تێدا نییە، چارەنووسی باکووری عێراق مەبەستم لە موسڵ و ئەو ناوچانەی پێشووە، کە پێوەی گرێ دراوە و ئێمە نوێنەری ئەوێین، هەتا ئێستاش بە هەڵپەسێردراوی ماوەتەوە، بە بۆچوونی ئێمە لە نێوان گومان و دڵنیابوون (الشك واليقين) دایە، هەرچەند ئێمە بیری لێبکەینەوە خۆمان لە تاریکییەکی چڕدا دەبینینەوە، نە دەتوانین بەرەوپێشەوە هەنگاو بنێنین و نە دەتوانین بگەڕێینەوە دواوە، ئەگەر ئەو رەوشە بیروهۆشی عێراقیەکانی بە گشتیی سەرقاڵ کردبێت، ئەوە بۆ ئێمە بە تایبەتی سەرقاڵبوونێکی لە ڕادەبەدەرە، لەبەر ئەوەی ئێمە خەڵکی ئەوێین و چارەنووسیشمان لە خەڵکانی تر زیاتر بە وێوە بەستراوەتەوە، ئەوەی نیگەرانی و ئاڵۆزی ئێمەی زیادیکەش کرد، ئەوەبوو، کە: ڕۆژنامەکان لەم دواییەدا هەندێك هەواڵیان سەبارەت کۆنگرەی ئەستانە بڵاوکردەوە، کە ئەوڕۆ لەوێ دەبەسدیکەی، بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکانمان، بەڵام لەبەر ئەوەی هەتاوەکو ئەو کێشەیە بە چارەسەر نەکراوی بمێنێتەوە، ڕەوشەکەشی بەلای ئێمەوە زۆر لێڵ و نادیار بێت، ئێمە تەنیا بەرامبەر بە پەیماننامەی عێراق – ئینگلیزی ئەوەمان بۆ دەمێنێتەوە، کە دەنگی بۆ نەدەین، لەبەر ئەوەش داوا دەکەین هەر تاوتوێکردنێکی ئەو پەیماننامەیە بۆ دوای چارەسەرکردنی کێشەی موسڵ دوابخرێت، ئەگەر بەم پێشنیازەی ئێمەش ڕازی نەبن، ئێمە هەڵوێستی دەنگ نەدانمان دەبێت و ئومێدەوارین ئەوە لەلای ئەنجوومەنی بەڕێز بە شیاو سەیر**

---

(١) - عمار يوسف عبدالله عويد الاعگيدی، م.س، ص ٢٧٩.

(٢) - الحكومة العراقية، الجلسة العشرين، المنعقد يوم الثلاثاء في ٣ حزيران ١٩٢٤،ج١، ص ص ٣٤٢ – ٣٤٣.

**بکرێت، بەوشێوەیە لێك نەدرێتەوە، کە لە ڕاوبۆچوونەکانماندا لاوازین و لەویستەکانماندا خاو و خلیسکین"[1].**

هەر لەم نێوەندەدا (محەمەد شەریف)ی نوێنەری هەولێر لە بەردەم ئەنجوومەنی دامەزراندن لە وتەکەیدا کە پێشکێشیکرد تیایدا ئاماژەیدا، کە **"نکوڵی ناکرێت هەڵوێستی هەموان شلۆقە، ئێمە نوێنەری باکووری عێراقن تا ئێستا چارەنووسمان دیارنییە، کە چۆن دەبێت، ئێستا ئێمە لە ئەنجوومەنە بەڕێزەکەتان داین، بەڵام بیرمان هەر لەلای کۆنگرەی ئەستانەیە. وەك سەربازێك واین لە نێوان دوو ئاگردا، کە جگە لە خۆبەدەستەوەدان بە قەزاو قەدەر هیچ ڕێگەیەکی دیکە لەبەردەمماندا نییە"**، لەبەشێکی دیکەی وتەکەیدا پێداگیری لەسەر ئەوە کردەوە، کە ئێمەی کورد نامانەوێت، بە هیچ شێوەیەك لە عێراق جیاببینەوە و بێ عێراق بژین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر دەست بەرداربوون لە مافە کارگێڕییەکانمان سازش ناکەین، هەروەها ئاماژەی بەوە داوە، کە ئەوە هەڵوێستی ئێمەیە و هیوا خوازین کەس گومان لە نیشتیمانییەتی و نیازی ئێمەدا نەکات[2]. هەر لەو دانیشتنەدا ناوبراو داوای لە بەریتانییەکان کرد، لەم ڕەوشە تەنگژاویەدا لە کێشەی موسڵ بە تەنیا بەجێیان نەهێڵن و پشت لەو کێشەیە نەکەن[3].

ئەوەی بەدی دەکرێت، بە درێژایی دانیشتنەکانی ئەنجوومەن، کە لەبارەی پەسەندکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیە ئەنجام دەدران، نوێنەرانی هەولێر بۆ چەند جارێك داوایانکرد، پەسەندکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیە بۆ دوای یەکلایی کردنەوەی کێشەی موسڵ دوابخرێت[4]. چەند جارێکیش دانیشتنەکان بۆ پەسندکردنی دواخرا، بەڵام لایەنی بەریتانی مکوڕ بوو لەسەر داخوازییەکانی بۆ پەسەندکردنی ئەو پەیماننامەیە. هەرچەندە ئەنجوومەنی دامەزراندن ڕۆژی (١٠)ی مانگی حوزەیران بڕیاری دابوو، دانیشتنێکی خۆی بۆ ڕۆژی دواتر دوابخات. بەڵام لەژێر فشارەکانی

---

(١) - م.ن، الجلسة العشرون، المنعقد يوم الثلاثاء في ٣ حزيران ١٩٢٤،ج١، ص ص ٣٤٢-٣٤٣.

(٢) - م.ن، الجلسة العشرين، المنعقد يوم الثلاثاء في ٣ حزيران ١٩٢٤، ج١، ص ص٣٤٣ — ٣٤٤.

(٣) - م.ن، الجلسة العشرين، ج١، ص ٣٥٢.

(٤) - بڕوانە: م.ن، الجلسة الحادية و العشرين، المنعقد يوم الخميس في ٥ حزيران ١٩٢٤، ج١ـ ص ٣٥٤" م.ن، الجلسة الثالثة و العشرين، الثلاثاء ١٠ حزيران ١٩٢٤،ج١، ص ٤١٩" م.ن، الجلسة العشرين، ج١، ص ص ٣٤٢ - ٣٤٣.

نوێنەری باڵای بەریتانی (هێنری دۆبس)[1] بە ناچاری ئەو دانیشتنەی لە کاتژێر (١٠:٣٠)ی شەوی (١١/١٠)ی مانگی حوزەیران ئەنجامدا. لە دەستپێکی دانیشتنەکەدا، سەرۆکی ئەنجوومەنی دامەزراندن (عەبدولحسین سەعدون) ئاماژەی بەوە دا، کە هەر چەند بڕیاربوو ئەو دانیشتنە سبەی ساز بکرابایە، بەڵام خاوەنشکۆ (مەلیك فەیسەڵ) پێی ڕاگەیاندین، کە نوێنەری باڵای بەریتانی (هێنری دۆبس) پێی ڕاگەیاندووە، دواخستنی پەسەندکرنی پەیماننامەکە بۆ بەیانی بە واتای ڕەتکردنەوەی دێت. هەربۆیە داوای سازکردنی ئەو دانیشتنەی ئێستای لێکردوون[2]. تەنانەت (دۆبس) مەلیکی لەوە هۆشدارکردۆتەوە، کە: دەبێت ئەنجوومەنی دامەزراندن هەڵبوەشێنرێتەوە، ئەگەر هاتوو پەسەندکردنی پەیماننامەکە ڕەت بکەنەوە[3].

لەدانیشتنی ئەو شەوەدا دوو ڕاپۆرت بۆ پەسەندکردنی پەیماننامەکە لە ئەنجوومەنی دامەزراندن هەبوون، کە لەلایەن هەریەك لە (یاسین هاشمی) و (جەعفەر عەسکەری) ئامادەکرابوون، لە میانەی دەنگدانەکە، پڕۆژەکەی (هاشمی)[4] شکستی خوارد و نوێنەرانی هەولێریش دەنگیان بۆ نەدا[5]. هەروەها نوێنەرانی هەولێریش لەسەر زاری (داود حەیدەری)

---

(١) - هێنری دۆبس لە ساڵی ١٨٧١ لە دایك بوو، شارەزاییەکی باشی لە بواری دارایی هەبوو، لەساڵی ١٩٢٣ لە شوێنی (پێرسی کۆکس) لە پۆستی نوێنەری باڵای بەریتانی لە عێراق دامەزرا، کاریگەری گرنگی لەسەر ڕەنگرێژکردنی سیاسەتی دەرەوەی بەریتانی لە عێراق هەبوو، بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ناوبراو بڕوانە: انعام مهدي علي السلمان، اثر السير هنري دوبس في السياسية العراقية ١٩٢٣-١٩٢٩، اطروحة دكتوراه، كلية الاداب/ جامعة بغداد، ١٩٩٧.

(٢) - الحكومة العراقية،م.س، الجلسة الرابعة و العشرين حزيران ١٩٢٤، ج١،ص ٤٣١.

(٣) - ابراهيم خليل احمد و جعفر عباس حميدي، م.س، ص ٢٩.

(٤) - لە بەشێکی پڕۆژەکەی هاشمی هاتبوو: ئەنجومەن لەسەر پەسەندکردنی پەیماننامەکە لە لایەن حکومەتەوە رازی نابێت" ئەگەر هاتوو هەموار کردنەکان و تێبنییەکانی ڕاپۆرتی لیژنە وەرنەگیرێت، پێویستە زوو بەزوو دەست بە دانووستان بکرێت بۆ ئەنجامدانی هەمووارکردن لە ناوەڕۆکی ڕاپۆرتی لێژنە و پێشکەش کردنیان وەکو پاشکۆیەك بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن، لەگەڵ زامنکردنی مافەکانی عێراق لە هەموو سنووری ویلایەتی موسڵ. بۆ دەقی پڕۆژەکە بڕوانە: الحكومة العراقية،م.س، الجلسة الرابعة و العشرين حزيران ١٩٢٤، ج١، ص ٣٣٥.

(٥) - م.ن، الجلسة الرابعة و العشرين حزيران ١٩٢٤، ج١، ص ص٤٣٦ - ٤٣٩.

دەستیان لەو ڕاپۆرتە هەڵگرت، کە پێشتر سەبارەت بەم ڕێککەوتننامەیە پێشکەش بە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنەکەیان کردبوو[١]. دواتر ڕاپۆرتەکەی (جەعفەر عەسکەری) بە )٣٧( دەنگی بەڵێ و )٢٤( دەنگی نەخێر، سەرکەوتنی بەدەستهێناو پەسەندکرا. هەردوو نوێنەری هەولێر (داود حەیدەری) و (سەبیح نەشئەت) دەنگیان بۆ بەرژەوەندیی ئەو پڕۆژەیە دا، هەروەها (عەبدولڵا موخلیس بەگ، محەمەد شەریف، حاجی پیرداود و حوسێنی مەلا) بە بەتاڵی دەنگیان دا[٢]. ڕاپۆرتەکە سەرەڕای داواکردنی هەموارکردنی چەند بڕگەیەکی ڕێککەوتننامەکە، ئاماژەی بەوە دابوو، ئەگەر بەریتانیا هەموو مافەکانی عێراق لە سنووری ویلایەتی موسڵ نەپارێزێت، ئەوا پەیمانەکە و هەموو ڕێککەوتنەکان لەم بارەیەوە هەڵدەوەشێتەوە[٣].

یەکێك لەو کێشانەی تر کە ڕووبەڕووی ئەنجوومەنی دامەزراندن بووە، بریتی بوو لە ئاشووبەکەی شاری کەرکووکی ساڵی ١٩٢٤ کە دەیان کوژراو و بریندراری لێکەوتەوە، ئەوەش بە هۆی ئەو شەڕو پێکدادانە بوو، کە لە نێوان سەربازە لیڤییە ئاسوورییەکان[٤] و دانیشتووانی کەرکوك بەرپابوو[٥]. سەبارەت بەم کێشەیە نوێنەری هەولێر (محەمەد شەریف) لە دانیشتنێکی

(١) - م.ن، الجلسة الرابعة و العشرين حزيران ١٩٢٤، ج١، ص ٤٣٤.

(٢) - م.ن، الجلسة الرابعة و العشرين حزيران ١٩٢٤،ج١، ص ص ٤٤٢ — ٤٤٣.

(٣) - سەبارەت بەدەقی ڕاپۆرتەکەی جەعفەر عەسکەری بڕوانە: م.ن، الجلسة الرابعة و العشرين حزيران ١٩٢٤،ج١، ص ص ٤٤٠_٤٤١.

(٤) - ئاسوورییەکان، تائیفیەکی نەستووری مەسیحین، پێشتر لە قەزای جولەمێرگ لە ویلایەتی وان نیشتەجێ بوون، دوای هێرشی روسەکان لەساڵی ١٩١٥ بۆ ناوچەکە لە دژی عوسمانییەکان ڕاپەڕین، دوای پاشەکشەکردنی ڕووسەکانیش، عوسمانییەکان بەتووندی بەرەنگاریان بوونەتەوە، هەر بۆیە بەشێکیان ئاوارەی عێراق بوون و لە ناوچەی بەعقوبە نیشتەجێ بوون، بەریتانییەکانیش توانییان سوودیان لێوەربگرن و بیانخزێننە ناو سوپای لیڤییەوە. رياض رشيد ناجي الحيدري، الاشوريون في العراق ١٩١٨ — ١٩٣٦،القاهرة، ١٩٧٧، ص ٢١.

(٥) - لەمانگی ئایاری ١٩٢٤ پێکدادانێکی خوێناوی ڕوویدا، سەرەتای شەڕەکە لە نێوان دووسەربازی لیڤی و دووکاندارێکی شارەکە لە گەڕەکی قۆریاتی شاری کەرکوك بەرپابوو، دواتر شەڕەکە پەرەی سەند، هێزی لیڤی بەسەر شارەکەیاندادا و لەو کاتەش شارەکە قەرەباڵغ بوو، بە هۆیەوە زیاتر لە ٥٦ کەس کوژران و بە دەیانی تر بریندار بوون. بۆ زانیاری سەبارەت بەم ڕووداوە بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية،

ئەنجوومــەنی دامەزراندنــدا، ســەرەڕای خســتنەڕووی چــۆنییەتی ئــەو ڕووداوە، بــە شــێوەیەکی دیبلۆماسیانە سوپاسگوزاری خۆی ئاراستەی نوێنەری بــاڵای بــەریتانی کــرد، کــە گرنگــی بــەم ڕووداوە داوە و خــۆی ســەردانی کــەرکووکی کــردووە و دانیشــتووانی دڵنیاکردۆتــەوە. بــەڵێنی پێداون، کە پارێزگاریان لێ بکات و ئەو کێشەیان چارەسەر بکات و دادپەروەری بەدی بهێنێــت. لە هەمان کاتدا (محەمەد شەریف) داوای لە حکوومەتی عێراق کرد، تەواوی هەوڵــەکانی خــۆی بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بخاتەگەڕ و دادپــەروەری فەراهــەم بکــات، ڕێوشــوێنی پێویســت بگرێتە بەر بۆ  دووبارە نەبوونەوەی کاری لەم شێوەیە. هــەروەها بــە نــاوی گــەلانی عێراقــەوە، داوای لە حکوومەتی عێراق کرد، ئەو سەربازە لیڤییە ئاسووریانە لەو ناوچەیە بگوازرێنەوە، لــە بری ئەوان سەربازی نیشتمانی شوێنیان بگرنەوە(١).

ئەو ڕووداوە بۆماوەیــەك بــاڵی بەســەر دانیشــتنەکانی ئەنجوومەنــدا کێشــابوو. وە تووشــی نیگەرانییەکی زۆری کردبوون، نوێنەرانی هەولێریش لەم دانیشتنانەدا جەختیان لەسەر تــەبایی و برایەتی پێکهاتەکانی دانیشتوی کەرکووك  دەکــردەوە(٢). هــەر بــۆ ئــەو مەبەســتەش هــەردوو نوێنەری هەولێر (داود حەیدەری) و (عەبدوڵا موخلیس) یاداشتێکیان بۆ دەستەی ســەرۆکایەتی ئەنجوومەن بەرز کردەوە، تیایدا داوا لە حکوومەت کــرا، ڕوونکردنــەوە لــە بــارەی ئــەو ڕووداوە بدات(٣).

لە لایەکی دیکەوە بە هۆی چــەند جارێــك هەوڵــدان بــۆ کوشــتنی ئەنــدامانی ئەنجوومــەنی دامەزراندن و دروست بوونی مەترسیی بۆسەر ژیانیان، ڕێژەی دەست لەکارکشــانەوەی ئەنــدامان تا دەهات رووی لە زیاد بوون دەکرد. بەڵام بۆ پەسەندکردنی داواکەیان بڕوبیــانووی دیکــەی وەك نەخۆش کەوتن و بێ تواناییــان دەهێنایــەوە(٤). نوێنــەرانی هــەولێریش لەهەمبــەر ئــەو پرســە

---

ج١، ط٥، ص ص ١٩٨ -٢٠١"پشکۆ ئاغجەلــەری، س.پ، ل ل ٢٩٣ — ٣١٤" ریــاض الحیــدري، م.س، ص ١٩٦.

(١) - الحکومة العراقیة ،م.س، الجلسة الثانیة عشرة، یوم الخمیس ١٥ ایار سنة ١٩٢٤،ج١،ص ص ١٧٩ — ١٨٠.

(٢) - م.ن، الجلسة الثانیة عشرة،ج١، ص ١٨٨.

(٣) - م.ن، الجلسة الثانیة عشرة،ج١، ص ص ١٧٩ - ١٨٨.

(٤) - محمد الادهمي، المجلس التاسیسي...، ج٢، ص ١٧٢.

بۆچوونی خۆیان هەبوو" هەربۆیە لەکاتی دەست لەکارکێشانەوەی نوێنەری بەسرە (یوسف عەبدولئەحەد)، نوێنەری هەولێر (مەلا محەمەدی کۆیە)، لە دانیشتنێکی ئەنجوومەنەکە ئاماژەیدا، کە: هۆکاری دەست کێشانەوەکەی دەزانرێت، بەڵام نەخراوەتەڕوو، گوتیشی:

**"تەنانەت دوێنیٚ خانەوادەو خزم و کەسوکارەکانم نامەیان بۆ ناردوم و سەغڵەت بوونە، کاتێك ڕۆژنامەکانیان خوێندبوەوە و هەواڵی برینداربوونی دوو ئەندامی ئەنجوومەنەکەیان بیستبوو. ئەوەش ئەوانی دووچاری دڵەڕاوکیٚ کردبوو، هەربۆیە داوایان لێکردووم بۆ شارەکەم بگەڕێمەوە. چونکە نوێنەران لە لایەن دانیشتووانی شارەکانیان بەرێزن، هەربۆیە لەسەر حکوومەت پێویستە، لەم هۆکارە بکۆڵێتەوە و ئەو دیاردەیە بنبڕ بکات، بۆ ئەوەی هیچ کەسێکی دیکە لەسەر ئازادی بیروبۆچوون فشاری نەخرێتەسەر ...، پێویستە حکوومەت ڕێوشوێنی پێویست بگرێتە بەر، ئەگەر کار بەم شێوەیە بڕوات، دیاردەی دەست لەکارکێشانەوەی ئەندامانی ئەنجوومەنی دامەزراندن زۆرتر دەبێت"**[(١)]، ئەوە لەکاتێکدابوو لە کۆیە دەنگۆی ئەوە بڵاوببووە، کە گوایە نوێنەری هەولێر (مەلامحەمەدی کۆیە) بە هۆی هەرای بەغدا دژی پەیماننامەی عێراق -بەریتانی لە شاری بەغدا غافڵکوژ کراوە[(٢)].

قسەکانی (مەلا محەمەد) لە لایەن هەندێك لە ئەندامانی ئەنجوومەنەکە بە شێوەیەکی خراپ لێکدراوەتەوە، هەر بۆیە ناوبراو مەبەستەکەی خۆی زیاتر شی کردۆتەوەو گوتویەتی: **سەرجەم نوێنەران داوای ئازادی قسەکردنیان کرد لەگەڵ هەموارکردنی یاسا...، بەڵام هەندێك قسەم گویٚ لیٚ دەبێت، کە دژ بە نوێنەرانە، تا ئەو ڕادەیەی هەندیٚ لەو قسانە هەڕەشەیان تێدایە، بۆیە من مەبەستم ئەوەیە ئازادبین لە بیروبۆچوونەکانی خۆماندا و هەندێکمان بە خیانەت کردن دژ بە گەل و نیشتمان و ئایین تۆمەتبار نەکرێین، لەبەر ئەوەی هەموومان عێراقین... مەبەستەکەم دەستەبەرکردنی ئازادییە بۆ نوێنەر، وێڕای دابینکردنی ژیان بۆی"**، کاتێکیش نوێنەری بەغدا (ئەحمەد داود) هەولڵدەدات ئەو قسانەی بە ئاراستەیەکی دیکە ببات، نوێنەری هەولێر (مەلا محەمەد) لە دانیشتنەکە بەم شێوەیە دێتە وەڵام: **"من گەلم بە هەڕەشەکردن لە ئێمە تۆمەتبار نەکردووە، بەڵکو گوتم گەل بەمە ڕازی نابێت...، هیوادارم قسەکانم بە هەڵە لێك نەدەنەوە... چۆن گەل تۆمەتبار دەکەم بە هەڕەشە لێکردنم، بەڵکو مەبەستەکەم لابردنی**

---

(١) - م.ن، الجلسة الحادية عشر، السبت ١٠ايار ١٩٢٤، ج١،ص ١٧٠.

(٢) - بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مەسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٢، ل ١٠١.

**ئەو گومان و تارماییەیە، لەگەڵ بەخشینی ئازادی تەواو لە پێناو بەدیهێنانی ئاواتەکانی گەلی عێراق"[(1)].**

سەبارەت بە ڕۆڵی نوێنەرانی هەولێر لە تاوتوێکردنی کردنی یاسای بنەڕەتی بە چاوخشانەوە بە کۆنووسی دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی دامەزراندن، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە نوێنەرانی هەولێر ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نەگێڕاوە، تەنیا ئەوە نەبێت لە دانیشتێنکی ئەنجوومەنەکەدا نوێنەری هەولێر (داود حەیدەری) پێشنیازی زیاد کردنی مادەیەکی بۆ یاساکە کردووە. ئەو مادەیەی کە نوێنەری هەولێر پێشنیازی کردبوو بریتی بوو لە مادەی (١٢٢)، کە تایبەت بوو بە ئەرکی هاووڵاتیانی عێراق بە سەرجەم پێکهاتەکانییەوەی بۆ پاراستن و بەرگری کردن لە عێراق و هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی[(2)].

پرۆژەی یاسای بنەڕەتی (قانونی ئەساسی)، لە دانیشتنێکی ئەنجوومەن لە (١١)ی تەموزی ١٩٢٤ پەسەندکرا[(3)]، دوای هەندێك گۆڕانکاری کەم تیایدا[(4)]. نوێنەرانی هەولێر لەگەڵ ئەوەی ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نەبووە، بەڵام دەنگیان لە بەرژەوەندیی یاساکە دا و لە کاتی پەسەندکردنیدا نوێنەری هەولێر (صبیح نەشئەت) بە دەنگی بەرز هوتافی **"هەربژی دەستووری عێراق"** گوتەوە[(5)]. هەروەها ناوبراو ڕۆژی پەسەندکردنی یاساکەی بە جەژن داناوە[(6)]. بەشێوەیەکی گشتیی دەتوانین: بڵێین کورد لە نووسینی یاسای بنەڕەتی دەست و کاریگەری ئەوتۆی نەبووە، بەڵام لە کاتی دەنگداندا، دەنگیان بۆ پەسندکردنی داوە[(7)].

لە دوای پەسەندکردنی ئەو یاسایە، نوێنەری هەولێر (پیرداود ئاغای دزەیی) یاداشتێکی بۆ سەرۆکایەتی ئەنجوومەن بەرزکردەوە، تیایدا پێشنیازی ئەوەی کرد، لیژنەیەك پێکبهێنرێت بۆ چاودێریکردنی لە چاپ دانی یاساکە. ئەوەبوو لەسەر پێشنیازی ناوبراو ئەو لیژنەیە پێکهات،

---

(١) - الحكومة العراقية، م.س،ج١، الجلسة الحادية عشر، السبت ١٠ايار ١٩٢٤، ص ص ١٧٥ - ١٧٦.

(٢) - م.ن، الجلسة الاربعون، الاربعاء ٩تموز ١٩٢٤، ج٢، ص ص١٠٢٦ -١٠٢٧.

(٣)- م.ن ، الجلسة الحاديةو الاربعون، الخميس ١٠تموز، سنة ١٩٢٤، ج٢، ص ١٠٧٨ .

(٤) - محمد زهرة جرانة، مذاكرات في القانون الدستوري، بغداد، ١٩٣٦، ص ٨.

(٥) - الحكومة العراقية، م.س ، الجلسة الحادي و الاربعون، الخميس ١٠تموز، سنة ١٩٢٤، ج٢، ص ١٠٧٩.

(٦) - م.ن ، الجلسة التاسعة الاربعون، السبت ٢ أب سنة ١٩٢٤، ج٢، ص ١٣٣٠.

(٧) - م.ن ، الجلسة الحاديةو الاربعون، الخميس ١٠تموز، سنة ١٩٢٤، ج٢، ص ١٠٧٨.

نوێنەری هەولێریش لەم لیژنەیدا (محەمەد شەریف) بوو، هەروەکو لە یاداشتەکەدا پێشنیازی بۆ کرابوو[1]. دواتر لە (٢١)ی ئازاری ١٩٢٥ یاسای بنەڕەتی لەلایەن (مەلیك فەیسەل) پەسەندکراو لە ڕۆژنامەی (وەقایعی عێراق) بلاوکرایەوە[2]. زۆری نەبرد دەقەکەی وەرگێڕدرایە سەر زمانی کوردی[3]. جێی سەرنجە لەم دەستوورەدا مافەکانی کورد فەرامۆش کراوەو بەپێی پێویست نەخراوەتەڕوو[4]. ئەوەش خەمساردی ڕۆڵی ئەندامانی هەولێر بە تایبەتی و کورد بە شێوەیەکی گشتیی بە دیار دەخات، کە نەیانتوانیوە بەپێی پێویست مافەکانی گەلی کورد لە دەستووردا جێگیر بکەن.

ئەرکێکی دیکەی ئەنجوومەنی دامەزراندن گەلاڵە و پەسەندکردنی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەران بوو. لە کاتی تاوتوێکردنی یاساکەدا نوێنەرانی هەولێر پشتیوانیان لە مافی کەمینە نەتەوەیی و ئاینییەکانی عێراق کردوە و لەو چوارچێوەیەدا (داود حەیدەری) نوێنەری هەولێر پێشنیازی ئەوەی کرد، مافی مەسیحی و جوولەکەکان پارێزراوبێت. بۆ ئەو مەبەستەش داوای کرد لە هەریەك لە ناوچەکانی بەغدا و موسڵ و بەسرە نوێنەریان هەڵبژێردرێت، بە جۆرێك کە لە موسڵ (٢) نوێنەر بۆ مەسیحی و (١) بۆ جوولەکە و لە بەغدا و بەسرە بۆ مەسیحیەکان هەریەکە نوێنەرێك و بۆ جوولەکەکانیش لە بەغدا (٢) و لە بەسرەش (١) نوێنەر دیاری بکرێن[5].

لە چوارچێوەی گفتوگۆکردن لە بارەی یاسای هەڵبژاردن نوێنەرانی هەولێر هاوڕا لەگەڵ ژمارەیەك نوێنەری دیکە، کە ژمارەیان ٢١ نوێنەر بوو، داوایان کرد مادەی (٨)ی یاساکە، کە

---

(١) - م.ن ، الجلسة الحادي و الاربعون، الخميس ١٠تموز، سنة ١٩٢٤، ج٢، ص ص ١٠٧٩- ١٠٧٨.

(٢) - حسين جميل، م.س، ص ٢٤٥" شفيق حاجي خدر، الكرد و القانون الاساسي العراقي لسنة ١٩٢٥، الاتحاد "جريدة"، ع(١٥٣)، السبت ١٤ تشرين الاول ١٩٩٥.

(٣) - بۆ زانیاری سەبارەت بە دەقە کوردییەکە بڕوانە: تاریق جامباز، زمانە فەرمییەکان لە دەستووری وڵاتە فیدراڵییەکاندا، چ١، سلێمانی،٢٠٠٥.

(٤) - غانم الحفو و عبدالفتاح البوتاني، م.س، ص ٢٤. بۆزانیاری سەبارەت بە مافەکانی کورد تیایدا بڕوانە: شورش حسن عمر، حقوق الشعب الكردي في الدساتير العراقية/ دراسة تحليلة مقارنة، مركز كردستان للدراسات الاستراتجية، السليمانية، ٢٠٠٥، ص ١٢٠.

(٥) - الحكومة العراقية، م.س، الجلسة الثامنة و الاربعون، الخميس ٣١تموز، سنة ١٩٢٤، ج٢، ص ١٢٧٣.

تایبەت بوو بە نوێنەرایەتی لیواکان بە جۆرێکی وەها دابڕێـژرێت، کـە نوێنـەری هـەر لیوایـەك خەڵکی لیواکە بێت و نابێت لە لیوایەکی دیکەوە کەسـێك بـۆ نوێنەرایـەتی کردنـی لیوایـەکی دیکە دیاری بکرێت[1]. هەروەها لە چوارچێوەی هەوڵەکانی نوێنەرانی هـەولێر لـە ئەنجوومـەنی دامەزراندن دا و بە پشتیوانی ژمارەیەك ئەندامی ئەنجوومەن، داوایان کرد عێراق بۆ سێ بازنـەی هەڵبژاردن دابەش بکرێت[2]. بەو جۆرە یاسـاکە پەسـەندکراو تیایـدا عێـراق بـۆ سـێ بازنـەی هەڵبژاردن دابەشکرا، هەولێر لەگەڵ موسڵ و کەرکووك و سلێمانی، لە بازنەی یەکەم دانرا[3].

دوای (٤٩) دانیشتن، کە (٤)مانگ و (٧) ڕۆژی خایاند، ڕۆژی شەممە (٢)ی مـانگی ئـابی سـاڵی ١٩٢٤ پاڵپشـت بـە مـادەی (٣)ی یاسـای ئەنجوومـەنی دامەزرانـدن، ئەنجوومەنەکـە هەڵوەشایەوە و کۆتایی بە کارەکانی هێنرا[4]. ئەوەش دوای ئەوەی ئەو ئەرکانەی جێبەجێی کـرد کە وەك نەخشەی کار بۆی دانرابوو، جێبەجێی کردن.

(١) - م.ن، الجلسة الثامنة و الاربعون، الخميس ٣١تموز، سنة ١٩٢٤، ج٢، ص ص ١٢٨٤-١٢٨٥.

(٢) - م.ن، الجلسة الثامنة و الاربعون، الخميس ٣١تموز، سنة ١٩٢٤، ج٢، ص ١٢٨٦.

(٣)- م.ن ، الجلسة الثالثة و الاربعون ، السبت ٢٦ تموز، ج٢،ص ١١٣٠" غانم الحفو و عبدالفتاح البوتـاني، م.س، ص ٢٤.

(٤) - الحكومة العراقية، م.س، ج٢، ص١٣٤٩.

# تەوەری سێیەم

# هەولێر لە بازنەی کێشەی موسڵ دا

کێشەی موسڵ یەکێك بوو لەو کێشانەی لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی لە ئەنجامی شکستی دەوڵەتی عوسمانی لەو جەنگە سەریهەڵدا. تا ئاگربەستی مۆدرۆس لە (٣٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و هاوپەیمانان ڕاگەیەنرا[١]، هێزەکانی بەریتانی (٣٢) کیلۆمەتر لە باشووری شاری موسڵ دوور بوون[٢]، بەڵام دواتر بەهۆی سوود وەرگرتنیان لە بەندەکانی (٧) و (١٦)ی ئاگربەستەکە، توانیان دەست بەسەر هەموو ویلایەتی موسڵ دا بگرن[٣]. تورکیاش بەردەوام بیانووی ئەوەی دەگرت، کە داگیرکردنی ئەو ناوچانە دوای ئاگربەستەکە بووە، هەربۆیە داگیرکردنی ویلایەتی موسڵی لەلایەن بەریتانیاوە بە توندی ڕەتدەکردەوە و بە بەشێکی دانەبڕاوی خاکی تورکیای دادەنا[٤]. کاتێکیش دەوڵەتی عێراق لەژێر سەرپەرشتی بەریتانیا پێکهێندرا، ئەو مەسەلە بوو بە کێشەیەك لە نێوان تورکیا لەلایەك و عێراق و بەریتانیا لەلایەکی دیکە ، کە بە کێشەی موسڵ ناسرا[٥].

ئەو کێشمەکێشمە کە لە کۆنگرەی لۆزان (٢٠ تشرینی دووەمی ١٩٢٢- ٣١ کانوونی دووەمی ١٩٢٣)دا درێژەی هەبوو[٦]، بە هۆی پێداگیری هەردوو لایەنی بەریتانی و تورکی

---

(1) -Bernard Lewis, the Emergance of Modern Turkey, Second Edition, Great Britain, 1968,P239.

(٢) - جرجيس فتح الله، م.س،ص ١٢٣.

(3)-J.C Hurewitz,Diplomacy in the Near and Middle East 1914 – 1956, VoI.II, New york,1972.,PP 36-37 "

د.فاضل حسين، س.پ، ل ٥.

(٤) - بڕوانە: خليل مصطفى، م.س، ص ١٠١.

(5) - J.C Hurewitz,Op.Cit VoII,P36 د.كمال مظهر، كوردستان في سنوات...،ص٣٢٤ ".

(٦) - بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم کۆنگرەیە بڕوانە: بيار مصطفى سيف الدين، السياسة البريطانية تجاه تركيا و أثرها في كوردستان ١٩٢٣ – ١٩٢٦، دار سپيريز للطباعة والنشر- دهوك، مطبعة وزارة التربية- اربيل، ٢٠٠٤، ص ص ٩٣ – ١٥٧.

نەتوانرا یەکلایی بکرێتەوە[1]. بەڵام بڕگەی (٢)ی مادەی (٣)ی پەیمانی لۆزان باسی لەوە دەکرد، کە پێویستە لە ماوەی (٩) مانگدا هێڵی سنووری نێوان عێراق و تورکیا بە ڕێککەوتن لە نێوان بەریتانیا و تورکیا دیاری بکرێت، ئەگەر لە ماوەی ئەو (٩)مانگەدا نەگەیشتنە هیچ ڕێککەوتنێك، پێویستە ئەو کێشەیە بۆ کۆمەڵەی گەلان بەرزبکرێتەوە[2].

بۆ بەدواداچوونی ئەو کێشەیە، هەردوولا لە (١٩)ی ئایاری ١٩٢٤ لە (ئەستەنبۆڵ) کۆنگرەیەکیان بەست، کە بە کۆنگرەی ئەستەنبۆڵ (یان قوستەنتینییە) دەناسرێت[3]. دوای دانووستان و گفتوگۆکردن نەیانتوانی بە ڕێککەوتنێك بگەن، چونکە هەردوولا بەڵگەی خۆیان بۆ دەستەبەرکردنی ویلایەتەکە دەخستەڕوو[4]، هەربۆیە دوای هەرەسهێنانی هەوڵەکان و بن بەست بوونی، کێشەکە بۆ کۆمەڵەی گەلان بەرزکرایەوە[5]. کۆمەڵەی گەلانیش لە دوای دانیشتن، بۆ لێکۆڵینەوە لەم کێشەیە و چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان، لە )٣٠(ی ئەیلولی ١٩٢٤ بڕیاری پێکهێنانی لێژنەیەکی مەیدانی دا، بۆ سەیرکردنی

---

(١) - د.کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك...، ب ١، ل٩٣" کامەران مەنتك، س.پ، ل ١٥٨"د.عوسمان عەلی،چەند لێکۆڵینەوەیەك...، ل ل ٩٦ -٢٠٠" سروە اسعد، کوردستان من بدایة...، ص ص ٢٨٥- ٢٩٢.

(٢)- د.فاضل حسین، س.پ، ل ٥٩" سلیم حسین یاسین التمیمي، الاتجاهات القومیة في مناهج الوزارات العراقیة ١٩٢١ – ١٩٤١، رسالة ماجستیر، کلیة الاداب/ جامعة بغداد، ١٩٨٩، ص ٥٤.

(٣) - لە کۆنگرەی قوستەنتینییە (ئایار– ئابی ١٩٢٤) شاندی بەریتانیا پێکهاتبوو: لە (پێرسی کۆکس) نوێنەری باڵای بەریتانیا لە بەغدا بە یاوەری هەریەك لە(ئاڕ، ئێف. جۆردن R.F.Jordin)ی پشکێنەری کارگێڕی بەریتانیا لە موسڵ و تەها هاشمی سەرۆك ئەرکانی سوپای عێراق بە خەسڵەتی ڕاوێژکار. شاندی تورکیاش پێکهاتبوو: لە کازم پاشای وەزیری پێشووی جەنگ، فەوزی بەگ نوێنەری دیاربەکر، فائیق بەگ نوێنەری سوپا، نەسرەت بەگ ڕاوێژکاری یاسایی کاروباری دەرەوە و عەقید ئیحسان ئەڤینی. بیار مصطفی، م.س، ص ١٦٢.

(٤) - بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی دانووستانەکان بڕوانە: د.فاضل حسین، س.پ، ل ل ٦٤-٦٩" بیار مصطفی، م.س ، ص ص ١٦١ - ١٧٣.

(٥) - د.میم کەمال ئۆڤە، کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ ١٩١٨ – ١٩٢٦، و: سەلام ناوخۆش، چ١،چاپخانەی دهۆك، دهۆك، ٢٠٠٠، ل ل ٤٨ – ٤٩.

مەسەلەکە لـە نزیکـەوە[1]. ئەنـدامانی سـەرەکیی لیژنەکـە پێکهـاتبوون لـە (ئـای. ف. ڤیرسن)[2]، (کۆنت تیلکی)[3]، (ئا.پاولس - A.Pauli)[4].

بەر لە گەیشتنی لیژنەکە بۆ ناوچەکە هەریەك لە تورکیا و بەریتانیا تەواوی هەوڵەکانی خۆیان خستەگەڕ، بە مەبەستی کێشکردنی سۆزی دانیشتووان بە ئاراستەی خۆیان، تـا لـە کۆتاییدا چارەنووسی کێشەکە بۆ بەرژەوەنـدیی خۆیـان مسـۆگەر بکـەن[5]. لـەم بارەیـەوە (عەبدولعەزیز قەساب) — کە لەو ماوەیەدا موتەسـەڕیفی موسـڵ بـوو، لـە یاداشـتەکانی خۆیـدا ئامـاژەی بـە هەوڵـەکانی تورکیـا و لایـەنگرانی لـە موسـڵ داوە، کـە نامـەو نووسراوەکانیان بە نهێنی و هێما رەوانەی هەولێر دەکرد. لە ناوەڕۆکی یەکێك لەو نامانـە، کە لە بەرواری ١٩٢٥/١/٢ واژوو کراوە هانی دانیشتووانی هـەولێر دراوە بـۆ چـوونە پـاڵ تورکیا و داوایان لێکراوە خۆپێشاندان لە دژی حکوومەتی عێـراق و بەریتانییـەکان ئـەنجام

---

(١) - ي. ف، فيرسن، ذكريات من الحرب و السلم. وەرگیراوە لە:جرجيس فـتح الله،م.س، ٣٢٥. عبـدالرحمن البزاز، محاضرات عن العراق من الاحتلال حتى الاستقلال، ط٢، جامعة الدول العربية، معهد الدراسات العربية العالية، مطبعة الرسالة — عابدين ١٩٦٠، ص ٩٤" د. جەبار قادر، لەبـەر ڕۆشـنایی یاداشـتەکانی بڕیـاری کۆمیتەی کێشەی موسڵ (بۆ یەکەم جارە ژمارەکـان و ڕاسـتییە مێژووییـەکان بڵاودەکاتـەوە و بانگەشـەکان پوچەڵ دەکاتەوە)، خاك "گۆڤار"، ژ(٨٠) ساڵی حەوتەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١٧.

(٢)- وەزیرێکی پێشووی سویدی بوو، لەساڵی ١٩٢٤ لەلایەن هاوکارانی بە سەرۆکی لیژنەکە داندرا، خـودان توانستێکی دیبلۆماسی باش بوو، وڵاتەکەی بەشداری لە جەنگی جیهـانی نـەکردبوو، هەربۆیـە پێیـان وابـوو کەسێکی بێ لایەنەو دەتوانێ چارەسەرێکی گونجاو بۆ ئەم کێشە بدۆزێتـەوە. سیسـل ئیدمۆنـدیس، س.پ، ل ٤٧٣.

(٣) - کۆنت پاول تیلکـی ( Count Paul Teleki) لەخانەوادەیـەکی مەجـەری لـە هـەرێمی ترانسـلڤانیا لەدایك بووە، پسپۆڕێکی بەناوبانگی بواری جوگرافیا بوو، دەستێکی باڵای لە نەخشەسازی هەبوو، لـە سـاڵی ١٩٣٩ پۆستی سەرۆك وەزیرانی وڵاتی پێدرا، لە ساڵی ١٩٤١ خۆی کوشت.ی.ف. ڤیرسین، م.س. وەرگـیراوە لە: جرجيس فتح الله، م.س، ص٣٢٥.

(٤)- ئەفسەرێکی خانەنشینی بەلژیکی بوو بە پلەی سەرهەنگ(عەقید)، بەشی ئابووری ڕاپـۆرتی لیژنەکـەی نووسی، لەسەرەتادا هاوسۆزی تورکەکەکان بوو، بەڵام دواتر هەڵوێستی خۆی لە ژێرکاریگەری پڕوپاگەندەکانی ئەرمەنییەکانی موسڵ گۆڕی. جرجيس فتح الله، م.س، ص ٣٢٨.

(٥) - اندرة نوشي، الصراعات البترولية في الشرق الاوسط، دارالحكمة، بيروت ١٩٧١، ص ١٤٣.

بدەن، هەروەها لە بەشێکی نامەکەدا باسی لێبوردن بۆ ئەو کەسانە کراوە، کە خزمەت و لایەنگری بەریتانییەکانیان کردووە[1].

لە یەکێك لە بڵاوکراوە نهێنییەکانی تورکیا، کە (٤٤) دانەی لێ بڵاوکراوەتەوە و بەشێکی لە ڕێگەی باوەڕپێکراوەکانیان لە هەولێر بڵاوبووەتەوە، پێداگیری لەسەر ئەنجامدانی خۆپیشاندان کراوەتەوە[2]. هەر بۆیە تێبینی دەکرێت بەر لەگەیشتنی لیژنەکە بۆ هەولێر (کاپتن لاین) بۆ ڕێگرتن لە هەرچەشنە خۆپیشاندانێك، کە لایەنگرانی تورك لە شارەکە ئەنجامی بدەن، ڕێوشوێنەکانی توونداوتۆڵ کردبوو[3]. هەر لە چوارچێوەی چالاکییەکانی لایەنگرانی تورك لە هەولێر و کەرکووك (لیژنەی دۆستایەتی تورك) بە نهێنی پێکهاتبوو، کارەکانی لە لایەن (فەتاح بەگ)[4] و (نازم بەگ نەفتچی)[5] هەڵدەسوڕێندران[6]. ئەوانە لە لایەن ڕۆژنامەکانی ئەوکاتەی لایەنگرانی بەریتانی هێرشی

---

(١) - عبدالعزيز القصاب، من ذكرياتي، وەرگیراوە لە: جرجيس فتح الله،م.س، ص ص٤٤٤ -٤٤٥.

(٢) - م.ن،ص ٤٤٥.

(٣) - کاپتن لاین، س.پ، ل ١٧٠.

(٤) - فەتاح ئەمین بەگی عەتار ژن برای شێخ مەحمود بوو، زۆرجار بە توندی لە لایەن ڕۆژنامەی ژیانەوە هێرشی کراوەتە سەر، هەروەها نوێنەری تورکیا بوو لە لیژنەی کۆمەڵەی گەلان بۆ شاری سلێمانی. ژیانەوە" ڕۆژنامە"،ژ (١٥)، ١٦-٢-١٩٢٥" پشکۆ ئاغجەلەری، س.پ، ل٢٧٨.

(٥) - نازم بەگ لە بنەماڵەی نەفتچییەکانی کەرکووك بوو، ماوەیەك لە دوای داگیرکردنی کەرکووك بەریتانیەکان ویستیان بیکەنە موتەسەڕیفی لیوای کەرکووك، بەڵام بەهۆی گومان پەیداکردن لێی، ئەم کارەیان نەکرد، دواتر چووە ڕیزی سوپای تورکیا وەك ئەفسەری سیاسی، بەشداری لە هێرشی سوپای تورکیا بۆ سەر ویلایەتی موسڵ کرد، لە میانەی لیژنەی تایبەت بەکێشەی موسڵ نوێنەری تورکیا بوو لە ناوچەی کەرکووك. ئیبراهیم عەلاوی، جوڵانەوەی تۆرانیەت لە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەدا، و: محەمەدی مەلا کەریم، هیوا "گۆڤار"، ژ(٧)، ساڵی یەکەم، کانوونی دووەمی ١٩٥٨، ل ل ٣٢ -٣٣" سیسل ئیدمۆندس، س.پ،ل ٤٧٥ .

(٦) - ژیانەوە "ڕۆژنامە"، ساڵی یەکەم، ژ (١٧)، ٢٣ی شوباتی ١٩٢٥" مەهدی محەمەد قادر، هەولێرو کێشەی موسڵ ١٩٢٥، مێژوو"گۆڤار"، ژ(٤)ی پایزی ٢٠٠٧، ل ١٨٧.

تووندیان دەکرایە سەر[1]. دیارە دیاردیکەین ئەندامەکانی ئەو لێژنەیە لە هەولێر (عەلی پاشای دۆغرەمەچی) بوو، هەروەکو یەکێك لە هاوچەرخی ڕووداوەکان باسی لێوە دەکات[2].

ئەو بەیاننامانەی تورکیا لە ڕێگەی لایەنگران بە شێوەیەکی نهێنی لە هەولێر بڵاودەکرانەوە و لە دیوارەکان هەڵئەدەواسران، بەڵکو لەسەر قەڵات و شوێنە دیارەکانی شار فڕێدەدران. زۆرجاریش ئەو کارانە شەوانە ئەنجام دەدران، چونکە ترسی ئەوەیان هەبوو لەلایەن کاربەدەستان و هێزەکانی شارەکە دووچاری دەستگیرکردن و ئەشکەنجەدان ببنەوە. یەکێك لە وانەی ئەو جموجووڵانەی لە شار و دەوروبەری ئەنجام دەدا و بڵاوکراوەی بڵاو دەکردەوە، (عەلی پاشای دۆغرەمەچی) بوو[3]. لە یەکێك لەو بەیاننامانەی کە لەلایەن تورکەکانەوە لە هەولێر بڵاوکراوەتەوە هاتووە:

**"ئەی موسڵمانی کورد، ئەوانەی حکوومەتی ئینگلیز وا دەزانیٚ حورمەتی ئاین و موحەممەد نازانن، بۆ مەبەستی شەڕ و دوژمنکاری لە نێوان ئەو کۆمەڵەیە ( کورد و تورك) حوکمی خۆجێیان داناوە، ئەوەش بە تەنها بۆ خزمەتی بەرژەوەندیی خۆیان... بیٚ ئاگا لەوەی کورد و تورك برای ئاییني یەکتر و یەك ئومەتن، کاتێك بەریتانییەکان بەم ڕاستیيانەیان زانی حوکمی زاتیان هەڵوەشاندەوە و بە تۆپ ناو شاری سلێمانیان بۆردوومانکرد، منداڵەکانیان کووشتن و کەلوپەلیان وێران کردن... تورکان دەگەڕێنەوە بۆ رزگارکردنی ئێوە لە کافران ... بە لیژنەکە ( لیژنەی لێکۆڵینەوە) بڵێن ئێمە موسڵمانین، پێکەوە لەگەڵ موسڵمانە تورکەکان دەژین... ئەوانەی خزمەتی ئیسلام دەکەن، نامانەویٚ لەگەڵ عەرەب و کافران بژین... ئەگەر هاوکاری حکوومەتی عێراق بکەن، دەبنە هاوپەیمانی عەرەب و کافران... پەشیمانی دادتان نادات"**[4]. لێرەدا بە دیاردەکەویٚ، کە

---

(١) - بۆ نمونە بڕوانە: ژیانەوە "رۆژنامە"، ساڵی یەکەم، ژ(١٦)، ١٦ی شوباتی ١٩٢٥.

(٢) - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نورەدین دەباغ.

(٣) - هەمان چاوپێکەوتن.

(4)-Air,23/163, Arbil Report No,31 May 111925“ FO,371/10837,Confid Teleg. No.305,(Constantinople), April 15,1925 Lindsay to Chamberlain.

وەرگیراوە لە: د.عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەك...،ل ل ٢١٣-٢١٤ .

ئـــەو بەياننامەيـــە هـــەردوو لايـــەنی ســـۆزی ئـــاينی و ئاگەداركردنـــەوە لـــە ئاكامـــە مەترسییدارەكانی پشتگیری لە دەسەڵاتدارانی بەریتانی بۆ كورد وروژاندووە[١].

لـە لايـەنی بەرامبەریشـدا، دەسـەڵاتدارانی عێـراق و بـەریتانی كەوتبوونـە خۆيـان و هەوڵەكانییان لە پێنـاو بەرژەوەنـدیی خۆيـان چـڕكردبووە[٢]، هەربۆيـە بەریتانییـەكان بـە بەشداریی بەشێكی بەرچاو لە پیاو ماقوڵان و كەسایەتییە دیارەكـانی شـارەكە لـە شـاری هەولێر كۆنگرەیێكەيان بەست، ئەو كۆنگرەیە چەند بڕیارێكی لێكەوتەوە، لەوانە :

١- قەرەبوو كردنەوەی ئەو هۆزە كوردییانەی، بەهۆی هێرشەكانی بەریتانیا و سـوپای عێراق لە دژی (شێخ مەحمود) زیانیان بەركەوتووە.

٢- (مەلیك فەیسەڵ) سەردانی ناوچەكە بكات، بۆ ئەوەی دڵنیایی (زەمانەت) بـدات سەبارەت دابینكردنی مافەكانی كورد لە چوارچێوەی عێراقدا.

٣- سەرپەرشتیكارانی ناوچـە كوردییـەكان ( كاربەدەسـتانی بـەریتانی) دەسـەڵاتی زیادیكەیان هەبێت لە بەڕێوەبردنی كارەكان.

٤- بە خێرایی هێڵی ئاسنی لە قـوڵایی كوردسـتان دابنرێـت، بـۆ ئـەوەی كوردەكـان قەناعەتیان پێ بێت، كە بەریتانییەكان ناخوازن ناوچەكانییان بەجێبهێڵن.

٥- لە كۆتایی لەسەر گرتنەبەری هەندێك ڕێوشوێنی بەپەلە ڕێككەوتن، بۆ بەرەنگاری هەر هەوڵێكی تورك، كە لە ماوەی كارەكـانی بەدواداچـوونی لێژنـەی كۆمەڵـەی گەلان ناسەقامگیری و نائارامی لە ناوچەكە بێنێتە ئاراوە[٣].

هەروەها وەزیری ناوخۆی حكوومەتی عێراق (عەبدولموحسین ئەلسەعدون) گەشتێكی بۆ باشووری كوردستان دەستپێكرد، تیایدا بەڵێنی دەستەبەركردنی مافـەكانی كـوردی دا لـە چوارچێوەی عێراقدا[٤]. هەر لەم چوارچێوەیەشدا سەرۆك وەزیرانی عێراق ( یاسـین هـاشمی) لە هەفتەی یەكەمی مانگی مایسی ساڵی ١٩٢٥ سەردانی ناوچە كوردییەكانی كرد و لەو

(١) - هـ.س،ل ٢١٤.

(٢) - عبدالرزاق الحسني، تاريخ الاحزاب السياسية العراقية/ دراسة تاريخية متواضعة عن الاحزاب الساسية التي تكونت في العراق بين العامين ١٩١٨ -١٩٥٨،ط١، بيروت-لبنان،١٩٨٠.، ص ٩٠.

(3) - F.O,371/10068,Intelligence Report, NO.22, Iraq ,November,1,1924.

(٤) - عوسمان عەلی، چەند لێكۆڵنەوەیەك...، ل ٢١٠ .

سەردانەیدا بۆ زانینی دوایین پێشهاتەکان و گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست سەردانی شاری هەولێری کرد، دواتر سەبارەت بە گەشتەکەی ڕاپۆرتێکی بۆ دیوانی مەلەکی بەرزکردەوە[1].

بەریتانییەکانیش بۆ ڕاکێشانی سۆزی کورد، (بەکر سدقی)[2] یان بۆ بانگەشەکان بەکارهێنا، کە ئەفسەرێکی کوردی سوپای عێراق بوو[3]، هەروەها (مەلیك فەیسەڵ)یش بەر لەهاتنی لیژنەکە بە مانگ و نیوێك، بۆ یەکەمین جار سەردانی هەولێری کرد، بە مەبەستی ڕاکێشانی سۆز و لایەنگری دانیشتووانی شارەکە- هەروەکو پێشتر باسمان کرد-. ئەو سەردانەش ئەنجام و وەڵامدانەوەی کۆنگرەکەی شاری هەولێر بوو و کاریگەری خۆی بۆ ڕاکێشانی سۆزی بەشێك لە پیاوماقوڵان و سەرۆك هۆزەکان هەبوو[4]. هەرچەندە هەندێ باس لەوەدەکەن، کە بۆ یەکەمین جار بەشێوەیەکی فەرمی ئاڵای عێراق لەسەر دامەزراوە حکومییەکانی شارەکە لە کاتی هاتنی (مەلیك فەیسەڵ)دا هەڵکراوە[5]، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نادات پێشتر ئاڵای عێراق لە هەولێر هەڵنەکرابێت، چونکە بەپێی هەواڵی ڕۆژنامەی (العراق)، لە ساڵی ١٩٢٣دا بۆ یەکەمین جار ئاڵای عێراق لە کوردستان لە شاری هەولێر هەڵکرا[6].

---

(١) - سامي عبدالحافظ القيسي، ياسين الهاشمي و دوره في السياسة العراقية بين عامي ١٩٢٢ — ١٩٣٦، البصرة، ١٩٧٥، ص ص ٢٨٥- ٢٨٦" عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات...،ج١،ص ٢٥٢.

(٢)- فەریق بەکر سدقی لە ساڵی ١٨٩٠ لە دایك بوو، ئەفسەرێکی کوردی خەڵکی گوندی عەسکەری ناوچەی چەمچەماڵە لە لیوای کەرکوك، یەکێك بوو لە ئەفسەرە دیارەکانی نێو سوپای عێراقی، کودەتایەکی لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٦ ئەنجامدا، بەڵام زۆری نەبرد لە ساڵی ١٩٣٧ کوژرا. مير بصري، اعلام الكرد، ص٢٠٠.

(٣) - رجاء حسين الخطاب، تأسيس الجيش العراقي و تطور دوره السياسي من ١٩٢١ — ١٩٤١، بغداد(د.ت)، ص٤٨٧.

(٤) - عبدالمجيد كامل، م.س،ص ١٨٤.

(٥) - عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات ...،ج١، ص ٢٥٠" مەهدی محەمەد، هەولێرو کێشەی...،ل ل ١٨٥-١٨٦.

(٦) - العراق "جريدة"، ع(٨٩٧ )، ٢٧ نيسان ١٩٢٣"ع(٩١٤)،١٧ ايار ١٩٢٣.

هاوكات لەگەڵ ئەوەدا بەریتانییەكان بۆ لادانــی لەمپــەرەكانی بــەردەمیان، سیاســەتی تووندوتیژی و پەراوێزخســتن و دوورخســتنەوەیان بەرامبــەر ئــەو كەســایەتییانەی هــەولێر بەكاردەهێنا، كە لایەنگری تورك بــوون. لــەو چوارچــێوەیەدا (ئەحمــەد پاشــای دزەیــی) و (پیرداود ئاغای دزەیی) قۆڵبەستكران و دواتر بۆ فەڵەستین دوورخرانەوە[1]، دیارە ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە شارەكە لەلایەن سەرووی خــۆی دەســتی واڵاكرابــوو، بــۆ گرتنەبــەری ڕێوشوێنی لەم شێوەیە[2].

لەگەڵ گەیشتنی لیژنەی كۆمەڵەی گەلان بۆ شاری موسڵ لە (٢٧)ی كانوونی دووەمــی ١٩٢٥دا[3]، بەپەلــە و بــەبێ هــیچ ئاگەداركردنەوەیــەكی پێشــینە فڕۆكەیــەكی بــەریتانی لەبەغداوە هاتە هەولێر و دەستبەجێ (كاپتن لاین)ی لەگەڵ خۆیدا بۆ كەركووك و لەوێشەوە بۆ بەغدا برد. ئەوەش بۆ ئەوەی دوایین پێشهاتەكان و گرتنەبەری ڕێوشــوێنی پێویســت لــە هەولێر لەگەڵیدا تاوتوێ بكرێــت. دوای گەیشــتنی دەســتبەجێ لەگــەڵ (برنــارد لــویس)ی یاریدەدەری نوێنەری باڵا، كۆبووە و پوختەی دوایین پێشهات و هەلومەرجەكان خرانــە بــەر گفتوگۆ. لە دیدارەكەدا ئەو هێڵە گشتییانە بۆ (لاین) شیكرانەوە، كــە پێویســت بــوو لــە كاتی هاتنی لیژنەكە بۆ هەولێر كاریان لەسەر بكات. بڕیــار بــوو (لایــن) لــە چوارچــێوەی سەردانەكەی بۆ بەغدا چاوی بە (هێنری دۆبس)یش بكەوێت، بــەڵام بــە هــۆی هەســتیاری ڕەوشەكە، (دۆبس) ئەو كات بە مەبەستی دیدەنیكردنی لیژنــەی كۆمەڵــەی گــەلان، خــۆی گەیاندبووە شاری مــوسڵ[4].

بۆ ئاسانكاری لە ڕاپەڕانــدنی كارەكانیــان لیژنــەی كۆمەڵــەی گــەلان چــەند تیمێكیــان پێكهێنا، بۆ ئەوەی هەریەكەیان سەردانی ناوچەیەك بكات[5]. ئەوەی جێی سەرنجە نوێنەری تایبەتی حكوومەتی عێراق لە لیژنەكە (سەبیح نەشئەت)ی ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنــەران

(١) - كاپتن لاین، س.پ، ل ل ٩٣ — ٩٥.

(٢) - عوسمان عەلی، چەند لێكۆڵینەوەیەك...، ل ٢١٦ .

(٣) - سیسیل ئیدمۆندس، س.پ، ل ٤٧٨.

(٤) - كاپتن لاین، س.پ، ل ١٦٩ .

(٥) - سروە اسعد، كوردستان من بداية...،ص ٣٠٠.

عێراق بوو، کە کوردێکی شاری هەولێر بوو[1] و ئەو تیمەی تایبەت بوو بە هەولێر پێکهاتبوو لە (کۆنت تیلکی) و (کرامز)ی وەرگێڕی هۆڵەندی و نوێنەری تورکیاش پێکهاتبوو لە (نازم بەگ) و (جەواد پاشا)ی پشکێنەری گشتیی سوپای تورکیا لە ناوچەی دیاربەکر[2]. هەروەها لەگەڵ گەیشتنیان بۆ هەولێر، (کاپتن لاین) هەماهەنگی و یاوەری ئەو تیمەی دەکرد[3]، جگە لەمە چەند لێژنەیەکی دیکە بۆ ناوچەکانی دیکەی ویلایەتی موسڵ پێکهێنران[4].

دوای ئەوەی (لاین) بۆ هەولێر گەڕایەوە، دەستی بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست کرد، هەروەها دەبووایە شوێنی حەوانەوە بۆ ئەندامانی شاندەکە دابین بکات، لەگەڵ دەستەبەری سەلامەتی گیانیان لە بەرامبەر هەر دەستدرێژییەك. ئەوە لە کاتێکدا دەبووایە ئاسانکاری بۆ شاندەکە بکات، بۆ ئەوەی چاویان بەم خەڵکانە بکەوێت، کە بڕیار بوو لە چوارچێوەی ڕاپرسیەکە دیدەنیان بکرێت و بۆچوونیان وەربگرن[5].

لە لایەکی دیکەدا هەر لە چوارچێوەی هەوڵەکان، بەر لە گەیشتنی لێژنەکە، (ئیدمۆندس) خۆی گەیاندە هەولێر و لەگەڵ هەریەك لە (کاپتن لاین) و (ئەحمەد عوسمان) کۆبووە و تەواوی ئەو ڕێوشوێنانەی بۆ خستنەڕوو، کە دەبووایە بۆ مسۆگەرکردنی دەنگی دانیشتووانی هەولێر بیگرنەبەر[6]. دیارە چالاکیی و بزاوتی تورك لە شارەکە مەترسیی ئەوەی لە لا گەلاڵە کردبوون، کە ڕەنگبێت ڕەوشەکە بە ئاراستە و ویستی ئەوان هەڵنەکا.

لە لایەکی دیکەوە، پێش گەیشتنی لێژنە دەستەیەك لە ئەفسەرانی کۆشکی پاشایەتی بەجلی مەدەنییەوە ڕەوانەی هەولێر کرابوون و خۆیان خزاندبووە شارەکە، بۆ ئەوەی هانی دانیشتووانی هەولێر و دەوروبەری بدەن، تاوەکو دەنگ بۆ چوونە پاڵ عێراق بدەن. تەنانەت

---

(١) - جرجيس فتح الله،م.س،ص ٤٤٨.

(٢) - خليل الاتروشي،م.س، ص ١٠٧.

(٣) - سیسل ئیدمۆندس، س.پ، ل ٤٨٨.

(٤) - بڕوانە: ئاکۆ شوانی، س.پ، ل٢٠٧" پشکۆ ئاغجەلەری، س.پ، ل٢٧٨، سروه اسعد، كوردستان من بداية... ص ٣٠٠.

(٥) - کاپتن لاین، س.پ، ل١٧٠ .

(٦) - سیسل ئیدمۆندس، س.پ، ل ٤٨٨.

ئەوەشیان نەشاردەوە، کە هاتوون بۆ ئەوەی لەگەڵ گەیشتنی شاندی تورك بۆ شارەکە تف لە نێوچەوانی نوێنەرانی تورك بکەن، کە ئەندام و یاوەری لیژنەکە بوون. بەڵام بەهەرچەشنێك بێت تواندرا ڕازی بکرێن شارەکە بەجێبهێلن، بۆ ئەوەی کێشەو گرفت لە بەردەم کارەکان دروست نەبێت[1].

لەگەڵ نزیك بوونەوەی لیژنەکە، هەر یەك لە (کاپتن لاین) و(ئەحمەد عوسمان) و (چارلس لیتلدیل) بۆ ناوچەی (گوێڕ) لە نزیك (زێی گەورە) بەرەو پیریان چوون و پێشوازیان لە (کۆنت تیلکی) و شاندی یاوەری کرد[2]، (ئیدمۆندس)، کە ئەوکاتە یاوەری شاندەکە بوو، بەم شێوەیە گوزارشت لە هاتنی لیژنەکە بۆ ناو شاری هەولێر دەکات:

**"شوێن دانانی کارەکانی لیوای هەولێر لەم بارەیەوە بە ڕادەیەك بوو، کاتێك دوای نیوەڕۆ لەگەڵ (پاولس) و (پرتالس) بە بازاڕو گەڕەکێکی سەر قەڵای هەولێردا دەڕۆیشتین، لەگەڵ بێدەنگییەکی نائاسایی ڕووبەڕو بووینەوە، دوکاندارو وەستای کارەکان سەریان بە کارەکانیان قاڵ بوو، کاتی ئەوەیان نەبوو سەربەرز بکەنەوەو نرخی ئەو شتانە ڕابگێنن، کە سەرنجی میوانەکانیان ڕاکێشابوو، بە دژواریش چاویان لەسەرکارو ئیش و قوماشەکانیان هەڵنەدەگرت"[3].**

دوای ئەنجامدانی کۆبوونەوەیەك، خشتە و بنەماکانی کار لە لایەن لیژنەکە دارێژرا، هەروەها دەبوو (تیلکی) لیستێکی ناوی پیاوماقوڵان و سەرۆك هۆزەکانی لە هەردوولا وەربگرتبایە و بەراوردی یەکتر بکرابوونایە و وادەی چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دیاری بکرابووایە، دیارە هەردوو ڕاوێژکارەکەی (تورکی و بەریتانی) لە میانەی ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە لە ئامادەبوون سەرپشك کرابوون، بەڵام کاتێك دەگەیشتە ئەو پرسیارەی، کە ئاخۆ کام حکوومەت هەڵدەبژێرن و پێیان باشە، دەبووایە نوێنەری هەردوولا پاشەکشەیان بکردبایە و وەڵامەکەش بە نهێنی بووایە[4].

---

(١) - کاپتن لاین، س.پ، ل١٧٠ .

(٢) - هـ.س،ل١٧٢.

(٣) - ئیدمۆندس، س.پ،ل٤٩٠.

(٤) - کاپتن لاین، س.پ، ل ل ١٧٣-١٧٤ .

لێژنەکە چەند پرسیارێکی لەوکەسانە دەکرد، کە بۆ ڕاپرسییەکە ئامادەکرابوون، لەوانە: ئایا دەخوازیت لەگەڵ عێراق بیت، یاخود تورکیا؟، بۆچوونت لە هەمبەر ئینتیداب (ماندات)ی بەریتانیا چییە؟ هەڵوێستت سەبارەت پەیماننامەی (عێراق — بەریتانی) چییە؟[1]، بێگومان لێرەدا بەدیار دەکەوێ کە لێژنەکە بە هیچ شێوەیەك خواستی ڕاستەقینەی دانیشتووانی بە هەند هەڵنەگرتبوو، بۆیە مەسەلەی سەربەخۆیی هەرێمەکە بە لایەنی کەم وەك ئەگەری سێیەم لە ئارادا نەبوو.

سەرۆکی لێژنەکە هەر لە سەرەتا ئەوەی پێشاندا کە ئازاد و سەرپشکە لە هەر کات و ساتێك سەردانی هەر شوێنێك بکات، کە خۆی مەبەستی بێت، لەوێ دیدەنی خەڵك بکات، لە لایەن (کاپتن لاین)ەوەش هۆیەکانی گواستنەوە و پاسەوانی کردنیان بە مەبەستی فەراهەمکردنی سەلامەتی گیانیان دەستەبەر کرابوو[2].

نوێنەری هەردوو لایەنی تورکی و بەریتانی لە هەولێر کەوتنە دەمەقاڵێ و مشتومڕی یەکتر، نوێنەری تورکیا هەولێریان بە بەشێکی دانەبڕاوی تورکیا وێنادەکرد و بە شارێکی تورکمانیان دادەنا. بۆ بەڵگەی قسەکانیان پێداگیریان لەسەر ئەوە دەکرد، کە تەنانەت بەریتانییەکان لە هەڵسوڕاندنی کارەکانیان لە هەولێر نووسراوەکانیان بە تورکی دەنووسی و بڵاودەکردەوە[3]. لێژنەکە ئەو کاتە داوای پێدانی بەڵگەی ڕووتی کرد، بەڵام لایەنی تورکیا نەیان توانی ئەو کارە ئەنجام بدەن، هەر بۆیە لێژنەکە نەیتوانی ئەو بۆچوونەی تورکیا لە ڕاپۆرتەکە جێگیر بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێژنەکە ئاماژەی داوە" کە هەندێك بنەماڵەی ناسراوی شارەکە لە ماڵەوە بە زمانی تورکی قسەو ئاخاوتن دەکەن[4]. لێرەدا دەبێ بڵێین لەبەر ئەوەی بۆ ماوەی چەند سەدەیەك دەسەڵاتی عوسمانی لەشارەکەدا هەبوونی هەبووە و زمانی فەرمی سەرجەم دامەزراوەکان و خوێندن و نووسین تورکی بووە، بۆیە مەسەلەیەکی ئاساییە، کە لە لایەن هەندێ بنەماڵە و لە هەندێ شوێن بەم زمانە قسە

---

(1) - League of Nation,Questions of The Frontier Between Turky And Iraq, Report Submitted to The Conucil By TheCommission Instituted By The Resolution of September,30th, 1924,PP6 -9.

(٢) - کاپتن لاین، س.پ، ل١٧٤.

(٣) - د.فاضل حسين، س.پ، ل ١٣٨.

(٤) - هـ.س، ل ١٣.

بکرێت، لە کاتێکدا زمان و ڕەگەزی زۆرینەی دانیشتووان کوردی بوو[١] . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نکۆڵی کردن لە بوونی تورکمان لە شارەکە، شتێکە لەگەڵ راستی ڕێ ناکا.

(تیلکی) داوای لە هەردوو لایەن کرد، لیستەکانیان پێشکەش بکەن، بۆ ئەوەی نوێنەری خۆیان لە سەرجەم پێکهاتەکان دەستنیشان بکەن، تاوەکو بۆچوونەکانیان وەربگرن. بەڵام ئەوەی بەدی دەکرێت، تورکەکان نەیانتوانی هیچ نوێنەرێك لە مەسیحی و جوولەکەکان بۆ خۆیان دەستنیشان بکەن، لەکاتێکدا بەریتانییەکان توانیبوویان ئەو لایەنە بۆ خۆیان فەراهەم و مسۆگەر بکەن، ئەوەش خاڵێکی لەنگی بوو بۆ تورکەکان، وەك ئەوەی (لاین)باسی لێوە دەکات[٢]، بێگومان ئەوەش شتێکی ئاساییە، کە مەسیحی و جوولەکەکان دەنگ بۆ لایەنی بەریتانی و دەوڵەتی عێراق بدەن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەش تورکەکان لە شارەکەدا پێنج کەسیان وەك نوێنەرانی خۆیان دەستنیشان کرد، بۆ ئەوەی لێژنەکە دیدەنیان بکات و بۆچوونیان وەربگرێت[٣]. لەو ماوەیەی لێژنەکە لە هەولێر بوو، نوێنەری تورك لە لێژنەکە چۆتە ناوچەکانی دەوروبەری هەولێر و بە ناو خەڵکدا سووڕاوەتەوە، هانی دانیشتووانی داوە دەنگ بۆ بەرژەوەندیی تورکیا بدەن[٤].

لە کاتێکدا بەریتانییەکان بە (ئەحمەد عوسمان)ەوە تەواوی هەوڵەکانییان خستبووە گەڕ، بەردەوام لەگەڵ پیاو ماقووڵ و سەرۆك هۆزەکان کۆدەبوونەوە و دیداریان لەگەڵ سازدەدان و داوای دەنگدانیان بۆ چوونە پاڵ عێراق لێ دەکردن[٥]. (ئەحمەد عوسمان) و خانەوادەکەی زۆر بە توندی دژی گەڕانەوەی تورك بوون، چونکە ئەوەیان باش دەزانی، کە بە گەڕانەوەی تورك بۆ ناوچەکە چارەنووسێکی خراپ چاوەڕوانی دەکردن، هەروەکو خودی (ئەحمەد عوسمان) لە کاتی هاتنی (وڵسن) بۆ هەولێر لە ساڵی ١٩٢٠ باسی ئەوەی کردبوو[٦].

---

(١) - بگەڕێوە بۆ بەشی یەکەم، تەوەرەی یەکەم لەم نامەیە.

(٢) - کورد عەرەب ....، ل١٧٤.

(٣) - د.فاضل حسين، س.پ. ل ١٣٩.

(٤) - کاپتن لاین، س.پ، ل١٧٤

(٥) - هـ.س، ل١٧٤.

(٦) - دبليو هي، م.س،ج٢، ص ص ١٥١- ١٥٠ .

هەروەها ئەوەشیان لەبەرچاو بوو، کاتێك عوسمانییەکان گەڕابوونەوە هەندێك ناوچە، کە پێشتر بەریتانییەکان داگیریان کردبوو، ئەو کەسانەیان لە سێدارە دابوو، کە هاوکاری هێزەکانی بەریتانیایان کردبوو[1].

هەر بۆیە (ئەحمەد عوسمان) ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لەم هەڵمەتانە و جگە لەمەش ئەو کات نووسراوی نهێنی لەناو پیاوماقوڵان و ڕیشسپی و سەرۆك هۆزەکانی هەولێر و دەوروبەری بڵاوکردەوە، تیایدا چۆنییەتی ئەنجامدانی ڕاپرسیەکەی بۆ ڕوون کردنەوە، هەڵبژاردنی وەڵامی ڕاستی بۆ دەوڵەتی عێراق ئاماژە پێدابوو. ئەو کارانەی (ئەحمەد عوسمان) لە لایەن (ڕەشید بەگ)ی نوێنەری حکوومەتی تورکیا لە کۆمەڵەی گەلان لە (٢٣)ی ئەیلولی ١٩٢٥ لەمیانەی تاوتوێکردنی ڕاپۆرتی لێژنەکە ڕەخنەی توندی لێگیرا و بە بەشێکی پێشێلکارییەکانی ئەنجامدانی ڕاپرسییەکەی وەسفکرد[2]. (کاپتن لاین) لەبارەی جموجووڵی (ئەحمەد عوسمان) نووسیویەتی:

**"ئەو کارە بۆ من و (چارڵس لیتلدیل ) چێژ وخۆشییەکی گەورەی تێدابوو، بۆ ئەحمەد [ئەحمەد عوسمان: تۆێژەر] زۆر گرنگ بوو، چونکە گرە و لەسەر وڵاتەکەی دەکرا، ئەگەر ئێمە گەمەکەمان بدۆڕاندبایە، ئەگەری ژیان و بەردەوامی ئەویش زۆر لاواز دەبوو"[3].**

(مەلافەندی)یش لە لایەن خۆیەوە تەواوی قورسایی خۆی بەگەڕ خستبوو و بێگومان ناودارێکی لەم شێوەیە کاریگەری زۆری بۆ سەر سەرۆك هۆز و پیاوماقوڵانی هەولێر هەبوو[4]. ناوبراو لەم ماوەیدا بەردەوام لەگەڵ پیاوماقوڵان کۆدەبووەو هانی دەدان، بۆ ئەوەی دەنگ بۆچوونە پاڵ عێراق بدەن[5]. (مەلافەندی) لەمیانەی دانیشتن و کۆبوونەوەکانیدا ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون دەکردەوە، ئەگەر دەنگ بۆ تورکیا بدەین و بدرێینە پاڵی، ئەوا بێ گومان سەردانیکردنی مەنزڵگا و شوێنە پیرۆزەکانی عێراق کارێکی زۆر

---

(١) - کاپتن لاین، س.پ، ل ١٧٠.

(٢) - مەهدی محەمەد، هەولێرو کێشەی موسڵ ١٩٢٥، مێژوو"گۆڤار"، ژ(٤)ی پایزی ٢٠٠٧، ل ١٩٢.

(٣) - کورد عەرەب...، ل١٧٠.

(٤) - هـ.س، ل ١٧١" فتى العراق" جريدة"،ع (٥٤٥-٥٤٤)، الخميس ١١شباط ١٩٤٣، ص ٤.

(٥) -جەلال خدر، س.پ.

زەحمەت و دژوار دەبێت، لەوانەش مەنزڵگای (شێخ عەبدولقادری گەیلانی). هەروەها ئاماژەی بەوە دەدا، کە هەڵس و کەوتکردن لەگەڵ تورك کارێکی ئەستەمە و دژوارە[1]. هەروەها ئەوەشی دەخستەڕوو، کە ئەگەر پایتەختەکە ئەستەنبۆڵ، یاخود ئەنقەرە بێت، ئەوا دوورە دەستە، بەڵام ئەگەر بە عێراق بلکێنرێن، ئەوا بەغدا پایتەختیان دەبێت، ئەویش بۆ هاتوچۆی بازرگانی نزیکتر و خۆشترە[2]. سەرباری ئەوانە بەریتانییەکان پیاوماقوڵانی شارەکەیان هاندەدا، بێنە بەردەم لیژنەکە و نارەزایی خۆیان لە دژی تورکیا پێشان بدەن[3].

حکوومەتی عێراق پێ بەپێ لەگەڵ هەنگاوی لیژنەکە بوو، هەربۆیە لەوکاتەی لیژنەکە لە هەولێر بوو، وەزیری ناوخۆی عێراق بە نووسراوێکی نهێنی داوای لە (عەبدولعەزیز قەساب)ی موتەسەڕیفی موسڵ کرد، پەیوەندی بە (ئەحمەد عوسمان) بکات و لە دوایین پێشهاتەکان ئاگەداریان بکەنەوە[4]. ئەوە لە کاتێکدا (سەبیح نەشئەت)ی نوێنەری حکوومەتی عێراق لە بروسکەیەکی نهێنی کە لە (١٦)ی شوباتی ١٩٢٥ بەرزی کردەوە، بەغدای دڵنیاکردەوە کە ناوچەکە هەر لەچوارچێوەی عێراق دەمێنێتەوە[5].

بە شێوەیەکی گشتیی دەتوانین هەڵوێستی هەولێر سەبارەت بەم پرسە بەم شێوەیە دابەش بکەین: هەندێکیان لەگەڵ چوونە پاڵ دەوڵەتی تورکیا بوون، بەتایبەتی بەشێك لە پیاوانی ئاینی و هەندێك لەو کەسایەتیانەی، لەژێر کاریگەری پێشووی فەرمانڕەوایەتی عوسمانییەکان بوون[6]. بێگومان ئەوانە بەرژەوەندیی پێشدیکەیان لەگەڵ دەوڵەتی

---

(١) - چاوپێکەوتن لەگەڵ کەنعان موفتی.

(٢) - کەریم شارەزا، کەریم شارەزا، هەولێر و دەنگدانی بۆ مەلیکایەتی مەلیك فەیسەڵ و ویلایەتی موسڵ، بارش "گۆڤار"، ژ(١٧)، تموز ٢٠٠٤، ل ١٢٩.

(٣) - د.عوسمان عەلی، س.پ، ل ٢١٦.

(٤) - مەهدی محەمەد، هەولێر و کێشەی موسڵ ...، ل٤٢.

(٥)- د.ك.و، ملفات البلاط الملكي، اضبارة مشكلة الموصل، تسلسل ٩١٢ وع، ١/٤/٥، برقية من كركوك في ٤ شباط ١٩٢٥، من صبيح نشأت الى رئيس الوزراء، محرم للغاية، مرفق بكتاب سري للغاية رقم٣/٤٦٥ في ١٦ شباط ١٩٢٥.

(٦) - د.فاضل حسين، س.پ، ل ٣٤٠ .

عوسمانیدا هەبوو، لەوانە (عەلی پاشای دۆغرەمەچی)[1]. ئـەوەتا سـەرۆکی لیژنـەی بـالآی کیشەی موسڵ (ی. ف. ڤیرسن) لە یاداشتەکەیدا، کـە بـۆ ئەنجوومـەنی کۆمـەڵی گـەلان بەرزی کردەوە ئاماژەیداوە کە ناو شاری هەولیر زۆرینەیان لەگەڵ چوونە پاڵ تـورك بـوون، بەشێکی دیکەیان لەگەڵ چوونە پاڵ عیراق بوون، بەڵام زۆرینەیان فەرمانڕەوایەتی تورکیان لە عەرەب بە باشتر دەزانی[2]. بەشێك لەوانەی، کە لەگەڵ چوونەپاڵ عیراق بـوون، بـەهۆی ئەوەبوو، کە ئەو کات عیراق لەژیر دەسەڵاتی بەریتانیادا بوو، گوایە ئومیدیکی زیاتر هەیە بۆ سەربەخۆیی لە دوا ڕۆژدا ، هەندیکیان بریتی بـوون لـە: (ئەحمـەد عوسمـان) و (مـەلا فەندی) و (خورشید ئاغا) و (حوسینی مەلا)[3]. (خدری پاشای دزەیی) یەکیکی دیکەبوو لەوانەی پشتگیری لە چوونە پاڵ عیراق کرد، لە کاتی ڕاپرسیەکە دەڵیت:

**"ئیمە لەگەڵ هەڵڕژان و ڕێڕەوی دوو ڕووبارکەی دیجلە و فوراتین و بەرەو خوار دەڕۆین، چونکە ئەو دوو ڕووبارە لە ولاتی کوردان هەڵدەقولین و بەرەو باشوور دەڕۆن"[4].**

جگە لە وانەی سـەروو، خـەڵکی بازرگـان و خـاوەن مولکـەکان، زیـاتر ئەوانـەی لـە ژیـر کاریگەری سوود و قازانجی ئابووری دابوون، لەگـەڵ چـوونە پـاڵ عیـراق بـوون[5]. بـەڵام وەکـو دەردەکەوێ، بەشێکی دیکە لە خەڵکی ڕەش و ڕووت و کەم دەرامەت و کاسـبکار، بـێ دەنـگ بوون و هەڵویستیان نەبوو، تەنانەت گرنگی ئەوتۆیان بە هاتنی لیژنەکە بۆ شارکە نەدا[6].

---

(١) - چاوپیکەوتن لەگەڵ حاجی نورەدین دەباغ.

(٢) - ی.ف.فیرسین، م.س، وەرگیراوە لە: جرجیس فتح الله،م.س، ص ٣٧٩.

(٣) - ئەمە بۆچوونی (ئیحسان موفتی)یە، بڕوانە: بەدرخان "مانگنامـە"، چـاوپێکەوتن لەگـەڵ ئیحسـان موفتی، ژ(٨٨)، ٢٢-١٢-٢٠٠٧. بەڵام هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نییە کە ناوبراوان بـەم شـێوەیە بیریـان کردبیتەوە.

(٤)- کەریم شارەزا، پیاوی ئازاو بەجەرگی دزەییان خدری احمد پاشا ١٨٨٠ -١٩٨٦،هەولیر"گۆڤار"،ژ (٤)، پایزی ١٩٩٩، ل٩٤.

(٥) - د.فاضل حسین، س.پ، ل ٣٤٠ .

(٦) - سیسیل ئیدمۆندس، س.پ، ل٤٨٨.

لەگەڵ ئەوەشدا سەرکوتکردنی شۆڕشی (شێخ سەعیدی پیران)[1] لە باکووری کوردستان بەو پەڕی توونددوتیژیی لە لایەن حکوومەتی تورکیا، ئاوارەبوونی ژمارەیەك لە کوردی ئەو ناوچانە بۆ باشووری کوردستان و گێڕانەوەی سیاسەتی توونددی کەمالییەکان بۆ دانیشتووانی ناوچەکە، هەڵوەشاندنەوەی خیلافەت و ڕاگەیاندنی ڕژێمی کۆماری لە تورکیا، هەموو ئەوانە بە جۆرێك لە جۆرەکان کاریگەری لەسەر کەمکردنەوەی لایەنگرانی تورك هەبوو لە باشووری کوردستان و بووە هۆی ئەوەی لە چارەسەری کێشەی موسڵ بە خراپ بەسەر لایەنی تورکیدا بشکێتەوە، بێگومان ئەوەش بە قازانجی لایەنی بەریتانی شکایەوە[2].

(ڕەفیق حیلمی) سەبارەت بە هەڵوێستی هەولێر باس لەوە دەکات، کە بەشێك لە دانیشتووانی هەولێر داوای یەکبوونیان لەگەڵ عێراق دەکرد. لە هەمان کاتدا داوای ئیدارەییەکی خودموختاری گەورەیان دەکرد[3]. هەرچی ئەندامانی هەولێر بوو، لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق، ئەوانیش زۆرینەی‌ان لەگەڵ چوونە پاڵ عێراق بوون[4].

سەبارەت بە هۆزەکانیش، ئەوا بەشێك لە هۆزی دزەیی پشتگیریەکی بەرچاویان بۆ چوونە پاڵ عێراق دەربڕی و لە سەروبەندی هاتنی لیژنەکە لە کاتی دیداریان لەگەڵ سەرۆکی لیژنەکە، گەڕانەوەی فەرمانڕەوایەتی تورکیایان بۆ شارەکە ڕەتکردەوە و دەنگیان بۆ چوونە پاڵ عێراق دا[5]. هەروەها زۆرینەی هۆزەکانی دەوروبەری هەولێر لەگەڵ چوونە پاڵ عێراق بوون، کە ئەوەش لە ڕووپەڕی ڕۆژنامەکانی ئەو کاتی بەغدا و سلێمانی ڕەنگی داوەتەوە[6].

---

(١) - لەبارەی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران بڕوانە: ڕوبەرت ئۆڵسن، شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران، و: ئەبوبەکر خۆشناو، دەزگای پەخشی سەردەم، سلێمانی ،١٩٩٩.

(٢) - د.عوسمان عەلی، چەند لێکۆڵینەوەیەك....ل ٢١٧.

(٣) - خلاصەی مسئلەی کورد، موصل، ١٩٣٤، ل ١٩.

(٤) - جعفر الحيالي، قضية الموصل و صداها في الاوساط العراقية، دراسات تاريخية(مجلة)، ع(٢٢)، دمشق، السنة السابعة ١٩٨٦، ص ٢٤١.

(٥) - العراق"جريدة"ع (١٤٥٨)، الخميس ١٩ شباط ١٩٢٥.

(٦) - العراق"جريدة"ع(١٤٥٨)، الخميس ١٩ شباط ١٩٢٥" ع(١٤٥٩)، الخميس ٢٠ شباط ١٩٢٥" ژیانەوە" ڕۆژنامە"، ژ(١٩)ی ساڵی یەکەم ٢ی مارتی ١٩٢٥.

بەشێکی دیکەش هەڵگری بیرۆکەی سەربەخۆیی بوون لەژێر چاودێری بەریتانیا، وەك سەرچاوەیەك باسی دەکات (عەلی مەحمود کاکەخان)[1]ی ئاغای دزەیی و (حوسێن حەتکی زێد بەگی). لەو کۆوبونەوەیدا، کە لەسەر قەلات ئەنجامدرا، ئەو بیرۆکە و داوایەیان خستەڕوو، بەڵام هیچ شتێکی ئەوتۆی لێ سەوز نەبوو[2]. لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنە لە شێوازی ئەنجامدانی ڕاپرسیەکە گیراو داواکرا هەڵبژاردنی سێیەمیش زیاد بکرێت و بگودیکەیت: دەتانەوێت لەگەڵ عێراق بن، یاخود تورکیا، وەیان سەربەخۆ بژین؟ بەڵام لیژنەکە پێداگیریان لەسەر ئەوە کردەوە، کە تەنیا دەتوانن چوونە پاڵ تورکیا، یاخود عێراق هەڵبژێرن[3].

لە لایەکی دیکەدا (مەلا محەمەدی کۆیە) کە دێتە هەولێر و لیژنەکە پرسیاری لێ دەکات تورکتان؟ دەوێت یاخود عێراق؟ ناڕەزایی لەم شێوە پرسیارە دەردەبڕێ و دەڵێت: **"من بەم چەشنە پرسیارەکەتان وەڵام نادەمەوە، خۆ کورد کچ نییە بە مێردی بدەن، دەپرسن تورکتان؟ دەوێت یاخود عارەب"**. ئەوانیش دەڵێن باشە پرسیارەکە چۆن بکەین، ئەوەیش دەڵێت: **"بلێن دەتانەوێ لەگەڵ تورك بە برایەتی لەگەڵ کۆماری تورکیا بژین، یاخود بە برایەتی لەگەڵ عارەب لە عێراقدا بژین؟ چونکە کوردیش وەك ئەوان نەتەوەیە، وەك ئەوان مافی هەیە لە وڵاتێکدا بژین بە شێوەیەکی برایەتی، نەك بەشێوەی ژن و مێردایەتی"**. هەربۆیە سەرۆکی لیژنەکە داوای لێبوردنی لێ کرد. بەم شێوەی (مەلا محەمەد) ئاماژەی بۆ دابوو پرسیاری لێ کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناوبراو لە کۆیە یەکێك

---

(١) - عەلی مەحمود کاکەخان، عەلی ئاغای کوڕی مەحمود ئاغای کاکەخانی کوڕی سمایلائاغای کوڕی کاکەخانی گەورەیە، لە ساڵی ١٨٩٩ لە گوندی (گرد مەلا)ی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی شاری هەولێر لە دایك بووە، جگە لە پەیوەندی لەگەڵ شێخ مەحمود دواتر پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ بزووتنەوەکانی بارزان و مەلا مستەفا بارزانی و شۆڕشی ئەیلول هەبووە. کەریم شارەزا، لەیادی کورد پەروەرێکی لەبیرکراودا عەلی مەحمود کاکە خانی دزەیی، برایەتی "رۆژنامە" ژ( ٢٦٦٧)، هەولێر، پێنج شەممە ١٩٩٨/٩/١٠.

(٢) - چاوپێکەوتن لەگەڵ جەلال خدر.

(٣) - کەریم شارەزا، هەولێرو دەنگدانی ...، ل ١٢٩.

بوو لەو کەسایەتییانەی کە پشتگیری لە لکاندنی کوردستانی باشوور بە عێراقەوە دەکرد[1].

هەر لەو کاتەی لێژنەکە لە هەولێر بوو، ژمارەیەك لە کەسایەتییەکانی کۆیە بروسکەیان ئاراستەی لێژنەکە کرد، لە بەشێکیدا هاتبوو:

**"ئێمە ژیانی ئابووری و بازرگانی، بەڵکو سروشتیمان بە عێراقەوە پەیوەستە، هەربۆیە ئێمە لە عێراقن لەگەڵ عێراقن و ژیانمان لەگەڵ ژیانی عێراقە ... بە گیان لەگەڵ عێراقن"**[2]. بێگومان ئەوانە بە ئاشکرا بە دیاریان خستووە، کە بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ چوونە پاڵ عێراق بوون. لەگەڵ ئەوەشدا لێتۆژێك پێیوایە زۆرینەی خەڵکی کۆیە ئارەزوویان لەگەڵ پێکهێنانی قەوارەیەکی کوردی سەربەخۆ بووە[3]. واتە بۆ چوونیان لە بۆچوونی سلێمانی نزیکتربوو. هەرچی ڕەواندزە، دیارە بەشێکی دانیشتووانی ئەوێش لەگەڵ چوونە پاڵ عێراق بوون، بۆیە بروسکەیەکیان ئاراستەی لێژنەکە کرد تیایدا ئاماژەیاندا: ئەوان بەیعەتیان بە نەوەی پێغەمبەر داوە و چارەنووسیان لەگەڵ عێراق گرێداوە، ئامادەیی خۆشیان بۆ ڕووبەڕووبونەوەو بەرگریکردن لە ناوچەکەیان پیشاندا، لە بەرامبەر هەر دەستدرێژییەك کە تورك بیکاتە سەرناوچەکەیان[4].

لە چوارچێوەی گەڕان بە ناوچەکانی لیوای هەولێر، لێژنەکە (شەقلاوە)یان بە خۆشدیکەی ن ناوچە دانا، کە سەردانیان کردبێت، لەوێ چوونەماڵی (میرانی قادر بەگ)،

---

(١) - عبدالخالق علاءالدين، مەلای گەورە/ زانا و ئەدیب و شاعیر، چ١، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر، ١٩٩٤، ل ل ٢٩ - ٢٨.

(٢) - دیاردیکەی ن ئەو کەسانەی ئەم بروسکەیان واژو کردووە، بریتی بوونە لە: (محەمەد تۆفیق)، (محەمەد سالح)، (جەمیل) و (احمد) لە پیاوماقوڵان، (ئەمین) و (تۆفیق) و (مەحمود و (عەلی) لە بازرگانان و هەندێ لە سەرۆك هۆزەکانی ناوچەکە. الاستقلال"جريدة"، بغداد، ١٦ شباط ١٩٢٥. وەرگیراوە لە: عبدالامير العكام، م.س، ص١٩٧.

(٣) - جەمال فەتحوڵلا، س.پ، ل ٦٥.

(٤) - لە وانەی واژۆیان لەسەر ئەم بروسکەیە کردووە، بریتی بوونە لە: (احمد خورشید)ی نەوەی ئاغا،(محەمەد عەلی) سەرۆکی شارەوانی، (محەمەد سەعید)و (محەمەد خورشید) لە پیاوانی ئاینی ولەگەڵ هەندێ کەسی تر. عبدالامير العكام، م.س، ص ص١٩٧ — ١٩٨" هەروەها بڕوانە: عزيز قادر الصمانجي، التاريخ السياسي لتركمان العراق، بيروت، ١٩٩٩،ص ٧٩.

لەو کاتەدا (کۆنت تیلکی) ئەوەی خستەڕوو، کە نوێنەرایەتی (٥٢) دەوڵەت دەکات بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە. لەبەرامبەردا (میرانی قادر بەگ) پرسیاری ئەوەی لێکرد ئایا لێژنەکەتان دەتوانێت چەند تفەنگ کۆبکاتەوە تاوەکو بڕیارەکەی جێبەجێ بکات. وەڵامی ئەو پرسیارە ئاسان نەبوو، چونکە کۆمەڵەی گەلان هیچ تفەنگێکی نەبوو، هەربۆیە (تیلکی) بۆ خۆدزینەوە لە وەڵامەکەی باسی لە ڕای گشتیی جیهان کرد. لەم کاتەدا (میرانی قادر بەگ) پێی گووت:

**"ئێمە تفەنگ لەبەرچاو دەگرین، چونکە بێ تفەنگ هیچ کەسێك ناتوانێت مافەکانی دەست بکەوێت"**، ئەوەش ئاماژەیەکی بێ هودەیی بوو، کە ئاراستەی کۆمەڵەی گەلانی کرد، هەروەکو (کاپتن لاین) باسی لێوە دەکات[1]. بەڵام لە ڕاستیدا بڕیاری لیژنەکە سەبارەت بەم کێشەیە بە تەواوی جێبەجێ کرا — هەروەکو دواتر دەبینین- بە تایبەتی کە لە بەرژەوەندیی وڵاتێکی زلهێزی وەك بەریتانیا دابوو.

لە کاتی مانەوەی لە شەقلاوەدا، نەخۆشی تەنگی بە (تیلکی) هەڵچنی، ئەوەش کاری سەردانەکەی کورت کردەوە[2]، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی لێژنەکە لە دێهاتەکان گرانتر بوو لەچاو شارەکان، چونکە ئەوان کەمتر لە سیاسییەت زانیارییان هەبوو[3].

دوای ئەوەی لێژنەکە هۆزە دیارەکانی ناوچەکەی بەسەرکردەوە، هەولێری بەجێهێشت[4]. هەرچەندە بە هۆی نەخۆشکەوتنی سەرۆکی لێژنەکە و زستانی ساردو ئەو بەفروبارانەی، ناوچەکەی گرتەوە نەیانتوانی سەردانی هەموو ناوچەکانی سەر بە لیوای هەولێر بکەن[5].

---

(١) - کورد عەرەب ... ، ل ١٧٧. ڕاستە کۆمەڵەی گەلان لە هەمبەر چەندین کێشەی جیهان نەیتوانی چارەسەر بدۆزێتەوە، بەڵام کێشەی موسڵی یەکلایی کردەوە.

(٢) - بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: هـ.س، ل ل ١٧٨-١٧٩ .

(٣) - ژیانەوە" ڕۆژنامە"، ژ(٥٠)،ساڵی ٢ ، ٢٦ی تشرینی دووەمی ١٩٢٥.

(٤) - هـ.س" جرجیس فتح الله، م.س، ص ص ٤٨٢ — ٤٨٣.

(٥) -د. میم کەمال ئۆڤە، س.پ، ل ٥١.

دواتر بۆ چاککردنەوەی ئەو کەموڕیانەی، لە ڕاپۆرتەکەیاندا هەبوو، دووبارە لیژنەکە بۆ ماوەیەکی کەم گەڕایەوە هەولێر[١].

دوای دوو مانگ مانەوەیان لەناوچەکە، لیژنەکە گەڕایەوە و ڕاپۆرتێکی چڕیان سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ ئامادە کرد و لە (١٦)ی تەموزی ١٩٢٥ بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵی گەلان بەرزکرایەوە، کە پێکهاتبوو لە (١١٣) لاپەڕەو چەند نەخشەیەك بە پاشکۆیەوە[٢]. دوای گفتوگۆ لەسەری لە بەردەم ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان، دواتر خرایە بەردەم دادگەی دادی نێودەوڵەتی (محكمة العدل الدولية). لە (١٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٥دا ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان بە زۆرینەی دەنگی ئەندامەکانی، ویلایەتی موسڵی بەبێ ڕەچاوکردنی خواستی راستەقینەی دانیشتووانەکەی، بە عێراقەوە لکاند و هێڵی بڕۆکسل، کە بەشێوەیەکی کاتی کێشرابوو[٣]، بە گۆڕانکاریەکی کەمەوە بووە سنووری هەمیشەیی نێوان عێراق و تورکیا[٤].

لە دوای تەواوبوونی کێشەی ویلایەتی موسڵ، (١١) ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق، کە لە ناویاندا (ئیسماعیل رەواندزی) نوێنەری هەولێر بەدی دەکرێت، پێشنیازێکیان پێشکەشکرد، بۆ ئەوەی بروسکەیەکی سوپاسگوزاری ئاراستەی وەزیری

(١) - نەوزاد عەلی احمد، کێشەی ویلایەتی موسڵ لە دوو ڕۆژنامەی سلێمانیدا، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٥٤" جرجيس فتح الله، م.س، ص ٤٨٣.

(٢) - بڕوانە دەقی راپۆرتەکە لە: League of Nation,OP.Cit.

(٣) - بەمەبەستی هێورکردنەوەی بارگرژی ناوچە سنووریەکان، لە نێوان عێراق — تورکیا هێڵێکی سنووری کاتی لە میانەی کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵەی گەلان، لە بڕۆکسلی پایتەختی بەلژیکا، لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٢٤ پەسەند کرا، کە بەهێڵی بڕۆکسل ناسرا. بشير فرجو(تعريب)،صفحة من تاريخ العراق الحديث/من سنة ١٩١٤-١٩٢٦ مذكرتان خطيران الاولى بقلم السر برسي كوكس و الثاني بقلم السر هنري دوبس،ط١، مطبعة الاتحاد الجديدة- موصل ،د.س، ص ٨٢.

(٤) - فاضل حسين، س.پ،ل ٢٧٣ . بۆ زانیاری لە بارەی کێشانی سنووری نێوان عێراق و تورکیا بڕوانە: مريم عزيز فتاح، تحليل العوامل التي رسمت الحدود العراقية التركية، رسالة ماجستير، كلية الاداب/ جامعة بغداد، بغداد، كانون الثاني ١٩٧٠. سەبارەت بە هۆکار ەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراق بڕوانە: سەلام ناوخۆش، هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عیراقی عەرەبی یەوە،چ١، هەولێر، ٢٠٠٠.

داگیرگاکانی بەریتانی بکەن، بەهۆی ئەو ڕۆڵەی سەبارەت بە لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقی لە کۆمەڵەی گەلان بینیویەتی[1].

هەروەها لە دوای یەکلاییکردنەوەی کێشەکە لە بەرژەوەندیی عێراق، ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێر ئاهەنگێکی گەورەی لە شارەکەدا سازکرد و بەم بۆنەوەیەوە چەند گوللە تۆپێکیان وەك خۆشی دەربڕین تەقاند. هەروەها ئەو تۆمارانەی شارەوانیش، کە تا ئەو کات بە زمانی تورکی دەنووسرا، لەمە بە دواوە بۆ زمانی عەرەبی گۆڕان[2].

(١) - الوقائع العراقية(جريدة)، ع(٣٥٧)،بغداد، ٢٠ شباط ١٩٢٦، ص ١.

(٢) - چاوپێکەوتن لەگەڵ د.عەبدوڵڵا حەداد. ناوبراو دەڵێت تۆمارێکی شارەوانی ساڵی ١٩٢٥ – ١٩٢٦م دیوە، نیوەی بە تورکی بوو نیوەکەی دیکە بە عەرەبی نووسراوە، چونکە تا لکاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقەوە ئەنجومەنی شارەوانەی هەولێر نووسینی تورکی بەکارهێناوە، دوای لکانی بە عێراقەوە ئەوسا زمانی عەرەبی بەکار هاتووە.

## تەوەری یەکەم

## ڕۆڵی هەولێر لە کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردی و عێراقیەکاندا

لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی، کورد وەك زۆرینەی گەلانی ناوچەکە پێی نایە قۆناغێکی نوێ، لەم چوارچێوەدا چەندین کۆمەڵە و ڕێکخراو و پارت دەرکەوتن، کە هەریەکەیان بە پێی شێوەو قەبارەکەی هەوڵی بەدیهێنانی مافەکانی گەلی کوردی دەدا و هەولێدەدا شوێن پەنجەی لە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستان دیاربێ.

حکوومەتی عێراق یاسای کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی لە (۲)ی تەموزی ساڵی ۱۹۲۲ دەرکرد[1]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەی نەدا کۆمەڵەیەکی سیاسیی کوردی دابمەزرێت. ئەگەر چی لە ماوەی نێوان (۱۹۲۲ — ۱۹۲۵)دا کوردان نەیان دەویست ئەو داوایە لە حکوومەتی عێراق بکەن، چونکە تا ئەوکات بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی هیوایان بە هەوڵەکانی (شێخ مەحمود)و بەندەکانی پەیماننامەی سیڤەر هەبوو[2] و لکاندنی کوردستانی باشووریش بە دەوڵەتی عێراق بە تەواوی ساغ نەبوو بووە.

سەرەڕای ئەوەش لە ئەنجامی سیاسەتی نادروستی حکوومەتەکانی عێراق لە هەمبەر کورد، ڕۆشنبیران و نیشتیمانپەروەرانی کورد هەوڵی دروستکردنی کۆمەڵەی نهێنیان دا، ئەوەش بە مەبەستی یەکخستن و چڕکردنەوەی هەوڵەکان بۆ دژایەتیکردنی ئەو سیاسەتانە و کارکردن بۆ هێنانەدی مافە نەتەوەییەکان[3].

بێگومان کارکردن لە ڕێکخستنە سیاسییەکان و پێکهێنانی پارت و کۆمەڵە نهێنی و ئاشکراکان، کە زۆرینەی‌ان خودان ئامانجی نەتەوەیی بوون، بەڵگەیەکە لەسەر نەشونماکردنی هۆشیاری نەتەوەیی و بیری سیاسیی لای کورد. دیارە خەباتی هەولێرییەکانیش لەم

---

(۱) - عبدالرزاق الحسني، تاريخ الاحزاب...، ص ۳۱ .

(۲) - د. عبدالفتاح البوتاني، الحياة الحزبية...، ص۳۰۰.

(۳) - خليل الاتروشي، م.س، ص ۲۰۰.

چوارچێوەیەدا بەدەر نەبوو، کە بەشداریی و ڕۆڵی بەرچاویان لەم کۆمەڵە و ڕێکخراوانە هەبوو، وەك لێرە بەدوا باسیان دەکەین:

## ا – کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییەکان:

### ١- کۆمەڵەی تەعالی کوردستان:

ئەو کۆمەڵەیە لە ساڵی ١٩١٨ لە ئەستانبول دامەزرا[١]، (عەبدولقادر شەمزینی) سەرۆك و (ئەوین عالی بەدرخان) جێگری سەرۆکی کۆمەڵەکە بوون[٢]. یەکێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکات کە دەستەی کارگێڕی ئەو کۆمەڵەیە لە سێزدە کەس پێکهاتوون، (مەلا عەلی هەولێری)[٣] یەکێکیان بوو[٤]، ئەو دەستەی دامەزراندنی

---

(١) -د.بلەج شیرگۆ، کێشەی کورد/ مێژینە و ئێستەی کورد، و: محەمەد حەمە باقی، چ٣، کوردستانی عێراق، ١٩٩١، ل ٢ " زنار سلوبي، في سبيل كوردستان (مذكرات)، بيروت ، ١٩٨٧، ص ٦١. توێژەرێکی دیکە پێیوایە لەساڵی ١٩١٧ لە ئەستەنبۆڵ دامەزراوە. د.عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات و المنظمات و الاحزاب الكوردية في نصف قرن ١٩٠٨ – ١٩٥٨،ط٢، دار سردم للطباعة والنشر، السليمانية، ٢٠٠٧، ص ٤٤. سەرچاوەکی دیکە پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە لە ١٩ تشرینی دووەمی ١٩١٧ دامەزرا، بەڵام لە ٣٠ کانوونی یەکەمی ١٩١٨ بە فەرمی لە لایەن دەستەیەك لە ڕۆشنبیر و تێکۆشەرانی کورد ڕاگەیەنرا. عەلی تەتەر، بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨ – ١٩٢٧، دەزگەهێ سپیرێز یا چاپ و وەشانێ- دهۆك ، ٢٠٠٢، ل ل ١٤٩ – ١٥٠.

(٢) - ابي علاء، لمحات عن الجمعيات الكورديه في العهد العثماني و أثر الحرب الاخيرة العالمية الاولى، التأخي "جريدة"، ع( ١٠١)، ١٠ اب ١٩٦٧.

(٣) - مەلا عەلی کوڕی (حاجی حەوێز مامە) هەولێرییە، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٨٠ لە شاری هەولێر لە دایك بووە، یەکەم جار خوێندنی ئاینی لە قەڵات خوێندووە، دواتر چووەتە بەغدا، لە چەند ناوچەیەکی باکووری کوردستان قازی بووە، لە ساڵی ١٩٣٧ مردووە. د.عەبدوڵڵا حەداد، مەلا عەلی ...، ل ل ١٢٤– ١٢٥.

(٤) - جەلال خدر، کەسایەتی شاری هەولێر عەبدولڕەزاق دەباغ زادەی قورئان خوێن و مقامزان (١٨٨٦ – ١٩٥٩)، هەولێر "گۆڤار"، ژ ( ١١) هاوینی (٢٠٠١)، ل ٧١ د.عەبدوڵڵا حەداد، مەلا عەلی ...، ل ل ١٢٤ – ١٢٥. سەبارەت بە ناوەکانی ئەندامانی دیکەی دەستەی کارگێڕی ئەم کۆمەڵەیە بڕوانە: (ژین)

کۆمەڵەش بوو[1]. هەروەها بە پێی بەڵگەنامەیەکی بەریتانی، (ئیبراهیم حەیدەری)یش یەکێك بووە لە ئەندامە دیارەکانی ئەو کۆمەڵەیە[2].

ئەو کۆمەڵەیە چالاکدیکەیەن و بەهێزدیکەیەن کۆمەڵە بوو، کە لەدوای یەکەمین جەنگی جیهانی دامەزراو[3] چەندین کارو چالاکی ئەنجام دا[4]، تەنانەت ڕۆژنامەیێکیان بەناوی (کوردستان) دەرکردووە[5]. ئەو کۆمەڵەیە تەنیا لە باکووری کوردستان **٣٦** لقی هەبووە[6]. لە ساڵی **١٩١٩** دەستەیەك لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە بە سەرۆکایەتیی (خلوس بەگ) لە ڕێگای موسڵەوە دێنە باشووری کوردستان، تا هانی دانیشتووان بدەن، بۆ یەکخستنی هەوڵ و کۆششەکان لە پێناو بەدیهێنانی سەربەخۆیی[7]. لە چوارچێوەی ئەو هەوڵانەدا، کۆمەڵە توانیوویەتی لقێك لە شاری هەولێردا بکاتەوە[8]. هەروەها لە شارەکانی بەغدا، موسڵ ، کەرکوك و سلێمانی لقی کردنەوە[9].

---

گۆڤاری کوردی — ترکی (١٩١٨ — ١٩١٩)، جلدی یەکەم، و:محەمەد ئەمین بۆز ئەرسەلان، ئۆپسالا — سوێد، کانووناپاشین ١٩٨٥، ل ٢٣.

(١) - د.عەبدوللا حەداد، مەلا عەلی ...، ل ل ١٢٤ — ١٢٥.

(٢) - د.ك.و، ملف تشكيل دولة كردية مستقلة، تقرير استخبارات هيئة الاركان البريطانية، مقر القيادة الجوية العراق، في ١١ تشرين الثاني، ١٩٢٤، ص ١.

(٣) - اسماعيل حقى شاوەيس، خەباتی گەلی کورد لە ڕۆژگارەکانی جەنگی گێتی یەکەمیندا، ڕۆژی نوێ "گۆڤار"، ژ(٦)، کانوونی یەکەم، ١٩٦٠، ل ٢٨.

(٤) - سەبارەت بەکارو چالاکییەکانی ئەم کۆمەڵەیە بڕوانە: احمد عوسمان ئەبوبەکر، کوردستان لەسەردەمی ئاشتی، ل ل ١٨٢ — ١٨٦" د.عبدالستار طاهر م،س، ص ص ٤٥ — ٤٦" عەلی تەتەر، س.پ، ل ل ١٥٤ — ١٦١.

(٥) - سروە اسعد، کوردستان منذ بداية الحرب...،ص ١٦٥.

(٦) - اسماعيل حقى شاوەيس، س.پ، ل ٤٨.

(٧) - احمد حەمەدئەمین، ڕەواندز... ، ل ١٣٤.

(٨) - د. عبدالفتاح علي البوتاني، الحياة الحزبية...، ص ٢٩٨.

(٩) - اسماعيل حقى شاوەيس، س.پ، ل ٤٨.

## ٢- كۆمەڵەی ئیستقلالی كوردستان:

كۆمەڵەی ئیستقلالی كوردستان كۆمەڵەیەكی نهێنی بوو[1]، لە ساڵی ١٩٢١ بە دەستپێشخەری میرئالای (خالد بەگی جبرانلی) سەرۆكی هۆزی جبرانلی لە (ئەرزەڕۆم) لە باكووری كوردستان دامەزرا[2]، دیاردیكەین ئەندامانی دامەزرێنەری ئەو كۆمەڵەیە ( یوسف زیاء بەگ، ئیسماعیل حەققی شاوەیس ، مولازم ئەحمەد ڕاسم شكاك و ئیحسان نوری) بوون[3].

ئەو كۆمەڵەیە بە مەبەستی ئەنجامدانی كاری سیاسیی و حزبی، كوردستانی بۆ سێ ناوچە دابەشكردبوو، یەكەمیان: باكوورو ڕۆژئاوای كوردستان، دووەم: باشووری كوردستان، سێیەم: ڕۆژهەلاتی كوردستان[4]. دەستەبەركردنی یەكڕیزی نێوان كورد و بەدیهێنانی سەربەخۆیی بە هاوكاری بەریتانییەكان یەكێك لە ئامانجە سەرەكییەكانی ئەو كۆمەڵەیە بوو[5]. شاری موسڵ مەڵبەندێكی سەرەكیی ئەو كۆمەڵەیە بوو، بەردەوام (شێخ محەمەد

---

(١) - د.ك.و، ملف تشكيل دولة كردية مستقلة ١٩٢٤- ١٩٢٦، دائرة ضابط الاستخبارات البريطانية، الخدمات الخاصة، بغداد، الى مقر القيادة الجوية بغداد، سري، في تشرين الثاني ١٩٢٦، ص ١.

(٢) - تۆێژەران یەك دەنگ نین، سەبارەت بە ساڵی دامەزراندنی ئەم كۆمەڵەیە: ئیحسان نوری و ئیسماعیل شاوەیس بە ساڵی ١٩٢١ی دادەنێن، اسماعيل حقي شاويس، س.پ،ل٤٨" دلشاد محمود عەبدولڕەحمان، ئیسماعیل حەقی شاویس(١٨٩٤- ١٩٧٦) هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٧٤. زنار سلوپی بە ١٩٢٣ و نوری دەرسیمی بە ساڵی ١٩٢٢ دایدەنێن. زنار سلوبي، م.س، ص ١٠٤" Nuri Dersimi, Kurdistan Trihinde Dersim,(Halep-1952), P173. بەڵام دیارە بۆچوونی یەكەم لە ڕاستییەوە نزیكە، چونكە ناوبراوان لە دامەزرێنەرانی كۆمەڵەكە بوون.

(٣) - سەبارەت بەناوی دیاردیكەین ئەندامی ئەم كۆمەڵەیە بڕوانە: فيصل الدباغ، اضواء على كتاب الجمعيات والمنظمات و الاحزاب الكوردية في نصف قرن ١٩٠٨-١٩٥٨، ط١، مطبعة الثقافة، اربيل، ١٩٩٧، ص ص٥٣-٥٤.

(٤) - د.ك.و، ملف تشكيل حكومة مستقلة ١٩٢٤ — ١٩٢٦، تقرير استخبارات الخدمات الخاصة في منطقة كركوك، الفترة المنهية في ٢٦ ايار ١٩٢٧، سري، وثيقة رقم (٥٥).

(٥) - سەبارەت بە پڕۆگرامی ناوخۆی ئەم كۆمەڵەیە بڕوانە: عبدالفتاح البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية/ ملاحظات تأريخية و دراسات أولية، ط١، اربيل، ٢٠٠١، ص ص٥٠١-٥٠٣.

مەهدی)ی برای (شێخ سەعیدی پیران) هاموشۆی ئەو شارەی دەکرد، بە تایبەتی دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی (شێخ سەعیدی پیران) لە ساڵی ١٩٢٥دا، بەمەبەستی ڕاپەڕاندنی کارەکانی ئەو کۆمەڵەیەلە ناوچەکە[١]. زیاتر دەهاتە ئەو شارە، لە وەشدا دەردەکەوێ، کە لقی موسڵی کۆمەڵەکە خاڵی پەیوەندی نێوان ئەو لقەو سەرجەم لقەکانی دیکە بوو[٢].

سەرۆکی لقی موسڵی ئەو کۆمەڵەیە (ئەوین مەعروف ڕەواندزی) بوو، کە وەك لە ناوەکەی دیارە خەڵکی ناوچەی ڕەواندز بووە، ناوبراو ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ (شێخ محەمەد مەهدی) هەبوو[٣]. ئەو کۆمەڵەیە لە زۆرینەی چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی کوردی ئەندامی هەبوو، (بەکر چەلەبی هەولێری) یەکێك بوو لەو بازرگانانەی، کە ئەندامی ئەو کۆمەڵەیە بوو[٤].(ئیبراهیم حەیدەری)ش ئەندام بوو تیایدا[٥] سەرەڕای ئەوانە (حوسێنە فەندی ڕەواندزی و مەعروف جیاووك)یش کە خەڵکی ڕەواندز و دەوروبەری بوون، ئەندامی ئەو کۆمەڵەیە بوون[٦].

ئەو کۆمەڵەیە هیوای بە بەریتانییەکان هەبوو، هەربۆیە بە مەبەستی دروستکردنی پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ بەرپرسی بەریتانییەکان لێژنەیەکی پێکهێنا، ئەو لێژنەیە لە ژمارەیەك ئەفسەر پێکهدەهاتن،[٧]. هەر ئەو کۆمەڵەیە دژی ئەوەبوو ویلایەتی موسڵ بە

---

(١) - احمد حەمەدئەمین، رەواندز... ، ل ١٣٧.

(٢) - سروة اسعد، كوردستان الجنوبية..، ص٣٣٢.

(٣) - خليل الاتروشي، م.س، ص ٢١٠.

(٤) - مركز دراسات الموصل، ملفات الاستخبارات الكردية، كتاب من دائرة ضابط تفتيش الشرطة في الموصل الى المفتيش الاداري (الموصل — سري) رقم(٢٣/٣٠٧) مايس ١٩٢٧، (وزارة الطيران ٢٣/ ٤١٢، القسم ٢، اكس ام ٤٥٨٣.

(٥) - د. عبدالفتاح البوتاني، وثائق عن...، ص ٤٨٨.

(٦) - طارق جامباز، وثائق غير المنشورة / امين الرواندوزی و معروف جياووك و دورهما في جمعية استقلال كوردستان ١٩٢٢- ١٩٢٦، گولان العربي "مجلة"، العدد (٦)، اربيل، ٢٥- ١١- ١٩٩٦، ص ٢٥ — ٣٠.

(٧) - رۆبەرت ئۆلسن، س.پ، ل ٧٢.

توركیا بلكێندرێت، بۆ ئەو مەبەستە یاداشتێكی پێشكەش بە لیژنەكەی كۆمەڵـەی گـەلان كرد، كە بۆ ئەو مەبەستە هاتبوونە ناوچەكە[1].

بەریتانییەكان بەردەوام چاودێری چالاكییەكانی ئەو كۆمەڵەیان دەكرد[2]، بـە تایبـەتی دوای لكاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە، چـونكە بەریتانییـەكان لـە دژی هەرچەشـنە بزووتنەوەیـەك بـوون كـە لـەدژی حكوومـەتی توركیـا بـەرپا بێـت، بـە تایبـەتی دوای ڕێككەوتنامەی سێ قۆڵی ( بـەریتانی – عێـراق – تـوركی) سـاڵی ١٩٢٦[3]. هەربۆیـە دەسەڵاتدارانی بەریتانی كەوتنە خەفەكردنی كاروچالاكییەكانی ئەو كۆمەڵەیە[4].

بەریتانییەكان دوای ئەوەی زانیارییان بە دەست گەیشت، سەبارەت بەوەی (شـێخ عـەلی ڕەزای كوڕی شێخ سەعیدی پیران) بە هەماهەنگی و هاوكـاری لەگـەڵ (ئیسـماعیل حـەققی) سـەرقاڵی دانانی بەرنامەی كاری شۆڕشـگێڕی و پێكهێنـانی ڕێكخسـتنێكن، كـە نوێنەرایـەتی خواسـت و ویستی هەموو كورد بكات[5]، دەستیانكرد بە دەسـتگیركردن و دوورخسـتنەوەی ئەنـدامانی ئـەو كۆمەڵەیە[6]. لەگەڵ ئەوەشدا چالاكییەكانی ئەو كۆمەڵەیـە بـەردەوام بـوو، تـاوەكو دامەزرانـدنی كۆمەڵەی (خۆیبوون)، كە دواتر زۆرینەی ئەندامانی چوونە نێو ئەو ڕێكخستنە نوێیەوە[7].

### ٣- كۆمەڵەی لاوانی كورد:

ئـەو كۆمەڵەیـە بـە وتـەی (ئەحمـەد خواجـە) لـە سـاڵی ١٩٢١ لـە شـاری هـەولێر دامەزراوە[8]، سەرچاوەیەكی دیكە ئاماژە بە ساڵی ١٩٢٠ دەكـات[1]، ( عەبـدوڵا عـەزیز

---

(١) – د. عبدالفتاح البوتاني، الحياة الحزبية...، ص٢٩٨.

(٢) – طارق جامباز، وثائق غير المنشورة...، ص ص٨١ – ٨٣.

(٣) – عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، ج٣، ص ٣٨٨.

(٤) – خليل الاتروشي، م.س، ص ٢١٢.

(٥) – سروه اسعد، كوردستان الجنوبية...، ص ٣٣٢ .

(٦) – د. عبدالفتاح البوتاني، الحياة الحزبية...، ص ٣١٣.

(٧) – م.ن، ص ٣١٣" دڵشاد عەبدولڕەحمان، ئیسماعیل حەقی شاویس...،ل ٨٧.

(٨) – بە وەرگرتن لە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، عەبە هەولێری و كۆمەڵەی لاوانی كورد، هەولێر "گۆڤار"، ژ(١٠) هەولێر، بەهاری ٢٠٠١، ل ١٠٤.

کارگەچی) ناسراو بە (عەبە هەولێری) و (ئەحمەد فەخری سامی) و (عەبدولاّ سامی) لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە بوون کە هەرسێکیان خەڵکی شاری هەولێر بوون. هەروەها دیاردیکەین ئەندامانی دیکەی کۆمەڵە بریتی بوون لە ( مستەفا خۆشناو، خیروڵلا عەبدولکەریم)[2].

بزاڤ و چالاکییەکانی ئەو کومەڵەیە شارەکانی (کەرکووك، رەواندز ، کۆیە، بەغدا)شی دەگرتەوە، بە تایبەتی کە ژمارەیەك قوتابی هەولێر لەو سەردەمەدا لە بەغدا دەیان خوێند و لەهەمان کاتیشدا ڕۆڵیان لە چالاکییەکانی کۆمەڵەکەدا هەبوو، لەوانە (محەمەد فائیق لە کۆلیژی جەنگی)، (عەبدولقادر ڕەشید لە کۆلیژی ماف)، (عەبدولاّ عەزیز لە خانەی مامۆستایان)، (ڕەشید محەمەد لە کۆلیژی شەریعە)[3].

ئەو کۆمەڵەیە لەسەرپەرشتیی کردنی بزاڤی شانۆیی لە شاری هەولێر ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو[4].لە وانە نمایشکردنی شانۆگەری (سەلاحەدین ئەیوبی) لە شاری هەولێر[1]و شانۆگەری (کچی کوردستان) لە شاری کۆیە[2].

---

(١) - غفوری میرزا کەریم، یادگاری لاوان و دیاری لاوان، بەغدا، ١٩٧٨، ل ١٠. لەگەڵ ئەوەشدا سەرچاوەکی دیکە ساڵی١٩٢٨ بە ساڵی دامەزراندنی دادەنێت. بڕوانە: د.سروە اسعد، کوردستان الجنوبیە...،ص ٣٥١. بەلاّم وێنەیەك لە بەردەستی توێژەر دایە، کە لەساڵی ١٩٢٦دا دەستەیەك لە قوتابیانی کۆمەڵەی لاوان لە شاری بەغدا گرتوویانە. کەواتە گومان لەوە دانییە کە کۆمەڵەکە بەر لە ساڵی ١٩٢٨ دامەزراوە.

(٢) - عەبدوڵلاّ زنگەنە، عەبە هەولێری ...، ل ١٠٤. ئەم دوو کەسایەتییەی کە لە سەرەوە ناویان برا، ئەفسەر بوون لە سوپای عێراقی، بەلاّم تێکەلاّوی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی بوون، بە تایبەتی لە ڕاپەڕینی بارزانی ساڵی (١٩٤٣-١٩٤٥)دا، کە بەشدارییەکی دیاریان هەبوو. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محەمەد عەبدوڵلاّ کاکەسوور، ڕۆڵی سیاسی و کەلتوریی ئەفسەرانی کورد لە بزاڤی کوردایەتی کوردستانی باشووردا (١٩٢١-١٩٤٥)، چ١، لەبلاّوکراوەکانی سەنتەری برایەتی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ل١٠٤-١١٠ .

(٣) - عەبدوڵلاّ زەنگەنە، جارێکی دیکە لەگەڵ عەبە هەولێری و کۆمەڵەی لاوانی کورد، هەولێر "گۆڤار"، ژ(١١) هەولێر، هاوینی ٢٠٠١، ل ٦١" حکمت، لاوانی کورد لە بەغدا نیسانی ١٩٢٦، بەیان "گۆڤار" ژ (١٨) نیسانی ١٩٨٩، ل ١٨.

(٤) - محمد تیمور، المسرح الكردي مساره التاريخي، العراق "جريدة" ، ٢٨- ٨ - ١٩٨٠.

جێی ئاماژەیە ( عەبدولاّ عەزیز) ناسراو بە (عەبە هەولێری) دیاردیکەین و کارادیکەین ئەندامی چالاکی ئەو کۆمەڵەیە بوو[3]. ئەوکاتەی لە بەغدا بوو چەند وتارێکی لە (گۆڤاری دیاری کوردستان) بلاّوکردەوە [4].

## ٤- کۆمەڵەی زەردەشت:

ئەو کۆمەڵەیە، کۆمەڵەیەکی سیاسیی نەتەوەیی بوو[5]، لە ساڵی ١٩٢٦، لەسەر دەستی کۆمەڵێك ڕۆشنبیری شاری سلێمانی دامەزرا[6]، بنکەی سەرەکییی لە شاری بەغدا و لقیشی لە هەولێر و سلێمانی هەبوو[7].

(ئیسماعیل حەقی شاویس) سەرۆك و (موستەفا سائیب) سکرتێری کۆمەڵە بوو، دیاردیکەیین ئەندامەکانی (شەوکەت عەزمی بابان، فوئاد مەستی، کەریم مەحمود و

---

(١) - د.فەرهاد پیربال، مێژووی شانۆ لە ئەدەبیاتی کوردیدا لە کۆنەوە تا ١٩٥٧، چ١، هەولێر، ٢٠٠١، ل ٦٠.

(٢) - محەمەد بەکر تەیمور، لەبارەی دراما و ڕەخنە ، کاروان"گۆڤار"، ژ (٤١)، شوباتی ١٩٨٦، ل ل ٦٣-٧٣ .

(٣) - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەکارو چالاکییەکانی عەبە هەولێری بڕوانە: عەبدوللاّ زنگەنە، هەردوو ژمارە (١٠ و ١١) هەولێر "گۆڤار" بەهار و هاوینی ساڵی٢٠٠١.

(٤) - گۆڤاری دیاری کوردستان گۆڤارێکی ئەدەبی کۆمەلاّیەتی هەفتانە بوو، بە زمانەکانی کوردی عەرەبی تورکی دەردەچوو، ژمارە یەکی لە ١١ی ئازاری ١٩٢٥ لە شاری بەغدا دەرچوو، کە لە ٣٢ لاپەڕە پێکهاتبوو، خاوەنەکەی (سالم زەکی ساحیبقران) بوو، ئەم گۆڤارە تا ١١ی مایسی ١٩٢٦ بەردەوام بوو. شیرزاد احمد عبدالرحمان، الوحدة الوطنية في الصحافة الكرديه، رسالة ماجستير، كلية الاداب (قسم الاعلام) جامعة بغداد، ١٩٩١،ص ١٤ — ١٥" احمد باوەڕ، دیاری کوردستان لاپەڕەیەکی پڕشنگدار لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوری دا١٩٢٥-١٩٢٦، سلێمانی، ٢٠٠٤.

(٥) - دلشاد عەبدولرحمان، ئیسماعیل حەقی شاویس...، ل٨٤.

(٦) - د.سروة اسعد، م.س، ص ٣٤٣" ئارام، کۆمەڵەی زەردەشت لە مێژووی کوردا، بەیان "گۆڤار"، ژمارە (٨٩)، بەغدا، ١٩٧٤، ل ٨.

(٧) - سروە اسعد، كوردستان الجنوبية...، ص ٣٤٥" ئاکۆ شوانی، س.پ،ل ٢٢٥.

ڕۆستەم شالۆم)و چەندانی تربوون[1]، (شێخ مەحمود) بە سەرۆکی فەخری ئەو کۆمەڵەیە دانرا بوو[2].

کۆمەڵە خاوەن پەیڕەو و پڕۆگرامێکی تایبەت بەخۆی بوو، کە لە ١٦ بەند پێکهاتبوو[3]، ئامانجی سەرەکیی بەدیهێنانی خودموختاری ئیداری بوو بۆ کورد، لەم پێناوەشدا هەوڵەکانییان خستبووەگەڕ[4] و لەم چوارچێوەدا هانی گەنج و لاوانیان دەدا، بۆ ئەوەی بکەونە خزمەتکردنی وڵات[5]، هەروەها دژایەتی تورکیایان دەکرد[6]و کاریشیان بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی و پشتگیری حکوومەتی ئێران دەکرد[7].

دوای ئەوەی ئەو کۆمەڵەیە چالاکییەکانی خۆی لە باشوورو ڕۆژهەڵاتی کوردستان فرەوانتر کرد، دوو ئاراستە تیایدا دەرکەوتن" بەشێکیان ئارەزووی ئەوەیان دەکرد تەنیا لە باشووری کوردستان کاربکرێت، بەمەبەستی بەدەستهێنانی مافەکانی کورد، لەگەڵ هێشتنەوەی پەیوەندی لەگەڵ کوردانی پارچەکانی دیکە. باڵێکی دیکە داوایان دەکرد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان سوود لە پاڵپشتی حکوومەتی ئێران وەربگیرێت، کە ئەو کات پەیوەندی لەگەڵ حکوومەتی عێراق خراپ بوو[8].

---

(١) - سدیق ساڵح، کامل حەسەن لاپەڕەیەکی ون، هەزارمێرد "گۆڤار"، ژ(٨) ، ساڵی دووەم، حوزیرانی ١٩٩٩، ل ١٧" د.سروە اسعد، کوردستان الجنوبیة...، ص ص ٣٤٣ — ٣٤٤.

(٢) - د.کەمال مەزهەر، خێروبێری ڕاپۆرت نووسێکی کورد، بەشی دووەم، ڕەنگین "گۆڤار"، ژ (٩)، ١٩٩٦، ل ل ٦ - ٧.

(٣) - سەبارەت بە پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵەکە بڕوانە: کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك...، ب٢، ل ل ٣٠٣ — ٣٠٤" خلیل الاتروشي، م.س، ص ص٢٢٣ — ٢٢٤.

(٤) - ئاکۆ شوانی، س.پ، ل ٢٢٥.

(٥) - ئارام، س.پ، ل ٨.

(٦) - کەمال مەزهەر، خێروبێری...، ل ٧.

(٧) - کەمال ڕەئوف محەمەد، مستەفا سائیب ئەستێرەگەشەی کورد، سلێمانی،١٩٩٨، ل ١٧" سدیق ساڵح، کامل حەسەن لاپەڕەیەکی ون...، س.پ، ل ٢٩.

(٨) - شێخ سەلام احمد، دیوانی سەلام، ئامادەکردن و پێداچوونەوەی: ئومێد کاکە ڕەش، چ٢، بەغدا، ١٩٩٩، ل ٣٨.

کۆمەڵەی زەردەشت لە ساڵی ١٩٢٩ لەلایەن بەریتانییەکانەوە ئاشکرا کرا و دەستیان بە دوورخستنەوەی ئەندامانی کرد. چونکە مەترسیی ڕاستەوخۆیان بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا دروست کردبوو، بەهۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر ئەندامی لە سووریا و لوبنان و باکووری کوردستان هەبوو. هەروەها ئەو کۆمەڵەیە هەوڵیانداوە ڕەواندز کە ناوچەیەکی سەر بە هەولێرە، بکەنە بنکەیەك بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵ کوردی باکووری کوردستان و پتەوکردنی ئەو پەیوەندییانە، هەربۆیە بەریتانییەکان دەرکیان بە مەترسیی ئەو کۆمەڵەیە کرد[١] و لە ساڵی ١٩٢٩ هەڵیان وەشاندەوە[٢].

## ٥ – کۆمەڵەی زانستی:

ئەو کۆمەڵەیە لە سەرەتای وەرزی بەهاری ساڵی ١٩٢٦ لە شاری سلێمانی دامەزرا[٣]، بەپێی بۆچوونی یەکێك لە لێتۆژان لە (٢)ی مانگی نیسانی ئەو ساڵە مۆڵەتی لە وەزارەتی ناوخۆی عێراق وەرگرتووە[٤]. لێتۆژێکی دیکە ئاماژە بەوە دەکات، دوای ئەوەی بە نووسراوێکی فەرمی لە (١)ی مانگی شوباتی ١٩٢٦ سێ ڕووناکبیری سلێمانی (فائق مەعروف، ڕەفیق محامی، رەمزی فەتاح) داوای مۆڵەتی دامەزراندنی (جەمعیەتی زانستی کوردان)یان لە وەزارەتی ناوخۆ کرد، لە (٢٤)ی مانگی شوباتی هەمان ساڵ ڕێگەیان پێدرا، پاش ئەوەی بە نووسراوێکی فەرمی لە لایەن وەزارەتی ناوخۆی عێراق وەڵامیان درایەوە، لە شەوی ٣/٢ – ٤- ١٩٢٦دا ئاهەنگی کرانەوەی کۆمەڵەی زانستی ساز کرا[٥].

شەوی (٣)ی نیسانی هەمان ساڵ لە باڵەخانەی شارەوانی سلێمانی کۆبوونەوەیان سازکرد، تیایدا دەستەی کارگێڕی هەڵبژێردرا ، کە پێکهاتبوون لە ( ئەحمەد بەگ موتەسەریفی سلێمانی -سەرۆك، جەمال بابان -جێگر، ڕەفیق بەگ - سکرتێر، فائق بەگ

---

(١) - ئاکۆ شوانی، س.پ، ل ٢٢٧.

(٢) - دڵشاد مەحمود، ئیسماعیل حەقی شاویس...، ل ٨٥.

(٣) - د. ولید حمدي، م.س، ص ٢٠٣" د. عبدالفتاح البوتاني، الحیاة الحزبیة...، ص ٣٠٢.

(٤) - سروه اسعد، کوردستان الجنوبیة...، ص٣٣٣.

(٥) - ئاکۆ شوانی، س.پ، ل ٢٢٠.

- ژمێریار، هەریەك لە (شێخ مستەفا قەرەداغی و عزەت بەگی کوڕی عوسمان پاشا و حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا) ئەندام[1].

ئەو کۆمەڵەیە لەپەیڕەو و پڕۆگرامەکانیدا ئاماژەیدابوو، کە دەست لە کاروباری سیاسیی وەرنادات و چالاکی سیاسیی ئەنجام نادات [2]، بەڵکو زیاتر مەبەستیانە زانست و زانیاریی لە کوردستاندا بڵاوبکەنەوە ئەوەش لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە، نووسین، وەرگێڕانی کتێب، کردنەوەی قوتابخانە و ڕۆشنبیر کردنی خەڵك، ڕەوانەکردنی قوتابیان بۆ وڵاتانی پێشکەوتوو، بەمەبەستی ئاشنابوون بە بارودۆخی سیاسیی و جوگرافیا و ئەسنۆگرافی کورد[3].

ئەو کۆمەڵەیە لقی لە شاری هەولێر، هەروەها لە موسڵ و کەرکووك هەبوو[4]، کەسایەتییەکی هەولێری بە ناوی (مستەفا ئەفەندی هەولێری)جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی زانستی بوو لە کەرکووك[5].

کۆمەڵە بەردەوام پەیوەندی و هەماهەنگی لەگەڵ کەسایەتییە دیارەکانی شاری هەولێر هەبوو، کە گرنگیان بەم بوارە دەدا[6]، (عەبدوڵا هەولێری) ناسراو بە (عەبە هەولێری)، کە لە ساڵانی (١٩٢٦ — ١٩٢٨) لەشاری سلێمانی مامۆستا بوو، ئەندامی کۆمەڵەی زانستی

---

(١) - ژیان"ڕۆژنامە"، ژ(١٣) سلێمانی، ٢٢ نیسانی ١٩٢٦" د. ولید حمدي، م.س، ص ٢٠٤" سروه اسعد، کوردستان الجنوبیة...،ص ٣٣٣.

(٢) - غفوری میرزا کەریم، تەقەلایەك بۆ لەناوبردنی نەخوێندەواری لە کوردستان و کۆمەڵەی زانستی لە سلێمانی، بەغدا، ١٩٨٥، ل ١٧ — ٢١.

(٣) - مالمیسانژ، جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی کورد و ڕۆژنامەگەری، و: زریان ڕۆژهەڵاتی، پێداچوونەوەی: سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ١٠٦" سروه اسعد، کوردستان الجنوبیة...، ص ص ٣٣٣ — ٣٣٤.

(٤) - د. عبدالفتاح البوتاني، الحیاة الحزبیة...، ص ٣٠٢.

(٥) -احمد باوەڕ، کوردستان و چالاکی کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردیەکان لە ساڵانی ئینتدابی بەریتانیادا ١٩٢٠- ١٩٣٢، چ١، سلێمانی ، ١٩٩٨، ل ٣٨. لە بارەی ئەندامانی کەرکووك بڕوانە: د. ولید حمدي، م.س، ص ص ٢٠٦- ٢٠٧.

(٦) - د. ولید حمدي، م.س، ص ٢٠٧" سروه اسعد، کوردستان الجنوبیة...، ص ٣٣٧.

بوو[١]. لەگەڵ (ڕەفیق حلمی) و (مستەفا بەهجەت) هەریەکەو (١٠) ڕووپییەیان بارێوی کۆمەڵەی زانستی کرد. هەروەها (عەبە هەولێری) چەند وتارێکی لە هەفتەنامەی (ژیان)[٢] نووسیووە، لەهەمان کاتدا سەبارەت بە لەچاپدانی پەرتووك ڕەخنەی لە کۆمەڵەی زانستی گرتووە و ئەو کارەی خستووەتە ژێر پرسیارەوە[٣].

ئەو کۆمەڵەیە لەگەڵ ئەوەی لەسەرەتادا زیاتر وەك کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری و زانستی خۆی نواند، بەڵام دواتر لەسەر دەستی (جەمال بەگی بابان)ی جێگری سەرۆکی کۆمەڵە پێ بەپێ بەرەو مەیدانی سیاسیی هەنگاوی نا[٤]. ئەوە بوو هەوڵدرا کۆمەڵە بکرێتە بنکەیەکی بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی سیاسیی، چونکە ئەو پێی وابوو بیرۆکەی خودموختاری لە کوردستان بڵاونابێتەوە، ئەگەر پێگەیەکی ڕێکخستنی بەهێزی نەبێت[٥].

ئیتر بانگەوازەکانی کۆمەڵەی زانستی لەم چوارچێوەیدا بڵاودەکرایەوە، بە وتەی (ئەحمەد خواجە)، (ئەحمەد ڕەفیق)ی ئەندامی کۆمەڵەی زانستی لە شاری سلێمانییەوە هاتە هەولێر، بۆ ئەوەی نامەی یارمەتی بۆ کۆمەڵەی زانستی بڵاوبکاتەوە. ئەوەی لە هەولێر بڵاودەکرایەوە بەشێوەیەکی نهێنی جێبەجێ دەکرا. هەر بۆ ئەو مەبەستە (ئەحمەد ڕەفیق) سەردانی (مەخمور)ی کرد، بەڵام دواتر هێزەکانی پۆلیس بە کارەکەیان زانی و دەستگیریان کرد و لە ڕێگای کەرکووکەوە ڕەوانەی سلێمانی کرایەوە[٦].

---

(١) - عەبدوڵڵا زەنگەنە، عەبە هەولێری و ...، ژ(١٠) ل ٩١.

(٢) - ژیان، هەفتەنامەیەکی ئەدەبی کۆمەڵایەتی سیاسی بوو، یەکەم ژمارەی لە ١٩٢٦/١/٢١ لە شاری سلێمانی دەرچوو، سەرنووسەرەکەی حوسێن نازم بوو، لە سەرەتا زیاتر گوزارشتی لە سیاسەتەکانی حکومەت دەکرد، لە ١٤/ئابی/١٩٣٤ پیرەمێردی شاعیر بووە خاوەنی ئیمتیازی، تا ١٠/ئازاری/١٩٣٨ بەردەوام بوو، (٥٥٣) ژمارەی لێ دەرچوو. شیرزاد احمد، م.س، ص ١٥.

(٣) - عەبدوڵڵا زەنگەنە، عەبە هەولێری و ...، ژ(١٠) ل ٩٢.

(٤) - ئاکۆ شوانی، س.پ، ل ٢٢١.

(٥) - سروە اسعد، كوردستان الجنوبية...، ص ٣٣٦.

(٦) - چیم دی، ب ٣، سلێمانی، ١٩٧٠، ل ٣٨.

کاتێك دەسەڵاتدارانی بەریتانی و عێراق بۆیان دەرکەوت، کە ئەو کۆمەڵەیە بۆ ئامرازێکی بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوەیی گۆڕاوە، بارەگاکانیان داخست[1]. بەم شێوەیە، دوای ئەوەی ئەو کۆمەڵەیە لە ماوەی تەمەنی کورتی کارکردنیدا، چەندین چالاکی لە بوارەکانی فێرکردنی خوێندەواری، سازکردنی چەندین کۆڕوکۆبوونەوەو دانانی کتێبخانە و ئەنجامدانی چەندین شانۆ و یارمەتییدانی قوتابییە هەژارەکان و ووشەکاری لە زمانی کوردییە ئەنجامداوە[2].

**ب: کۆمەڵە عێراقیەکان:**

**١- کۆمەڵەی العهد (پەیمان):**

(ثابت عبدالنور)، کە عەرەبێکی مەسیحی بوو، دواتر موسڵمان بوو و خەڵکی شاری موسڵ بوو، بە نوێنەرایەتی کۆمەڵەی کۆڕبەندی ئەدەبی ( جمعية المنتدى الادبی)، کە لە ساڵی ١٩٠٩ لە ئەستەنبوڵ دامەزرا، لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩١٣ لە ئەستەنبوڵ هاتە موسڵ و کۆمەڵەی (العلم)ی دامەزراند[3] و توانی لە دەڤەری بادینان چەند سەرۆك هۆزێك بهێنێتە ڕیزی ئەو کۆمەڵەیە[4]. دوای ئەوەی لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩١٨دا کۆمەڵەی

---

(١) - د. عبدالفتاح البوتاني، الحياة الحزبية...، ص ٣٠٢.

(٢) - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە چالاکییەکانی کۆمەڵەی زانستی بڕوانە: ژیان "رۆژنامە"،ژ(٢٤)، ١٥ی تەمموزی١٩٢٦ ، ژ (١٩)، ٣ی حزیرانی ١٩٢٦" ژ (٥٧)، ١٠ مارتی ١٩٢٧" ژ(٤٤)، ٢ کانوونی یەکەمی ١٩٢٦.

(٣) - عبدالفتاح البوتاني، الحياة الحزبية...، ص ٥٠.

(٤) - بڕوانە: عبدالمنعم الغلامي، ثورتنافي شمال العراق ١٩١٩_١٩٢٠، ج٢،ب غداد،١٩٦٦،ص ٣٠.

عەهدی عێراق پێکهێنانی خۆی ڕاگەیاند[1]. لە (٢٥)ی نیسانی ١٩١٩دا کۆمەڵەی عەلەم بووە لقێکی سەر بە کۆمەڵەی عەهدی عێراق[2].

کۆمەڵەی عەهدی عێراق سنووری چالاکییەکانی لە دەرەوەی شاری موسڵ بۆ پێنج ناوچە دابەشکردبوو، یەکێکیان هەولێر بوو، ئەوەش بە مەبەستی ئاسانکاری ئەنجامدانی چالاکییەکانی لەم شارە[3]. لەبەرئەوەی کۆمەڵە دۆست ولایەنگر و هەواداری لە هەولێردا هەبوو. لە ڕێگای کەسێك بە ناوی (عەبدولمەجید ئەفەندی)ی ئەندامی کۆمەڵە پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ (ئیبراهیم پاشا)ی سەرۆك هۆزی دزەیی پەیدا کردبوو[4].

هەروەها کۆمەڵەی ناوبراو گرنگی زۆریشی بە ڕووداو و پەرسەندنەکانی شاری هەولێر دەداو سەروخۆی لە ڕووداوەکان ئاگەدار دەکردەوە[5]. زۆر جاریش لە ڕێگای کەسێك بە ناوی (محەمەد محەمەد ساڵح) نووسراوی ڕێکخستنەکانی ئەو کۆمەڵەیە کۆمەڵە لە هەولێر بڵاودەکرانەوە[6].

### ٢- پارتی حزب التقدم (پێشکەوتن):

ئەو پارتە لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٥ لە لایەن (عەبدولموحسین سەعدون) دامەزرا، یەکەمین پارتی پەرلەمانی عێراق بوو[7]. ئەندامەکانی زیاتر پێکهاتبوون لە ئەندامانی

(١) - دوای ئەوەی کۆمەڵی عەهد هەستیان بەوە کرد کە وڵاتانی هاوپەیمان ڕازی نابن دەوڵەتێکی سەربەخۆی عەرەبی دابمەزرێت، کۆمەڵەکە بۆ دووبەش لەتبوو ، کۆمەڵەی عەهدی عێراقی و کۆمەڵەی عەهدی سوری ، کە کۆمەڵەی عەهدی عێراقی لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩١٨ دامەزرا. عبدالفتاح البوتاني، الحياة الحزبية...، ص ٨٤.

(٢) - عبدالفتاح البوتاني، الحياة الحزبية...، ص ٥٨.

(٣) - قحطان التلعفري، م.س، ص ١٠٢.

(٤) - عبدالنعم الغلامي، ثورتنا في...، ص ٢٩.

(٥) - کەمال مەزهەر، چەندلاپەڕەیەك...، ب١، ل١٨٧.

(٦) - عبدالمنعم الغلامي، ثورتنا في...، ص ص ٣١ - ٣٢.

(٧) -د. عبدالفتاح البوتاني، الحياة الحزبية...، ص ١٠٧.

ئەنجوومەنی نوێنەران و ئەو سیاسەتمەدارانەی هــەوڵی بــە دەســتهێنانی پۆســتی فــەرمییان دەدا[١]، یاخود خودان پلە و پایەکی کارگێڕی بوون[٢].

لە ساڵی ١٩٢٦دا (١١) ئەندامی کوردی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق ئەندامی پارتی پێشکەوتن بوون. لەوانە (ئیبراهیم یوسف، عەبدوڵا موخلیس ، ئیسماعیل ڕەوانــدزی) کــە نوێنەری هەولێر بوون[٣]، (عەبدولمحسین سەعدون) بەهۆی هەڵوێســتی باشــی بەرامبــەر بــە کورد توانیبووی ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی کورد لــە دەوری خــۆی کۆبکاتــەوە[٤]. لــە بەڵگەنامەیەکی بەریتانیدا هاتووە، ناوبراو لــە ســاڵی ١٩٢٦دا لەگــەڵ ســەرجەم ئەندامــە کوردەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران کۆبووەتــەوە و تــاوتوێی یاداشــتێکیان کــردووە، کــە بــۆ حکوومەت نێردراوە لە بارەی زیاتر ساغ کردنەوەو دیاریکردنی عێراق عــەرەبی و کــوردی، بەڵام هەوڵەکانیان سەرکەوتنی بەلادەست نەهێناوە[٥]، ئەو پارتە تا مانگی ئــاداری ســاڵی ١٩٣٠لە چالاکی سیاسیی خۆی لە عێراق بەردەوام بوو[٦].

## ٣ – گروپی جوولەکەکانی هەولێر:

سەرچاوەیەك ئاماژە بەوە دەکات، کە لە شاری هــەولێر جموجــوڵی جوولەکــە هــەبوو، (نوڕائیل)ی سەرۆکی تایفەی جوولەکەی هەولێر بەرپرسی چالاکییەکانی جوولەکــە بــوو لــە شارەکەدا. بەمەبەستی یارمەتییدان و پاڵپشــتیکردنی جوولەکــەکانی جیهــان، جوولەکــەی هەولێر پارەیان کۆکردوەتەوەو ناردویانە بــۆ ســندوقی دامەزرانــدنی جوولەکــەی ( صــندوق التاسیس الیهــودي) و لــە بەرامبــەر ئــەو چــالاکییە زۆرەی ئــەنجامی دا، (نوڕائیــل) بــۆ

(١) - م.ن، ص ٢٧.

(٢) - عبدالرزاق الحسني، تاريخ الاحزاب...، ص ٨٥.

(٣) - عبدالفتاح البوتاني، وثائق عن ...،ص ٢٧.

(٤) - م.ح.و، ضابط الخدمات الخاصة، بغداد ٥شباط ١٩٢٦، اكس/ام ٠٤٥٨٣، جو ٤١١/٢٣، سري، دي ٦١. وەرگیراوە لە: عبدالفتاح البوتاني، وثائق عن...، ص٣٠.

(٥) - هەمان بەڵگەنامەی پێشوو، بە وەرگرتن لە هەمان سەرچاوە، ص٣٠.

(٦) - عبدالرزاق الحسني، تاريخ الاحزاب...، ص٩٣.

ئامادەبوون لە پازدەیەمین کۆنگرەی جوولەکە بانگهێشت کرا[1]، کە بە بەشـداریی (٢٨١) نوێنەر لە (٣٠) ئاب تا (١١)ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٧ کارەکانی لە شاری (بازل)ی سویسرا بەردەوام بوو[2].

---

(١) - د.فاضل البراك، المدارس اليهودية...،ص ٧١.

(2)- www.qudsway.com/more.php?type=News&id=1115

## تەوەری دووەم

## پەیوەندی هەولێر بە بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود

شێخ مەحمود کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی شێخ محەمەدی حاجی کاك ئەحمەدی کوڕی شێخ مەعروفی نۆدێی یە، لە ساڵی ١٨٨١ لە سلێمانی لە دایك بووە[١]. بنەماڵەی شێخ هەر لە سەردەمی میرنشینی بابانەوە پێگەیەکی ئاینی و کۆمەڵایەتی دیاریان هەبوو. دوای ڕووخانی میرنشینەکەش لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم پێگەو دەسەڵاتیان لە پەرەسەندن دابوو[٢]. لە لای دەسەڵاتدارانی عوسمانیش ڕێزێکی زۆریان هەبوو، هەر بەو هۆیەوە (سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ) بە فەرمی بانگهێشتی (شێخ سەعید)ی باوکی(شێخ مەحمود)ی کرد بۆ ئەستەنبۆڵ. لەکاتی گەڕانەوەیدا (شێخ سەعید) بە شاری هەولێردا تێپەڕ بوو، خەڵکێکی زۆر لە دانیشتووانی ئەو شارە هاتنە پێشوازی[٣].

ئەو خانەوادەیە پەیوەندییەکی لە مێژینەیان لەگەڵ تەکیەو خانەقاو بزووتنەوە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکانی کوردستان هەبوو[٤]، هەر لەم چوارچێوەیەدا پەیوەندی نێوان هەولێرو ئەو بنەماڵەیە تەنیا بۆ سەردەمی ڕاپەڕینەکانی (شێخ مەحمود) ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئەو پەیوەندییە ڕیشەیەکی درێژ دیکەی هەیە، پەیوەندی بەتین لە نێوان (کاك ئەحمەدی شێخ) و ( مەلا عومەر ئەبوبەکر- مەلا گچکەی هەولێری) مەلای مزگەوتی گەورەی قەڵا هەبوو، بەردەوام هاموشۆی یەکدیکەیان کردووە. هەر بۆیە چەندین نامە لە نێوان (کاك ئەحمەدی شێخ) و (حاجی عومەرە فەندی هەولێر)ی ئاڵوگۆڕ کراون، تیایدا ڕەوشی زانستی ئاینی و

---

(١) - سەبارەت بە ڕۆڵ و کەسایەتیی شێخ مەحمود بڕوانە: عبدالرحمان ادریس صالح البیاتي، الشیخ محمود الحفید البرزنجي والنفوذ البریطاني في كردستان العراق حتی عام ١٩٢٥، ط١، سلیمانیة، ٢٠٠٦" محمد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب١-ب٢، لەندەن — بەریتانیا، ١٩٩٠.

(٢) - ئاکۆ شوانی، س.پ، ل ٢٨ .

(٣) - محمد رسول هاوار، شێخ مەحمود...، بەرگ١، ب١، ل ٢٠٩.

(٤) - پشکۆ ئاغجەلەری، س.پ، ل ١٨٧ .

قوتابیانی ئاینی و ڕەوشی خوێندن قسەو باسیان لەسەر کراوە. ئەو کاتیش مزگەوتی گەورەی قەڵا ناوەندێکی زانستی بوو، دەیان قوتابی، کە لە ناوچەی جیاجیا هاتبوون، وانەیان تێدا دەخوێندو (ئیجازە)ی مەلایەتیان پێدەدرا[١].

لە ساڵی (١٩٠٨)دا کاتێك خانەوادەی (شێخ مەحمود) بەهۆی فشاری ئیتحادییەکان بۆ شاری موسڵ دوورخرانەوە، لەوێدا (شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود) و (شێخ ئەحمەد)ی برای لەپیلانێکدا کوژران[٢]. ئەو ڕووداوە کوردانی باشووری کوردستانی زۆر توورە کرد[٣]، دانیشتووانی شاری هەولێر لەپاڵ کەرکووك و سلێمانی بەجارێ خرۆشان[٤]. لەم کاتەدا شاعیری قەڵای هەولێر (حوزنی)[٥] لە هۆنراوەیەکدا خەم و ناسۆرییەکانی شاری هەولێری سەبارەت بەم ڕووداوە دەربڕیوە، تەنانەت گەورەیی ڕووداوەکەی بەجۆرێك وێنا کردووە، کە تا ئێستا لە دوای کوشتنی (ئیمام حوسێن) لە کەربەلا، ڕووداوی لەم شێوەیە ڕووی نەدابێ، کاتێ دەڵێ:

---

(١) - احسان رشاد الموفتي، رسائل من كاك احمد الشيخ الى حاج ملا عمر ابن ابي بكر ملا گچكه الاربلي، کاروان "گۆڤار"، ژ( ٢٤)، ئەیلولی١٩٨٤، ساڵی دووەم، ل ل ١٥٠ — ١٥٣"ئیحسان موفتی نامەکانی کاك احمدی شێخ بۆ حاجی عومەر فەندی ناردووە کە نامەی شەشەم بۆ یەکەمینجارە، بڵاودەکاتەوە، بەدرخان "مانگنامە"، ژ(٨٩ )، هەولێر، ٢٢/١/ ٢٠٠٨.

(٢) - لەبارەی ئەم ڕووداوە بڕوانە: عەبدولمونعیم غولامی، سێ قوربانییەکە (شێخ سەعید بەرزنجی، شێخ عەبدولسەلامی بارزانی، شێخ زاری ئەلزەوبەعی)، و: ئیحسان ئیروانی،چ١، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ل ٢٢ — ٢٨.

(٣) - شێخ لە تیفی حەفید، یاداشتەکانی شێخ لە تیفی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی حەفید، چ١، ساغکردنەوەی: کەمال نوری مەعروف، دهۆك ١٩٩٥، ل ١٩.

(٤) - رفیق حلمی، یادداشت، ب١، ل ٣٧.

(٥) - حوزنی ناوی ئیسماعیل کوڕی دەروێش ئاغای کوڕی غەفوور ئاغای کوڕی مستەفا ئاغای کوڕی حاجی محەمەد ئاغای چاوشلییە، لە ساڵی ١٨٤١ لە دایك بووە، شیعری بە کوردی و تورکی و فارسی هەیە، لە ساڵی ١٩١٧ مردووە. تارق جامباز، پاش مردنی بە (٨٠) ساڵ ئینجا شیعرەکانی حوزنی (١٨٤١ -١٩١٧) شاعیری قەڵاتی هەولێر بڵاودەکەینەوە، رامان "گۆڤار"، ژ(١١٨)،ساڵی دووەم، هەولێر، کانوونی دووەمی ١٩٩٧، ل ل ١٣٨ — ١٣٩.

کربلا **حادثة** موجعة سنــدن **صنـــرة**

کس نەیداست نەبیندکە مگر شیخ سعید [1].

هەر لەئەنجامی ئەو ڕووداوە (شێخ مەحمود) دوای ئەوەی ماوەیەك لە موسڵ دەست بەسەر کرا بوو، بەهەوڵی هەندێك پیاو ماقوڵانی موسڵ بە یاوەری مەفرەزەیەکی عوسمانی ڕەوانەی شاری هەولێر کرایەوە[2]. دانیشتووانی هەولێر لە تەك کەرکوك و سلێمانی بەپێ و سوارە کەوتنەڕێ[3]، کە تووڕە بوون و بێزاری لە ڕوویان دەخوێندرایەوە. دوای ئەوەی شێخ گەیشتە هەولێر، لەوێ نەوەستاو یەکسەر بەرەو کەرکوك چوو[4]. بەپێی بۆچوونێك پیاوماقولانی هەولێریش ڕۆڵیان لە هێنانەوەی شێخ هەبوو[5].

بەر لە هەڵگیرسانی یەکەمین جەنگی جیهانی، (شێخ مەحمود) لە زۆرینەی ئەو هەوڵانەی کە دەیخستەگەڕ بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی کورد، هەولێری بە بەشێك لە دەسەڵاتی خۆی دانا بوو. ئەوە تا کاتێك لە ساڵی **١٩١٣** بە مەبەستی بەدیهێنانی سەربەخۆیی پەیوەندی بە ڕووسەکان کرد، هەولێری بە بەشێك لە دەسەڵاتی خۆی داناوەو بە ناوی سلێمانی و هەولێر و کەرکوك ئەو داوایەی پێشکەش بە ڕووسەکان کردووە[6]، ئەوەش لەو کاتەدا، کە نوێنەری تایبەتی خۆی ڕەوانەی شارەکانی بەغداو موسڵ کرد[7].

لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمین جیهانی لە ساڵی (١٩١٤) و جاڕدانی جیهاد کردن لە دژی کافران لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی، (شێخ مەحمود) بەشداریی لە شەڕی (شوعەیبە)دا کرد، کاتێك سەرۆکایەتی هێزێکی کوردی کرد، کە لە ژمارەیەك سەرۆك هۆز

---

(١) - بۆ دەقی هۆنراوەکە بڕوانە:هـ.س، ل ١٤٠.

(٢) - شێخ لە تیفی حەفید، س.پ، ل ١٩.

(٣) - پشکۆ ئاغجەلەری، س.پ، ل ١٩١.

(٤) - شێخ لە تیفی حەفید، س.پ، ل ل ١٩ — ٢٠.

(٥) - چاوپێکەوتن لەگەڵ جەلال خدر.

(٦) - د.کمال مظهر، کرکوك..، ج١، ص١٥٦.

(٧) - لازاریف، کێشەی کورد ١٨٩٦ -١٩١٧، و: کاوس قەفتان، ب١، بەغدا، ١٩٨٩، ل ٣٦٣.

و سـوارەکانی کـەرکووك و سـلێمانی و هـەولێر پێکهـاتبوون[1]. دیاردیکـەین ئـەو کەسایەتیانەی هەولێر کە بەشدارییان لەم هێزەدا کرد، بریتی بوون لـە: (حوسێن عـەولای حەتکی زێد بەگی) ناسراو بـە (عـارەب ئاغـای کۆزەپانکـەیی)[2]، هـەروەها بەشێك لـە سوارەکانی هۆزی دزەیی، لەوانە (پیرداود ئاغا)ی خەڵکی گونـدی (مێرخـوزار)ی ناوچـەی دزەیی[3].

لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمین جیهانی و هاتنی دەسەڵاتی بەریتانییەکان بـۆ ناوچەکە، کاتێك ( مێجەر نۆئێـل) لـە (١٩١٨/١١/١٧) هاتـە سـلێمانی[4] ، وتـارێکی درێـژی بـە زمـانی فارسـی خوێنـدەوە و ڕایگەیانـد، کـە (شـێخ مـەحمود) حکومـداری کوردستانە[5]. سەبارەت بە سنوورو چوارچێوەی دەسەڵاتەکەشی رایگەیاند، (شێخ مەحمود) حوکمداری هەرێمی نێوان سیروان و زێـی گەورەیـە، کـە بـەم پێیـەش هـەولێر خـۆی لـە چوارچێوەی دەسەڵاتی (شێخ مەحمود)دا دەبینییەوە[6].

بەڵام بەریتانییەکان دواتر هەولێریان نەخستە سـەر دەسـەڵاتەکەی (شـێخ مـەحمود)، تەنانەت (کۆیە)ش، کە لە سەرەتادا بڕیار بوو لەچوارچێوەی دەسەڵاتی شێخ بێت، خستیانە سەر هەولێر، هەر بەوەندەش نەوەستان، بـەڵکو بـە تێپـەڕبوونی کـات بەریتانییـەکان تـا دەهات دەسەڵاتەکەی شێخیان کەم دەکردەوە[7].

---

(١) - سروە اسعد، كوردستان من بداية الحرب...، ص٤٣" جمیل ڕۆژبەیانی، شـێخ مـەحمودی حەفیـد زادە، ڕۆشنبیری نوێ"گۆڤار"، ژ(١١٣)، بەغدا، ساڵی ١٩٨٧، ل ٦٣.

(٢) - جەلال خدر، حەسەنە شەل ... .

(٣) - هۆشیار عەبدوڵڵا، دزەیی و ناوچەی دزەیی ....، هەولێر" گۆڤار"، ژ(٨)، ل ل ١٢٧ – ١٢٨.

(4) - Air 20/512, Telegram, From Political Baghdad to India Office,No 9351,1 November 1918

سدیق ساڵح، حکومەتی کوردستان ١٩١٨ – ١٩٢٤، چ٢، سلێمانی ، ٢٠٠٦، ل ٣١"

(٥) - ڕەفیق حلمی، یادداشت، ب١، ل ل ٤٦-٤٧.

(٦) - ب. هولت. مذكرة حول الشيخ محمـود، ت: د. ازاد گرمیانی، مجلە( ئاڵای ئیسلام)، ع(١) اذار ١٩٩٦، ص ٤٨" سدیق ساڵح، حکومەتی...، ل ١١.

(٧) - محمد ڕسول هاوار، شێخ مەحمودی...، ل ٤٥" دیڤد ماکداوڵ، س.پ، ل ٢٠.

لە لایەکی دیکەوە شێخ بە مەبەستی یەکخستن، نوێنەری خۆی بۆ هەولێر و کەرکووك و موسڵ و هەندێ ناوچەی دیکە نارد[1]. لەگەڵ ئەوەی دەسـەڵاتی (شـێخ) نەگەیشـتووە تـە شاری هەولێر[2]، بەڵام بەپێی دۆکیۆمێنتێکی مێژوویی دەسەڵاتەکەی گەیشتووە تە ناوچەی (کۆڕێ)ی سەر بە هەولێر[3] ، ئـەوەش لـەوە دەردەکـەوێت لـە سـاڵی ١٩١٩ (شـێخ) بـە فەرمانێکی تایبەتی خۆی، (مستەفا بەگی)[4] بە سەرداری کـۆڕێ دانـا، بـە نـاوی خـۆی دەستەبەرکردنی هێمنی و ئاسایشی دەڤەرەکەی پێ سـپارد، مانگانـەش (١٠٠) ڕووپیـەی وەك موچە بۆ بڕیـەوە[5]. ئـەوەش ئـەوە دووپـات دەکاتـەوە، کـە دەسـەڵاتەکەی (شـێخ) ناوچەکانی سەر بە هەولێریشی گرتووە تەوە، ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بووبێت.

دەنگ و سەدای حوکمداریەتی (شێخ) لەنێو شاری هەولێر بڵاوبووە وە، ئەو پێشهاتەش زۆرینەی دانیشتووانی شار و دەوروبەری خۆشحاڵ کرد، تەنانەت بەشێك لە لاوەکانی شـار حەز و خولیای ئەوەیان لەلا دروست بوو بچنە شـاری سـلێمانی، بـۆ ئـەوەی ئـەوانیش لـە سێبەری ئەو دەسەڵاتە کوردییەدا بن[6]. تەنانەت بە بۆنـەی حوکمدارییەکەیـەوە، (خـدری پاشای دزەیی) بروسکەی پیرۆزبایی بـۆ (شـێخ) نـارد و ئامـادەیی و پشـتگیری خـۆی بـۆ پێشاندا[7].

---

(١) - د. ئەفراسیاو هەورامی، کورد لە ئەرشیفی ڕووسیا و سۆڤیەت دا، چ١، هەولێر، ٢٠٠٦،ل ٢٠٦.

(٢) -البرت.م.منتشاشفیلي، م.س،ص ٣٠٦.

(٣) -کۆڕێ دەکەوێتە نێوان شەقلاوە و پیرمام( هاوینە هەواری سەلاحەدین).

(٤) - مستەفا بەگ، مستەفا ئاغاشی پێ دەگوترا، کوڕی حەمەدەمین ئاغای کوری عـەولا ئاغـا مـاوەلووی کوڕی ووسو ڕەحمان ئاغای کوڕی قادر خانە سەرۆکی عەشیرەتی کۆڕێ، لە ساڵی ١٩١٩ لەمیانـەی شـەڕێکدا کوژرا. سدیق ساڵح، ئەلبومی شێخ مەحمودی حەفید، ب١، سلێمانی ، ٢٠٠٦ ، ل ١٤٤.

(٥) - هـ.س، ل ١٤٤" تارق جامباز، پێش (٨٢) ساڵ لە ١٩١٩ فەرمانێك لە حکومداری کوردستان (شێخ مەحمود) بە دانانی مسـتەفا بـەگ بـە ڕەئیسـی عەشـیرەتی کـۆڕە (کـۆڕێ) دەرچـووە، برایەتی"ڕۆژنامـە"، ژ(٣٣١٠)، هەولێر، ٢٠٠١/٢/١٣" بۆ دەقی ئەم دۆکیۆمێنتە بڕوانە پاشکۆی ژمارە( ١٢).

(٦) - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نورەدین دەباغ، چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نەجمەدین.

(٧) - کەریم شارەزا، پیاوی بەجـەرگی دزەییـان خـدری پاشـا (١٨٨٠ – ١٩٨٦)، هـەولێر"گۆڤار"،ژ(٤)، پایزی ١٩٩٩، ل ٩٤.

لەم چوارچێوەیەدا دەستەیەك لە گـەنجانی شـار پەیوەنـدییان بـە دەسـەڵاتەکەی (شـێخ مەحمود) کرد، لەوانە (حوسێن عەولای حەتکی زێد بـەگی)[١] و (ئەحمـەدی کـوڕی حـاجی مسـتەفای کـوڕی حـاجی محەمـەدی کـوڕی حـاجی مـەحمود)[٢]، هـەروەها بـەهۆی ئـەو بارگرژییەی، لە نێوان دزەییەکان و ئیدارەی بەریتانییەکان لە شاری هەولێر ئـەو کـات لـە ئارا دابوو، بەشێك لە دزەییەکان بڕیاریاندابوو لە دوای وەرزی دروێنەکردن لە ساڵی ١٩١٩ پەیوەندی بە (شێخ مەحمود)ەوە بکەن، ئەوە لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا هاتووە[٣].

دیارە هەموو خەڵکی پشتیوانیان لە دەسەڵاتەکەی (شێخ مەحمود) نەکردووە" لە بـارەی نەیارانی شێخ لە هەولێر ڕۆژهەلاتناس (مینتاشاشڤیلی) دەڵێ:

**"بۆرجوازەکانی هەولێر نەیاری دەسەڵاتەکەی شێخ بوون، چونکە لەوە دەترسان دوای سەرکەوتنی دەسەڵاتەکەی شێخ، هەولێر ببێتە شوێنکەوتە و پاشـکۆی شـاری سـلێمانی دواکەوتوو"[٤].**

هەروەها لە دووتـوێی ڕاپـۆرتێکی بـەریتانی ئامـاژە بـەوە کـراوە، کـە خوێنـدەوار و ڕۆشنبیرانی هەولێر ئامادە نەبوون، بە دوای گوندێکی وەك سلێمانی بکەون[٥]. کەسایەتییە دیارەکان بەتایبەتی (مەلا فەندی) خۆی لە (شێخ) بالاتر دانـاوە و تەنانـەت لـە هـەڵس و کەوت و بیرکردنەوەشدا جیاواز بوون[٦].

بەپێی دۆکیۆمێنتێکی بەریتانی، لەدیدارێکدا لەگەڵ (C.A.G.Rundle)ی ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە کۆیەدا، (مەلامحەمەدی کۆیە) و (جەمیل ئاغای کۆیە) داوایان

---

(١) - جەلال خدر، حەسەن شەل و ... .

(٢) - جەلال خدر، حاجی احمدی جامبازی لاوك و حەیرانبێژ و مقامزان(١٨٨٢- ١٩٧٤)، رامان "گۆڤـار" ژ(٧٦)، هەولێر، تشرینی یەکەم ٢٠٠٢، ل ١٢٦.

(٣) - نامەیەکی جوفرەکراو کە لە (وان)ەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ( نظارة الداخلية)ی عوسمانی ڕەوانە کراوە. لـە بەرواری ١٣٣٥/٨/٦ڕۆمی لە: د.خلیل علي، مختارات من كتاب ..، ص ١٧٤.

(٤) - البرت.م.متشاشفيلی، م.س،ص ٣٢٢.

(5) -Report on Iraq Administration April, 1922-March,1923,PP36-37.
وەرگیراوە لە د. كمال مظهر، كركوك و....، ص ١٧٠.

(٦) - چاوپێکەوتن لەگەڵ ئیحسان موفتی.

کردووه (حەمدی بەگی بابان)[1] کە یەکێکە لە کەسایەتییەکانی بنەماڵەی بابانییەکان، بکرێتە فەرمانڕەوای کوردستان. ئەوەشیان ڕاگەیاندووە، کە پیاوماقولانی هەولێر هەمان بۆچوونیان هەیە و پاڵپشتی لێ دەکەن[2]. لەبارەی سنووری ئەو فەرمانڕەوایەتییە (مەلامحەمەدی کۆیە) داوای کرد، دەسەلاتی بەسەر (هەولێر، سلێمانی، کەرکووك)دا هەبێت، هەروەها دڵنیاش بوو لەوەی کە ڕەواندزیش دەخوازێت بێتە ژێر دەسەلاتی ئەو حوکمداریەتیە[3]. بە پێی دۆکیۆمێنتێکی بەریتانی، (مەلا محەمەدی کۆیە)، باوەڕی وابوو و بە پێویستیشی دەزانی، کە لە کاتێکدا دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێت، ئەوا لە ژێر سەرپەرشتی بەریتانیادا بێت[4].

لە لایەن خۆیانەوە بەرپرسانی بەریتانی لە شاری هەولێر چەند جارێك سەبارەت بە پرسی (شێخ مەحمود) دیدار و کۆبوونەوەیان سازکرد، تیایدا بەربەرەکانییکردنی شێخیان تاوتوێ دەکرد. هەر لەم نێوەندەدا هەوڵیانداوە سوود لە (سەید تەها) وەربگرن، بۆ ئەوەی (شێخ مەحمود) نەتوانێت پانتایی دەسەلاتەکەی بگەیەنێتە هەولێر[5]. ئەوە تا کاتێك (سەید تەها) لە ساڵی ١٩١٩ هاتووەتە هەولێر، ئەو مەسەلەیە لە نێوان ئەو و بەریتانییەکان و پیاوماقولانی شار تاوتوێکرا. هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا دەسەلاتدارانی

---

(١)- محەمەد حەمدی پاشا کوڕی حوسێن بەگی کوڕی محەمەد پاشای بابانییە، لە ساڵی ١٨٤٦ لە سلێمانی لە دایك بووە، دواتر چووەتە بەغدا و لە دیوانی ویلایەت کاری کردووە، ماوەیەك داواکاری گشتی بوو لە موسڵ، دواتر بووەتە پشکێنەری دادی لە ویلایەتەکانی (موسڵ، بەغدا، بەسرە)، هەروەها چەند پۆستێکی دیکەی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٢٢ لە شاری بەغدا مرد. میر بصري، اعلام الكرد، ص ص ١٥٦ -١٥٧. جێی ئاماژەیە سەرچاوەیەك ناوەکەی بە ( حەمید بەگ) بردووە. بڕوانە:مەهدی محەمەد قادر، هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩١٤-١٩٣٠...، ل ٨٩. بەڵام ڕاستیەکەی حەمدی بەگی بابانە، نەك حەمید بەگ.

(2) - F.O, 371-5069, From C.A.G.Rundle ,Captain, A.p.o.koi, To the Political Officer Arbil, no 5,7March, 1920.

(3) - F.O, 371-5069, From C.A.G.Rundle ,Captain, A.p.o.koi, To the Political Officer Arbil, no 6,9March, 1920.

(4) - F.O, 371-5069 , Confidentail memo, no S.C/155/4, From The Political Officer, Arbil, To Civil Commissinner, Baghdad ،Dated 17July 1920.

(٥) - ڕفیق حلمی، یادداشت،ب١، ل ٩٦.

بەریتانی لە هەولێر دەستیان کردبوو، بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە لە دژی (شێخ مەحمود)[1].

یەکێك لە کەسایەتییە دیارەکانی دزەیی ( عەلی مەحمود کاکە خان) بوو، کە پەیوەندییەکی توونددوتۆڵی لەگەڵ (شێخ مەحمود)دا هەبوو[2]. کە لە ڕاستیدا پەیوەندییەکانی ئەو دوو خانەوادەیە بۆ سەردەمی (کاك ئەحمەدی شێخ) دەگەڕێتەوە[3]. هەربۆیە دوای ئەوەی پەیوەندی نێوان بەریتانییەکان و (شێخ مەحمود) دووچاری ئالۆزی بوو[4]، لەگەڵ هەڵگیرسانی یەکەمین بزووتنەوەی (شێخ مەحمود)دا لە ساڵی ١٩١٩ ( عەلی مەحمود کاکەخان) لەگەڵ دەستەیەك لە سوارەکانی پەیوەندی بە شێخەوە کرد[5]. تەنانەت

---

(١) - نامەیەکی جوفرەکراو کە لە (وان)ەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ( نظارة الداخلية)ی عوسمانی ڕەوانە کراوە. لە بەرواری ١٣٣٥/٨/٦ڕۆمی لە: د.خليل علي، مختارات من كتاب ...، ص ١٧٤ " ڕەفیق حلمی، یادداشت، ب١، ل ل ٩٥ – ٩٦.

(٢) - کەریم مستەفا شارەزا (ئامادەکردن و هەڵسەنگاندنی)، کورتەیەك لە مێژووی دزەییان لە دەستنووسێکی مێژوویدا، کاروان "گۆڤار"، ژ(٦٧) ، بەغدا، ئابی ١٩٨٨، ل ٢١" طاهیر حەوێزی، س.پ، ل١٦٨" بیرەوەرییەکانی احمد حەمەئاغای پشدەری، تۆمارکردن و ئامادەکردنی: عبدالرقيب یوسف و سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٤٧.

(٣) - لەتیف بەرزنجی، عەلی مەحمود کاکەخان و شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر، کوردستانی نوێ "ڕۆژنامە"، ژ(١٠٧٢) ساڵی چوارەم، دووشەممە ١٩٩٥/٨/٢٨.

(٤) - سەبارەت بەهۆکاری تێکچوونی ئەم پەیوەندییە، بڕوانە: د.سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی کوردی...، ل ٨٩ -٩٠.

(٥) - دیاردیکەی‌ن ئەو دەستە سوارەی کە لەگەڵی دابوون پێکهاتبوون لە (عەزیزی وسو ئاغا)، ( سابیر ئاغای برای) ، (هادی حوسێن ئاغا) ، (سمایلی عەلی جەمرە) و (کوێخا مەجیدی شانشینی) ، (لەشکری عەزیز محەمەد) ،(عەزیز یوسف کاکەخان)ی خەڵکی گوندی مورتکەی گەورە،( رەئوف ساڵح) خەڵکی گوندی مورتکە، (عەولا غوزە) خەڵکی گوندی مورتکە، (ئیبراهیم ئالتون)، (کەریمە گۆجی مامەند)، ( حوسێن سیان)،(حەمە ڕەشید سیانی گردەسۆری)، (ئۆمەرسیانی سەر بەشاخی)، (حەسەن کوردە)، (حاجی عەبدوڵڵا شەلی سەربەشاخی). (عەلی عەبۆی)، (شێخە سابلاخی)، (حاجی رەشید). ناوەکانم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە: چاوپێکەوتن لەگەڵ سەفیەخان، کە خێزانی عەلی مەحمود کاکەخانە، لە ناوەڕاستی ساڵانی حەفتا تارق جامبار پارێزەر و ئەندامی ئێستەی پەرلەمانی کوردستان ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵدا سازکردووە، دەقی

لەگەڵ سوارەکانی بەشداریی شەڕی دەربەندی بازیانیــان کــرد[1]، هــەروەها بــەپێی گوتــەی نووسەرێك دووکەسی دیکە بەناوەکانی (حاجی ئەحمەد جامباز) و (دەروێــش رەمــەزان)یش بەشداربوونە لەم شەڕە[2]. ئەوانەش وتەی نوێنەری باڵای بەریتانی لە عێراق ڕەتدەکەنــەوە، کە ئاماژە بەوە دەکات، هیچ هاوسۆزیەك لە نێوان دانیشتووانی هەولێر و بزوتنەوەی (شێخ مەحمود) نەبووە[3].

دوای بەدیل گرتنی (شێخ مــەحمود)و هەرەســهێنانی ئــەو ڕاپەڕینــە، (عــەلی مــەحمود کاکەخان) گەڕایەوە گوندی مورتکە لە دەشتی هەولێر[4]. هەروەها (حوسێن حــەتکی زێــد بەگی)ش دەگەڕێتەوە شاری هەولێر، بەڵام ( حوسێن زێدبەگی) لە لایەن هەندێك لە دەســت و پێوەندەکانی بەریتانییەکان زمانی لێ دەدرێت بەوەی چەکی لە دژی هێزەکانی بــەریتانیا هــەڵگرتووەو بەشــداریی لــە بزووتنەوەکــەی (شــێخ مــەحمود) کــردووە، بۆیــە فــەرمانی دەستگیرکردنی لە لایەن بەریتانییەکان لە شارەکە بۆ دەردەچێت، ئەویش لــە دوای زانــینی ئەو هەواڵە هــەولێر بەجێــدەهێڵێ و لەگــەڵ چــەند هاوڕێیــەکی ڕوو لــە دەشــتی قــەراج و کەندێناوە دەکات و لەوێ دەکەونە کەوتنە دژایەتی بەریتانییەکان[5].

---

چاوپێکەوتنەکە لەلای ناوبراو پارێزراوە" کەریم شارەزا، لــەیادی کــورد پــەروەرێکی لــەبیرکراودا...، برایــەتی "ڕۆژنامە" ژ( ٢٦٦٧)، هەولێر، ١٩٩٨"چــاوپێکەوتن لەگــەڵ هیمــداد لەشــکری رێکــەوتی ٢٠٠٧/٩/٢٢، ناوبراو کوڕی لەشکری عەزیزە، ئێستەش فەرمانبەرە بە پلەی بەڕێوەبەر لە وەزارەتــی ڕۆشــنبیری لــە شــاری هەولێر" چاوپێکەوتن لەگەڵ احمد عەزیز یوسف، ناسراو بەحاجی احمــد دارەتــوو، ٢٠٠٧/١٠/٩. نــاوبراو لــە ساڵی ١٩٢٦ لە دایك بووە، تائێستە لە ژیاندا ماوە، باوکی ئامۆزای (عــەلی مــەحمود کاکــەخان)ە" لــەتیف بەرزنجی، عەلی مەحمود کاکەخان و شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر، کوردســتانی نــوێ "ڕۆژنامــە"، ژ(١٠٧٢) ساڵی چوارەم، دووشەممە ١٩٩٥/٨/٢٨" عەباس سلێمان سمایل، بووژانەوەی ناوی جوگرافی دەشتی هــەولێر بــە ڵگەنامەی دوارۆژە، هەولێر"گۆڤار"، ژ(٧) هاوینی ٢٠٠٠، ل ٧٣.

(١) - کەریم شارەزا، لەیادی کورد پەروەرێکی لەبیرکراودا...، برایەتی "ڕۆژنامە" ژ( ٢٦٦٧)، هەولێر، ١٩٩٨.

(٢) - جەلال خدر، حاجی احمــدی جامبــاز....، ڕامان"گۆڤــار"، ژ(٧٦)، ل ١٢٦" جــەلال خــدر، دەروێــش رەمەزان....، رامان"گۆڤار"، ژ(٤٨)، ل ٢٤٩.

(3)- F.O, 371/4193,From Civil Commissioner,Baghdad, 27 Novmber,1919.

(٤) - چاوپێکەوتن لەگەڵ سەفیەی خێزانی عەلی مەحمود کاکەخان.

(٥) - جەلال خدر، حەسەنە شەل ... .

له دوای لەناوبردنی دەسەڵاتەکەی (شێخ مەحمود) لە ساڵی ١٩١٩دا، خەڵکی هەولێر بە شێوەیەکی گشتیی تووشی نیگەران و بێزاری بوون، چونکە ئەو هیوایەی کە بە شێخیان هەبوو پووکایەوە[(١)]. لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتووان و کەسایەتییە دیارەکانی هەولێر هاوسۆزییان بەرامبەر شێخ هەر مابوو[(٢)]. هەر بۆیە لە کاتی دوورخستنەوەی شێخ بۆ هیندستان و بەرزبوونەوەی دەنگی نارەزایی لە زۆرلاوە، دانیشتووانی هەولێر و بەتایبەتی پیاوماقوڵانی لەوانە (مەلافەندی، محەمەد موفتی هەولێر، مەلا محەمەدی کۆیە) بە مەبەستی ئازادکردنی(شێخ)، ئیمزایان کۆکردەوە و یاداشتێکیان پێشکەش کرد. لە لایەن خۆیەوە (مەلافەندی) بۆ چەند جارێك داوای ئازاکردنی (شێخ مەحمود)ی لە دەسەڵاتدارانی بەریتانی کرد، لە زۆر دیدار و کۆبوونەوەکانی لەگەڵیاندا ئەو داوایەی دووپات دەکردەوە[(٣)]. (ئەحمەد خواجە) لە یاداشتەکانیدا ئاماژە بەو یاداشتەی هەولێر دەکات کە بۆ ئازادکردنی (شێخ مەحمود) ئاراستەی کاربەدەستانی بەریتانی کرا[(٤)].

(شێخ مەحمود) دوای ئازادکردنی لە (٣٠)ی ئەیلولی ١٩٢٢دا گەیشتەوە شاری سلێمانی[(٥)]. لەو بارەیەوە (ئەحمەد خواجە) زانیاریی ئەوەمان دەداتێ، کە لە زۆرینەی ناوچەکانی کوردستان سەرۆك هۆز و پیاوماقوڵان بە بۆنەی پیرۆزبایی گەڕانەوەی، سەردانی شێخیان کرد، هەربۆیە خشتەیەك بۆ ڕێکخستنی وادەی سەردانەکان دیاری کرابوو، لەم چوارچێوەیەدا ڕۆژێك بۆ ئەو شاندانە دیاری کرابوو، کە لە ناوچەی هەولێرەوە هاتبوون، ئەوەیش بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

لە کاتژێر ٩ بەیانی بۆ ٩:١٥ بۆ سەرۆك عەشیرەتی خۆشناو.

لە ٩:٢٠ بۆ ٩:٣٥ بۆ دزەییەکان.

---

(١) - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی نورەدین دەباغ.

(٢) - کەریم شارەزا، پیاوی بەجەرگی دزەییان...، هەولێر "گۆڤار"،ژ(٤)، ل ٩٤.

(٣) - بەدرخان "ڕۆژنامە"ژ(٨٨)، کانوون یەکەم، ٢٢/١٢/٢٠٠٧، ل ١٩.

(٤) - س.پ، ب١، بەغدا، ١٩٦٨، ل ٧٢.

(٥) - ڕەفیق حلمی، یادداشت، ب ٥، ل ٣٢٣" بانگ کوردستان"رۆژنامە"،ژ(٩)، سلێمانی، ٨/١٠/١٩٢٢.

له ٩:٤٠ بۆ ٩:٥٥ بۆ گەردییەکان[١]. (ڕەفیق حلمی)یش دەڵێت:**"له هەموو لایەکی کوردستانەوە پۆل پۆل و دەستە دەستە ئەهالی و عەشائیر بە پێیان و بە سواری چوونەتە پێشوازی (شێخ مەحمود)"**[٢].

بەر لە گەڕانەوەی شێخ ژمارەیەك ئەفسەری کورد بۆ یارمەتی دانی لە (٢٥)ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٢ گەیشتنە شاری سلێمانی، یەکێك لەوانە (ئەوین ڕەواندزی) بوو[٣]، کە خەڵکی ناوچەیەکی سەر بە هەولێر بوو. دوای گەڕانەوەشی، (شێخ مەحمود) لە (١٠)ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا بەپێی فەرمانێکی حکومداری کابینەی حکوومەتی کوردستانی ڕاگەیاند[٤]. سەبارەت بە هەڵوێستی هەولێر لەم حکوومەتە لێتۆژێك ئاماژە بەوە دەکات لە ئەنجامە سەرەتاییەکانی هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی دامەزراندن لە ساڵی ١٩٢٣دا، حکوومەت بۆی دەرکەوت، کە هەولێر بەشداریی هەڵبژاردنەکان ناکات، لە بەرئەوەی بەشێوەیەکی گشتیی سۆزیان بە لای (شێخ مەحمود)ەوەیە، بەڵام حکوومەت هەوڵیداوە ئەو هاوسۆزیە بە ئاقارێکی دیکەدا ببات -وەك پێشتر باسمانکرد-[٥].

لە ساڵی ١٩٢٣دا دوای سەرهەڵدان و پەرەسەندنی بارگرژییەکانی نێوان شێخ و بەریتانییەکان و بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵە، (عەلی مەحمود کاکە خان) جارێکی دیکە لەگەڵ دەستەیەك لە سوارەکانی پەیوەندی بە شێخ کردەوە لە سلێمانی[٦]، لە شەڕێکدا لە ناوچەی سووورداش لەپاڵ هێزەکانی (شێخ مەحمود) جەنگا[٧] و بە فڕۆکە لە لایەن بەریتانییەکانەوە

---

(١) - احمد خواجە، س.پ، بەرگ١، ب١، ل ١٠٦. جێگەی سەرنجە ئەم سەرچاوەیە بەرواری ٢٩ی ئەیلولی دیاری کردووە، بۆ ئەم پێشوازی و چاوپێکەوتنە. بەڵام دیارە بەروارەکە هەڵەیە.چونکە وەك لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێدا، شێخ لە ٣٠ی ئەیلول گەڕایەوە شاری سلێمانی.

(٢) - یادداشت، ب٥، ل ٣٢٣.

(٣) - بانگ کوردستان"رۆژنامە" ژ(٤)، سلێمانی، ١٩٢٢/٨/٢٩.

(٤) - بانگ کوردستان"رۆژنامە" ،ژ(١٠)، سلێمانی، ١٩٢٢/١٠/١٥.

(٥) - بڕوانە: تەوەرەی دووەم لە بەشی دووەمی ئەم توێژینەوەیە.

(٦) - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی احمد ناسراو بە حاجی احمد دارەتوو" چاوپێکەوتن لەگەڵ سەفیەی خێزانی عەلی مەحمود کاکەخان.

(٧) - کەریم شارەزا، لە یادی کورد پەروەرێکی لە بیرکراودا...، برایەتی "رۆژنامە" ژ(٢٦٦٧).

بۆردومان کران. دوای پووکانەوەی هەوڵەکان ناوبراو بۆ ماوەیەك دەچێتە ناوچەی پشدەر و لە لای (بابەکر ئاغای پشدەری) دەمێنێتەوە، چونکە پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵیاندا هەبوو[1]. کە دەگەڕایەوە بۆ ماوەکانی پێشوو.

(عەلی مەحمود کاکەخان) دوای ئەوەی لەگەڵ دەستەیەك لە سوارەکانی دەگەڕێنەوە دەشتی کۆیە[2]، لەوێ لە ناوچەی (گۆپتەپە)ی دەشتی کۆیە پۆلیسی لێ ئاگەدارکرێتەوە[3]، هەربۆیە لە بناری دێدەوان لە نزیك شاخەپیسکە لەگەڵ هێزەکانی پۆلیس پێکدادان ڕوویداو بە هۆیەوە چەند پۆلیسێك کوژران[4]. لەم بارەیەوە سەرچاوەیەك ئاماژەیداوە، کە لەو پێکدادانە ٦ پۆلیس کوژراون و یاوەرێکی (عەلی مەحمود کاکەخان) بە ناوی (حوسێن سیان) کوژراو یەکێکی دیکەش بە ناوی (ڕەئوف ساڵح) برینداربوو[5]، بۆ ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیە هێزێکی پۆلیس لە شاری هەولێرەوە ڕەوانەکرا بوو[6]. سەرچاوەیەکی دیکە باس لەوە دەکات، کە (حوسێن سیان) لە شەڕێکی دیکە کوژراوە، کە لە گوندی میرەکان ڕوویداوە، لەو شەڕەشدا فەرماندەی مەفرەزەکەی حکوومەت بە ناوی (مەحمود شاکر) کوژرا[7]. بەڵام (عەلی مەحمود کاکەخان) و ئەو سوارانەی لەگەڵی دابوون خۆیان دەرباز کرد[8].

ئەو پێشهاتە زیاتر لایەنی بەریتانی و کاربەدەستانی خۆجێیی لێ تووڕە کردووە[9]، تەنانەت حکوومەتی عێراق جاڕی ئەوەیدا بە مردوویی یاخود زیندووی دەبێت (عەلی

---

(١) - عبدالله رسول پشدەری، یاداشتەکانم، بەشی یەکەم، چ١، دار الحرية للطباعة - بەغدا، ١٩٩٢، ل ٣٤" بیرەوەرییەکانی احمد حەمەئاغای پشدەری، ل ٤٧" چاوپێکەوتن لەگەڵ سەفیەی خێزانی عەلی مەحمود کاکەخان" چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی احمد دارەتوو.

(٢) - چاوپێکەوتن لەگەڵ هیمداد لەشکری.

(٣) - چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی احمد دارەتوو.

(٤) - طاهیر حەوێزی،س.پ، ب٢، ل ١٦٨" چاوپێکەتن لەگەڵ سەفیەخان.

(٥) - چاوپێکەوتن لەگەڵ احمد دارەتوو.

(٦) - طاهیر حەوێزی،س.پ، ب٢، ل ١٦٨.

(٧) - لەتیف بەرزنجی، عەلی مەحمود کاکەخان ... ، کوردستانی نوێ "ڕۆژنامە)، ژ (١٠٧٢).

(٨) - طاهیر حەوێزی،س.پ، ب٢، ل ١٦٨.

(٩) - چاوپێکەوتن لەگەڵ احمد دارەتوو.

مەحمود کاکەخان) بکەوێتە بەردەستیان[1]. بەڵام دواتر لە ساڵی ١٩٢٤ لە ڕێگای گەورە پیاوانی هەولێر و دزەییەکان بەتایبەتی (خورشید ئاغا) و (حوسێنی مەلا) و (خدری پاشا)، کە هەولێکی زۆریاندا، حکوومەتی عێراق لێبووردنی بۆ دەرکرد و گەڕایەوە گوندی مورتکە[2]. سەرچاوەیەکی دیکە ئاماژە بەوە دەکات، لە ساڵی ١٩٢٤ لەکاتی هاتنی (مەلیك فەیسەڵ) بۆ شاری هەولێر، (مەلافەندی) داوای لە مەلیك کرد لێبوردن بۆ (عەلی مەحمود کاکەخان) دەربکات، مەلیکیش ئەو داوایەی قبوڵکردو لێبووردنی بۆ دەرکرد[3]، جێی ئاماژەیە، ئەو پەیوەندییەی کە (عەلی مەحمود کاکەخان) و پیاوەکانی لەگەڵ (شێخ مەحمود) هەیانبوو لە ئەدەبی فۆلکۆری دەشتی هەولێر ڕەنگی داوەتەوە[4].

(عەلی مەحمود) لەمیانەی ئەو گفتوگۆیانەی کە بە مەبەستنی هاتنەوەی لەگەڵیدا ئەنجامدراوە، ڕەتیکردووە تەوە ئەو لیبوردنە بە تەنیا ئەو بگرێتەوە، بەڵکو داوایکردووە

---

(١) - چاوپێکەوتن لەگەڵ ئیحسان موفتی.

(٢) - کەریم شارەزا، لە یادی کوردپەروەرێکی لە بیرکراودا...، برایەتی "رۆژنامە" ژ(٢٦٦٧) " چاوپێکەوتن لەگەڵ سەفیەی خێزانی عەلی مەحمود کاکەخان.

(٣) - بەدرخان "رۆژنامە"، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئیحسان موفتی ، ژ(٨٨)، کانوونی یەکەم، ٢٠٠٧/١٢/٢٢، ل ١٩.

(٤) - لەم بارەیەوە لە بەیتی فۆلکلۆردا هاتووە:

گردی گر مەلای بەینە هەنجیرە

عەلی گاز دەکا هێ برا سابیرە

وەرە دانیشین بکەین تەگبیرە

لە تالعی من و تۆشێخ مەحمود گیرا

دەست لە کەلەپچە پێ لە زنجیرە

گردی گر مەلای بەشەنگەبییە

عەلی گاز دەکاهێ برام هادییە

تفەنگی گچك چاپ لە دوڕ دەستیە

لە بۆم بکوژە ئەو ئەفەندیە

عەباس سلێمان سمایل، بووژانەوەی ناوی ....، ل ٧٢.

سەرجەم ئەو پیاوانەی لەگەڵیدابوونە و بەشداریی بزووتنەوەکەی (شێخ مەحمود)یان کردووە، لێبوردن بیانگرێتەوە[1].

(شێخ مەحمود) لەو کاتەی لە (١٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی **١٩٢٣** بە مەبەستی بەدەستهێنانی یارمەتی، نوێنەری خۆی ڕەوانەی کۆنسڵخانەی روسیا لە تەوریز کرد، ئەوەی بە ڕووسەکان ڕاگەیاند کە بە مەبەستی دژایەتیکردنی بەریتانییەکان بانگەوازێکی بۆ هۆزە عەرەبەکانی دانیشتووی میزوپۆتامیا دەرکردووە و هەولێر و کۆیە، کەرکووك و کفری بەڵێنیان داوە، ئەگەر بێتوو شێخ دژی ئینگلیز ڕاپەڕێت تا (١٠) هەزار چەکداری دەدەنێ[2]. تەنانەت (شێخ مەحمود) دوای ئەوەی سێیەمین حکوومەتی ڕاگەیاند، لە (١٥)ی کانوونی دووەمی **١٩٢٣**، بە مەبەستی دانانی نەخشەی کار بۆ حکوومەتەکە، لەگەڵ (٤٣) سەرۆك هۆزی کوردی کۆبووە وە، کە چواریان لەوانە لە سەرۆك هۆزەکانی هەولێرو کۆیە بوون[3].

هەر سەبارەت بە هەڵوێستی هەولێر لە ڕاپەڕینەکانی (شێخ مەحمود)، دەبێ ئاماژە بەوە بکەین، کە لە هەندێ باردا کەسایەتییە دیارەکانی هەولێر ڕۆڵیان هەبوو لە چارەسەرکردنی کێشەکان لە نێوان شێخ مەحمود و دەسەڵاتدارانی بەریتانی و عێراق. لەمەشدا سوودیان لەو پەیوەندییە دۆستانە وەرگرتووە، کە لەگەڵ شێخدا هەیانبوو[4]. ئەوەش کاتێك هات، کە ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق (کورنوالیس) لە ساڵی **١٩٢٦** نامەیەکی ئاراستەی (مەلافەندی) کرد، تیایدا داوای لێکرد ڕۆڵی میانە گیری ببینێت بۆ چارەسەرکردنی پرسی (شێخ مەحمود)، هەر بۆیە ئەویش داوای پێشاندانی نیاز پاکی حکوومەتی عێراق کرد، بۆ چارەسەرکردنی ئەو مەسەلەیە، کە لەسەر بنەمای پارێزگاری

---

(١) - چاوپێکەتن لەگەڵ سەفیەی خێزانی عەلی مەحمود کاکە خان.

(٢) - د. ئەفراسیاو هەورامی، س.پ، ل ٢٩٦.

(٣) -د.کمال مظهر، کرکوك وتوابعها...، ج١، ص ١٧١.

(٤) - عزالدین ملافندي، مذكرات / بدون عنوان(مخطوط) ، ص١٨.لەلایەن (ئازاد)ی کوڕی پارێزراوە. عزەدین کوڕی مەلافەندییە لە ساڵی ١٩١٧ لە شاری هەولێر لە دایك بووە، بڕوانامەی ماستەر لە بواری ئابووری لە زانکۆی لەندەن وەرگرتووە، لە خولەکانی ١١ تا ١٦ نوێنەری هەولێر بوو لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، لە ساڵی ١٩٩٩ لە شاری هەولێر مردووە.

مافەکانی کورد و پاراستنی گیان و شەرەفی شێخ بێت. بۆ ئـەو مەبەسـتەش (مەلافەنـدی) دەستیکرد بە پەیوەندی و نامە گۆڕینـەوە لەگـەڵ (شـێخ مـەحمود) دا. دوای گەیشـتن بـە ڕێککەوتن، داوای لە وەزارەتی ناوخۆی عێراق کرد (ئەحمـەد عوسمـان)ی ئـامۆزی بکرێتـە موتەسەڕیفی سلێمانی، بۆ ئەوەی بتوانێت کارەکان بە شێوەیەکی باش جێبەجێ بکـات[1]. ئەوکاتیش (ئەحمەد عوسمان) لە نێو ئاپۆڕایەکی زۆری خەڵکی هەولێر بەرەوە سلێمانی بەڕێ کرا[2].

لەگەڵ گەیشتنی (ئەحمـەد عوسمـان) و دەسـت بـەکاربوونی وەك موتەسـەڕیفی لیـوای سلێمانی، هەوڵەکانی بە مەبەستی هێوکردنـەوەی ڕەوشـەکە خسـتەگەڕ و پەیوەنـدی بـە شـێخەوە کـرد[3]، لەبـەر ئـەوەی باسـی ئـەو هەوڵانـە دەکەوێتـە دەرەوەی چوارچـێوەی باسەکەمان، بۆیە بە پێویستی نازانین لێرەدا باسی بکەین.

---

(١) - فرهاد عوني، صفحات مجهولة من حياة النائب الاول لرئيس مجلس النـواب في العهـد الملكـي، طولان العربي"مجلة"، ع (٣٨)تموز ١٩٩٩، ص ٣٨.

(٢) - بـۆ زانیـاریی زیـاتر سـەبارەت بـە چـوونی احمـد عوسمـان و چـۆنییەتی پێشـوازی کـردن و پەیوەندیکردنبەشێخەوە بڕوانە: بەدرخان "مانگنامە"، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئیسحان موفتی ، ژ(٨٨)، ل ١٩.

(٣) - شێخ لەتیفی حەفید، س.پ، ل ١٦٤- ١٨٤.

## تەوەری سێیەم
## سەردانەکەی سمکۆی شکاك و کاریگەرییەکانی ئۆزدەمیر

سمایل ئاغا، کە ناسراوە بە (سمکۆی شکاك) کوڕی محەمەد ئاغای کوڕی عەلی ئاغایە سەر بە تیرەی (عەبدۆیی) یە، کە یەکێکە لە تیرەکانی هۆزی شکاك، لە ساڵی ١٨٩٥ لە دایك بووە[١]، بە هۆی پێگەی بە هێزی لە ناو هۆزەکەی، توانیوییەتی لە سەروبەندی جەنگی یەکەمین جیهانی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ڕابەرایەتی ڕاپەڕینێکی چەکداری لە دژی دەسەڵاتی ئێرانیدا بکات. تا ساڵی ١٩٢٢ (سمکۆ) زۆر سەرکەوتنی یەك لە دوا یەکی بە دەست هێنا، بە جۆرێك توانی پانتاییەکی فرەوان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بخاتە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیەوە[٢]. بەڵام ئەوە زۆری نەخایاند، لەشکری ئێران خۆی ڕێکخستەوە[٣] و هێرشی توندی بۆ سەر هێزەکانی(سمکۆ) دەستپێکرد، توانی زۆرینەی ئەو ناوچانەی کەوتبوونە ژێر دەستی (سمکۆ) داگیربکاتەوە، لە بەر ئەوە (سمکۆ) ناچاربوو بەرەو باکووری کوردستان بارەگەی تێکبنێت[٤].

هەرچەندە لەسەرەتای ڕاپەڕینەکە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، تورکیای کەمالی کۆمەکی پێشکەش بە (سمکۆ) کرد، بەڵام بە هاتنی ناوبراو بۆ ناوچەکانی باکووری کوردستان وەرگەڕانێك

---

(١) - ناوبراو ڕۆڵێکی بەر چاوی لە بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەبوو، هەر بۆیە کار بەدەستانی ئێرانی لە پیلانێکدا لە ساڵی ١٩٣٠ لە شاری شنۆ کوشتیان، بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە کەسایەتی و ڕۆڵی لە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی دا بڕوانە: یاسین خالد سردشتي، کوردستان الشرقية/ دراسة في الحركة التحررية القومية فيما بين الحربين، رسالة ماجستير، كلية الاداب/جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٩٥، ص٥٣ " سەعدی عوسمان هەروتی، بزاڤی ڕزگاری خوازی نیشتیمانی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات دا (١٨٨٠ - ١٩٣٩)، چ١، کۆڕی زانیاری کورد، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٦٢و دواتر.

(٢) - بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: محمد رسول هاوار، سمکۆ(ئیسماعیل ئاغای شکاك) و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٤٢١ و دواتر .

(٣) - د. ئەفراسیاو هەورامی، س.پ، ل ١٥٤.

(٤) - م.س. لازاريف، المسالە الكرديە ١٩١٧ -١٩٢٣، ت:عبدي حاجي، ط١، بيروت، ١٩٩١، ص ص ٢٣٩ – ٢٤٠.

لەم هەڵوێستەیان هاتە ئاراوە[1]. ئەوە تا تورکەکان لە غافلگیریدا هێرشیان بردە سەر بارەگەی (سمکۆ)، بە هۆیەوە چەند چەکدارێکی لەگەڵ یەکێ لە خێزانەکانی کوژران و (خەسرۆ)ی کوڕیشی بە بارمتە گیرا، هەروەها دەستیش بەسەر سامانەکانیدا گیرا. بەلاّم (سمکۆ) لەگەڵ هەندێك لە چەکدارەکانی توانیان بەرەو ڕەواندز خۆیان دەرباز بکەن. بەمەش تورکەکان ئامانجی سەرەکیی خۆیان لەو هێرشەدا نەپێکا ،چونکە مەبەستیان ئەوە بوو خودی (سمکۆ) لەناو بەرن[2].

هاتنی(سمکۆ) بە یاوەری (سەید تەها) بۆ ناوچەکە و ئاکنجی بوونی لە گوندی بەحرکەی ناو گەردییان، بۆ ئەو پەیوەندییە پێشیینەی نێوانیان دەگەڕێتەوە، بە تایبەتی کاتێك لە ساڵی ١٩٠٧دا (کاکل ئاغای گەردی) بەندیخانەی قەلاّتی هەولێری شکاند و ڕووی کردە لای (سەید تەهای) خەزووری (سمکۆ)، کە ئەویش پێشوازی گەرمی لێکرد، تەنانەت ڕۆڵی نێوەندیشی لە ئاسایی بوونەوەی پەیوەندی (کاکل ئاغای گەردی) و کاربەدەستانی عوسمانی لە هەولێردا بینی[3].

هەروەها (سمکۆ) و (ئەحمەد عوسمان)ی موتەسەڕیفی هەولێر پێشتر پەیوەندییان لەگەڵ یەکتر هەبوو، چەند نامەیەکییان لەگەڵ یەکتردا ئاڵوگۆڕ کردووە. لە یەکێك لە نامەکان (سمکۆ) بە (ئەحمەد عوسمان) دەڵێت: **"ئێوە جێگەی ڕێز و ڕەزامەندی حکوومەتی بەریتانین، بۆیە ئەو فرمانەتان [مەبەستی پۆستی بەڕێوەبردنی هەولێرە] پێ سپێردراوە"**، ئینجا داوای لێ دەکات هەوڵبدات، پەیوەندی دۆستایەتی لە نێوان ئەو (واتە سمکۆ) و بەریتانیا دابمەزرێت[4].

بەریتانییەکان هەوڵیاندا هێرشی کەمالی بۆ سەر (سمکۆ) و ئەو ڕق و کینەی بقۆزنەوە کە بەرامبەر بە تورکەکان هەیبوو[5]، هەربۆیە دوای گەیشتنی (سمکۆ) بۆ (بەحرکە) بەرپرسانی بەریتانی بڕیارياندا سەردانی بکەن و دیدارو وتووێژی لەگەڵدا ئەنجام بدەن. بۆ ئەو مەبەستە

(١) – لە بارەی هۆکارەکانی ئەم وەرگەڕانە بڕوانە: سەعدی عوسمان، بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتیمانی ...،ل ل ٨٢– ٨٣.

(٢) – محمد ڕەسول هاوار، سمکۆ... ل ٥٥٧.

(٣) – مەلامحمد علی علیاوەیی، غەم ڕەوێن، ل ٢٩٥" هۆشیار عەبدوڵلاّ، دزەیی...، ل ١٢٦.

(٤) – محەمەد ڕەسول هاوار، سمکۆ...، ل ٥٣٦.

(٥)– سەعدی عوسمان، بزاڤی ڕزگاریخوزای نیشتیمانی... ، ل ٨٤.

(لاین) و (ئیدمۆندس) راسپێردران سەردانی (سمکۆ) بکەن[١]، کە لەو ماوەیەدا لە گوندی (دێری)ی ناوچەی گەردیان بوو[٢]. هاوکات ڕۆژنامەکانی بەغداش ئەو هاتنەی (سمکۆ)یان بەبایەخەوە باس دەکرد[٣].

لە ڕۆژی شەشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٢دا، هەر یەك لە (ئیدمۆندس)، (کاپتن لاین)، (ئەحمەد عوسمان) و (چارلس لیتلڵدیل) بە سواری ئۆتۆمبێلێك بەرە و گوندی (دێرێ) بەڕێ کەوتن[٤]، جگە لە (سمکۆ)، (ئەحمەد ئاغا)ی برای و دوو سێ لەخزم و کەسوکارە نزیکەکانی و سوارەکانی لەوێ ئاکنجی بوون[٥]. بە مەبەستی دەستەبەرکردنی هێمنی و تەناهی لە بەرامبەر هەر چەشنە پێشهاتێك، (لاین) دوو مەفرەزەی پۆلیسی چەکداری لەگەڵ خۆیاندا برد و گردو تەپۆڵکەکانی شوێنی دیدارەکە بە تەواوی لە لایەن بەریتانییەکانەوە خرانە ژێر چاودێری[٦]. دیارە لە لایەن خۆیەوە (سمکۆ)ش بە ئاگاییەوە ساتوسەودایی‌کردنی لەگەڵ ئەو پێشهاتە دەکرد[٧].

هاوکات لەگەڵ ئەوەدا چەند فڕۆکەیەك لە موسڵەوە گەیشتنە هەولێر، تا بە مەبەستی وتووێژی زیاتر (ئیدمۆندس) و (سمکۆ) و (سەید تەها) ببەنە موسڵ و لەوێشەوە بیانگە بیەننە بەغدا. بەڵام (لاین) نایشارێتەوە، کە ئەو و (چارڵس) دەیانزانی، هەر دوو فڕۆکەخانەی موسڵ و هەولێر لە لایەن لیڤیە ئاسورییەکانەوە پاسەوانییەتی دەکران، کە زۆر تویێنووی خوێنی (سمکۆ) بوون، بۆ ئەوەی لە تۆڵەی (مار شەمعون)[٨]ی سەرۆکیان بیکوژن[١].

---

(١) - سیسیل ئیدمۆندس، س.پ،ل ٣٧٢" کاپتن لاین، س.پ، ل ١١٢.

(٢)- کاپتن لاین، س.پ، ل١١١.

(٣) - العراق "جریدة"، ع(٨١٣)، الجمعة ١٩ کانون الثاني ١٩٢٣.

(٤) - کاپتن لاین، س.پ، ل١١٢" نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردو عەجەم/ مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٤٥٩.

(٥) - محمد ڕسول هاوار، سمکۆ... ، ل ٥٧٤.

(٦) - کاپتن لاین، س.پ، ل١١١.

(٧) - کرێکار عبدالله حسین، کوردو ئاشووری، چ١، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ١٦٧.

(٨) - بنیامین مار شەمعون سەرۆکی ئاشورییەکان بوو، لە ١٧ی ئازاری ١٩١٨ لە لایەن سمکۆ کوژرا، کە ئەوەش مشتومڕی زۆری لەلای تۆێژەران دروست کردووە، سەبارەت بە هۆکاری کووشتنەکە بڕوانە: یاسین خالد سردشتي، صفحات

بەریتانییەکان دەیانەویست (سمکۆ) بکەنە داشی دامەی سیاسەتەکانیان لە ناوچەکەدا، هەربۆیە (سمکۆ)یان بانگهێشتی هەولێر کرد، هەندێ لە مێژوونووسان باس لەوە دەکەن، (سمکۆ) لە ترسی ئەوەی ئەو هەنگاوە پیلانێکی بەریتانییەکان بێت نەچووە هەولێر، بەڵکو چووە گوندی بەحرکە بۆ لای سەرۆکی هۆزی گەردی[٢].

بەڵام ئەو پێشهاتە لە بەڵگەنامە بەریتانییەکان بە شێوەیەکی دیکە باسی دەکرێت، ئەوەتا (ئیدمۆندس) دووپاتی ئەوە دەکاتەوە، کە ئەوانە ( واتە بەریتانییەکان) خۆیان رێگەیان بە (سمکۆ) نەداوە بێتە هەولێر و ئەوەش (سمکۆ)ی تورە کردووە[٣]. هەروەها نوێنەری باڵای بەریتانی لە بەغدا (پێرسی کۆکس) نامەیەکی ئاراستەی (چەرچل)ی وەزیری داگیرگاکان کردووە، لە بەشێکیدا هاتووە: **"نامەیەکی دۆستانەم لە (سمکۆ) وە پێگەیشت کە لە گوندێکەوە ناردوێتی لە ژووروی شاری هەولێر و لە نامەکەدا داوا دەکات رێگەی پێ بدرێت بێتە شاری هەولێر"**[٤].

لە گفتوگۆکاندا کە لە ماڵی (جەمیل ئاغای گەردی) بەرێوە دەچوون[٥]، کە زیاتر بە زمانی فارسی ئەنجامدەدران[٦]، (سمکۆ) داوای لە بەریتانییەکان کرد، یارمەتی و کۆمەکی بکەن بە

---

من تاريخ اشوريي كوردستان ابان الحرب العالمية الاولى/ تحقيق تاريخي عن اغتيال الزعيم الاشوري بنيامين مارشمعون من خلال النصوص التاريخية، دهوك ١٩٩٩، ص ٢٩" سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوزای نیشتیمانی...، ل ل ٦٦ — ٦٩".

(١) - کاپتن لاین، س.پ، ل١١١.

(٢) - نەوشیروان مستەفا، کوردو عەجەم...، ل ٤٥٩ " سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی نیشتیمانی...، ل ل ٨٤ — ٨٥. سەرچاوەك ئاماژەیداوە، کە سمکۆ لە لایەن احمد عوسمانەوە لەو پیلانە ئاگەدار کراوەتەوە، هەروەها بە جۆرێکی دیکە باس لە رووداوەکان دەکات، بەڵام بێ ئەوەی بەڵگەی مێژوویی بەدەستەوە بدات. بڕوانە: کرێکار عبداللە،س.پ، ل ل ١٦٧-١٦٨.

(٣) - سیسیل ئیدمۆندس، س.پ،ل ٤٧٠.

(٤)- نامەیەکی نوێنەری باڵای بەریتانی لە بەغدا (پێرسی کۆکس) بۆ (چەرچل)ی وەزیری داگیرگاکان ، (B.W.D-1922-948) ژمارەی نامەکە (NO.403-٧٨١). وێنەیەکی ئاراستەی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا کراوە. وەرگیراوە لە: محمد رسول هاوار، سمکۆ...، ل ٥٦٧.

(٥) - سیسیل ئیدمۆندس، س.پ، ل ٣٧٣.

(٦)- کاپتن لاین، س.پ، ل ١١٢..

مەبەستی دژایەتیی کردنی حکوومەتی ئێران، گووتی: ئەو بە هیچ شێوەیەك نەهاتووە بۆ ئەوەی بەریتانییەکان پەنای بدەن. ئەگەر داواکەی ڕەتکرایەوە ئەوا دەگەڕێتەوە ناو هۆزەکەی و تەقەلاکانی لەم بارەیەوە دەخاتەگەڕ[١]. لە بەرامبەردا (ئیدمووندس)و (لاین) ئامادەیی خۆیان پێشاندا، کە لە ڕووی مادییەوە هاوکارییان بکەن، بەڵام (سمکۆ) لە لایەن خۆیەوە ئەو داوایەی ڕەتکردەوە و ئەوەی خستەڕوو کە لەلایەن (شێخ مەحمود)ەوە (٥٠٠) لیرەی زێڕی بۆ نێردراوە، هیچ پێویستی بە پارە نییە[٢].

هەروەها بەریتانییەکان ئەوەیان خستەڕوو، کە (سەید تەها) دەکەنە فەرمانڕەوای ڕەواندز و (ئەحمەد)ی براشی لە ناوچەی هەریر، (سمکۆ) لەو دیدارەی کە (ئەحمەد تەقی) لەگەڵیدا ئەنجامی داوە، سەبارەت بەو کۆبوونەوەیە دەڵێت: بە بەریتانییەکانم گوت: **"من و (سەید تەها) کۆچەرین و لە دێریێ دانیشتووین، ئەو ناوچەیە لە شۆڕشا لەگەڵ ئێوەدا بووە. من بۆم ڕوونکردنەوە، ئەگەر راست دەکەن ئەبێ پێش هەمووشتێك سەربەخۆیی و ئازادی کوردستان بخەنە بەرچاو، پێکهێنان و دانانی خەڵك ئەبێ بەپێی ئارەزووی دانیشتووانی وڵاتەکە بێت نەك ئارەزووی من و تۆ، لام وایە، ئێوە نیازتان وایە کە بە قبوڵکردنی ئەو داگیرکردنانە ئێمە بکەن بە دوژمنی کوردەکانی کوردستانی خواروو و سووکمان بکەن لەناویاندا. لە بری دانانی حاکمی بۆ ڕەواندز و هەریر بۆ باسی تەرتیبات و تەشکیلاتی دامەزراندنی سەربەخۆی کوردستان ناکەن و بە نوێنەر نامنێرن بۆ لای (شێخ مەحمود) بۆ ئەوەی بەشداربێ لەم یەکێتییەدا، بەداخەوە زۆر بە ئەندێشەوە ئەڵێم داواکردنەکانت لە جێی خۆی نییە"**[٣].

(لاین) لە بەشێکی یاداشتەکەیدا ئاماژەیداوە کە ئەو گفتوگۆیە بە لای ئەودا گرنگی ئەو تۆی نەبوو، چونکە دڵنیا بوو لەوەی ئەگەر (سمکۆ) لەگەڵیاندا بهاتبایە دەکوژرا، لەلایەکی دیکەوە پێیوایە دانانی کەسێکی وەك (سمکۆ) کە ئەو بە( غەدار) وەسفی دەکات، هیچ سوودێکی بۆ ئەوان لێ نەدەکەوتەوە. لە ڕاستیدا ئەو دیدارەش، کە ئەنجامدرا لەسەر پێشنیازی

---

(١)- سیسیل ئیدمۆندس، س.پ،ل٣٧٣.

(٢)- بیرەوەرییەکانی احمد تەقی لەبارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمود و سمکۆ، جەلال تەقی ئامادەی کردووە و پەراوێزی بۆ نووسیوە،چ١، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ٦٠.

(٣) - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت کۆبوونەوە کە بڕوانە: هـ.س،ل ل ٦٠-٦٤ .

(لاین)ی ئەفسەری سیاسیی هەولێر نەبوو، بەڵکو (ئیدمۆندس) و (نۆئێل) ڕۆڵیان تێدا هەبوو. لەم بارەیەوە (کاپتن لاین) دەڵێ:

**"ئێمە لەسەر ئەوە ڕێککەوتبووین، کە مەسەلەکە گونجاودیکەی‌ن شێوەی لە نێوبردنی غەدارێکی دڵرەق دەبێت [مەبەستی سمکۆیە]، کە دڵی (٤٠) هەزار ئاسووری و تێکڕای کریستیانەکانی عێراق پێ ڕازیی دەکەین، هەروەها بیریشمان لەوە دەکردەوە ئەگەر چوونەکەیان بۆ بەغدا ڕەتکردەوە، بێنەو بەردەیەکی ئەوتۆی لەسەر نەکەین، تەنیا چاوەڕێی ڕەحمەتی خوا بووین بۆ مەیسەربوونی کارەکە"**[1]. بەڵام (ئیدمۆندس) و (نۆئێل) لە یاداشتەکانیاندا خۆیان لە قەرەی باسکردنی ئەو مەرامە نەداوە.

سەبارەت بە مەرامی بەریتانییەکان (سمکۆ) هەر لە دیدارەکەیدا لەگەڵ (ئەحمەد تەقی)دا دەڵێ:**"بەریتانییەکان لە هەمبەر سەربەخۆیی کوردەوە درۆ دەکەن، ئەیانەوێت هەموومان وەك (ئەحمەد عوسمان)ی موتەڕسەریفی هەولێر و (سەید تەها) و (بابەکر ئاغا) و ئەوسالی ئەوان خزمەتکاریان پێ بین و هاوڕێك لەگەڵ سیاسەت و بەرژەوەندیی خۆیان یاریمان پێ بکەن و کوردەکان بکەن بەگژ یەکدیکەی"**[2].

لەبەرامبەر ئەو داوایەی کە (سمکۆ) خستیەڕوو، دەستەی گفتوگۆکاری بەریتانی لە دێری ڕایانگەیاند: کە ئەو پرسە لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئەوانە، بۆیە گوتیان پێویستە بێیتە هەولێر و هەوڵ بدەین نوێنەری باڵای بەریتانیاش بێتە هەولێر، لەوێدا لەگەڵ ئەودا ئەو داوایانە تاوتوێ بکەن[3]. ئەوەش لەگەڵ قسەکانی (لاین) تێك ناکاتەوە، کە کووشتنی سمکۆی یەکلایی کردبووە.

(کاپتن لاین) ئاماژەی داوە، کە دوای کۆتایی هاتنی وتوێژەکان (سەید تەها) تا دوا ئاست لەباربوو، بەڵام (سمکۆ) بە بێزارییەکی گەورە ئامادەیی دەربڕی لە گەڵماندا بێت، دواتر لەسەر ئەو بنەمایە لە مەفرەزەکە جیابووینەوەو بە ئۆتۆمبێل ڕێگەمان گرتەبەر و چەند میلێك لە

---

(١) - کورد عەرەب...، ل ل ١١١_ ١١٣.

(٢)- بیرەوەرییەکانی احمد تەقی لەبارەی ...،ل ل ٥٩ - ٦٠.

(٣) - هـ.س، ل٦٠.

ڕۆخی چەمی بەستۆرِە بە ئاراستەی هەولێر دووركەوتینەوە و (ئەحمەد ئەفەندی)مان بە جێهێشت، تاوەكو یاوەری میوانەكان بكات[1].

(ئەحمەد تەقی) لە بیرەوەریەكانییدا دەڵێ: لەگەڵ ئەوەی (سمكۆ) بە هۆی دووژمنایەتیی ئاشووریەكان چوونە هەولێرو بەغدای ڕەتدەكردەوە، بەڵام دوای پێداگیرییەكی زۆر لە لایەن بەریتانییەكانەوە، (سمكۆ) ڕازیبوو بێتە هەولێر، بەڵام لەو كاتەی لەناو ئۆتۆمبێل لە ڕێگادابوون (ئیدمۆنس) بە ڕووسی لەگەڵ (سەید تەها) قسە دەكات و دەڵێت: **"لەگەڵ گەیشتینە هەولێر دەستبەسەری دەكەین [واتە:سمكۆ]"**، (سمكۆ)ش زمانی ڕووسی زانیووە، هەر بۆیە دەست بەجێ چەكی لەسەر شوفێرەكە داناوە و داوای وەستانی كردووە و دوایی (سمكۆ) بۆ بەحركە دەگەڕێتەوە و نایەتە هەولێر[2]. بەڵام ئەوەی لێرە جێگەی تێڕامانە ئەوەیە، ئایا بەریتانییەكان نەیاندەزانی كە سمكۆ چەند ساڵ لەگەڵ ڕووسەكان هامو شۆی هەبووە و ڕووسی دەزانیێ؟، ئەی ئەگەر (سەید تەها) رووسی بزانیێ؟ بێگومان ئەویش زانیوویەتی، ئینجا كێ دەڵێ ئەدمۆندس ڕووسی زانیووە، باشە بۆ ئەو قسەیە بە (سەید تەها) دەڵێت؟ ئەوانە هەمووی قسەكەی (ئەحمەد تەقی) ڕەت دەكەنەوە.

لە لایەكی دیكە (های) سەبارەت بە مەسەلەی هاتنی (سمكۆ) باس لەوە دەكات، كە (سمكۆ) هاتۆتە هەولێر و بۆماوەی [4] ڕۆژ لە شاری هەولێر ماوەتەوە و لەگەڵ (مەلافەندی) هاتووەتە لای و بە مەبەستی هێنانەدی كوردستانێكی سەربەخۆ داوای یارمەتی و كۆمەكی كردووە، هەر لە دیدارەكەدا (سمكۆ) باسی لە كزی پڕوپاگەندەی بەریتانییەكان دەكرد لە ئێران. (های) دەڵێت: ویستم باسی نیشتەجێكردنی ئاسوورییەكانی لەگەڵ بكەم، بەڵام بۆچوونەكانم لەگەڵیدا ڕێك نەبوون. لە كاتی دیدارەكەدا (سمكۆ) وێنەیەكی (سورمێ خانم) دەبینێت و بە (های) دەڵێت: ئەوە وێنەی كێیە؟ ئەویش لە وەڵامدا پێی دەڵێت: ئەوە (سورمێ خانمە). لەو كاتەدا (سمكۆ) هۆشداری ئەوەی دا، كە ئاسوورییەكان ناتوانن بەبێ جەنگ بۆ ناوچەكانییان بگەڕێنەوە، پرسیاری ئەوەی لە (های) كردووە: باشە ئەوانە، كە ئەوەندە بە پەرۆشن بۆ گەڕانەوە بۆ ناوچەكانییان ئەدی بۆچی ئەو خانمەی كە وێنەی لەسەر مێزەكەت دایە، پیلانی كوشتنی منی داناوە؟!. هەر لەم چوارچێوەدا لە (٢٠)ی مانگی ئەیلولی ١٩٢٠ لەگەڵ (های)دا دەچنە

(١) - كورد عەرەب...، ل ١١٣.

(٢) - بیرەوەرییەكانی احمد تەقی لەبارەی ...،ل ل٦٣ — ٦٤.

گوێڕ و لەوێ چاویان بە (عەقید نولدەر) دەکەوێت و لەگەڵیدا پێشهاتەکان بە دووقـۆڵی تـاوتوێ دەکەن. دواتر (سمکۆ) دەگەڕێتەوە بۆ هەولێر لەوێشەوە هەولێر بەجێدەهێڵێت[1].

بەڵام ئەو قسانەی (کاپتن های) لەگەڵ ساڵی هـاتنی (سمکـۆ) بـۆ هـەولێر یـەك ناگرنـەوە، چونکە (های) خۆی لە مانگەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٢٠دا هەولێری بەجێهشێتووە، لەکاتێکـدا ئەو سەردانەی (سمکۆ) لە ساڵی ١٩٢٢ بوو، بەڵام ئەو قسانەی (هـای) ئـەوە دەخەنـەڕوو، کـە ڕەنگەی (سمکۆ) پێشتر جارێکی دیکە سەردانی هەولێری کردبێت.

(ڕەفیق حلمی) لە بارەی هاتنی (سمکۆ) دەڵێت: **"ئینگلیزەکان لەو وەختە لەگەڵ (شـێخ مەحمود) لە گفتوگۆیەکی بێ سوود بوون و بێ هیوا بوون لێی، بەڵام ویستیان سوود لە هاتنی (سمکۆ) وەربگرن، بۆ ئەوەی نێوان (شێخ مەحمود) و (ئۆزدەمیر)ی[2] پێ تێك بدەن، هەربۆیـە وایان لە (سمکۆ) کرد بێتە هەولێر و لەگەڵ (شێخ مەحمود) بکەوێتە پەیوەندی"[3].**

دوای گەڕانەوەی (سمکۆ) بۆ بەحرکە، بەریتانییەکان کەسێکیان بـە نـاوی (عـزەت تۆپچـی) ناردە لای (سمکۆ)، هەوڵی زۆریان لەگەڵدا بۆ ئەوەی نەگەڕێتەوە و بچێتە هەولێر، بەڵام کـەڵکی نابێت، لەم بارەیەوە (ڕەفیق حلمی) ئاماژە بەوە دەکات، کە (عزەت تۆپچی) بە ناوی (سمکـۆ)وە بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ هەولێر کردووە. هەروەها قسەکانی (سمکۆ)شی بە تەلەگراف بۆ (شـێخ مەحمود) ڕەوانە دەکرد و شێخیش بەپێی مەرامی بەریتانییەکان وەڵامی (سمکۆ)ی داوەتـەوە[4]، داواشی لێکرد، بۆ گفتوگۆی زیاتر سەردانی سلێمانی بکـات[5]. دوای ئـەوە (سمکـۆ) چـووەتە

---

(١) - دبليو. هي، م.س، ج٢، ص ص١٦٥ -١٦٦.

(٢)- عەلی شەفیق ناسراو بە ئۆزدەمیر، بە ڕەگەز دەگەڕێتەوە سەر چەرکەسییەکانی میسـر، ئـەکادیمی سـەربازی تـەواو کردووە، بۆ ڕاکێشانی سۆزی هۆزە کوردییەکانی باشووری کوردستان لە حوزیرانی ١٩٢٢ هاتە ڕەواندز، توانی ژمارەیەك لە نەیارانی دەسەڵاتی بەریتانی لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و چەند ناوچەیەکیش دەست بەسەر دابگرێت. بۆ زانیـاری لـەبارەی چالاکییەکانی لە ڕەواندز بڕوانە: احمد حەمەدئەمین، رەواندز...، ل ل ٦٨ — ٨٠.

(٣) - ڕەفیق حلمی ،یادداشت، ب٦، ل ٣٤١.

(٤) - بۆ سەیرکردنی دەقی ئەو نامانەی لە نێوان سمکۆ و شێخ مەحمود ئالوگۆڕ کراون، بڕوانە: ڕۆژی کوردستان"ڕۆژنامە"، ژ٧)، سلێمانی، ١٩٢٢/١٢/٣٠.

(٥) - یادداشت، ب٦، ل ل ٣٤١ - ٣٤٢.

شەقلاوە [١]، دواتر چۆتە پشدەر و لەوێشەوە لە (٨)ی کانوونی دووەمـی **١٩٢٣** بـە مەبەسـتی دیـداری (شـێخ مـەحمود) گەیشـتە سـلێمانی[٢]، ئـەو سـەردانەی (سمکـۆ) بـۆ سـلێمانی لـە ڕۆژنامەکانی بەغداش دەنگدانەوەی هەبوو [٣].

ئەو ڕووداوانە هاوکات بوون لەگەڵ گەیشتنی (ئۆزدەمیر) بۆ ڕەواندز لە ناوەڕاستی حـوزیرانی ساڵی **١٩٢٢**دا[٤]، بۆ ئەوەی لەوێ بانگەشەی بۆ گێڕانەوەی ویلایەتی موسڵی بـۆ سـەر تورکیـا بڵاوبکاتەوە. دیارە ئەوەش کاریگەری خۆی هەبوو، تـوانی ژمارەیـەك لـە سـەرۆك هـۆزو پیـاو ماقوڵانی ناوچەکە لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و سـۆزیان بـەلای خۆیـدا ڕابکێشـت[٥]. بـۆ ئـەو مەبەستە پەیوەندی بە چەندین سەرۆك هـۆزو کەسـایەتی ناوچـەکە کـرد، کـە هـەولێریش لـەو چوارچێوەدا بەدەر نەبوو[٦]، چونکە هەوڵی دەدا هەولێر لە ناوچـەکانی دیکـەی ژێـر دەسـەڵاتی بەریتانیا دابڕێت. لەم سۆنگەیەوە کاری بۆ ڕووخاندنی ئەو پردەی پردێ دەکرد، کە ئەنجامـدانی ئەو کارەش هەڕەشەیەکی گەورە بوو، بێگومان ئیدارەی بەریتانی لە شـاری هـەولێر دەرکـی بـە هەستیاری ئەو کارە دەکرد و بە گرنگییەوە لێی دەڕوانی[٧].

(ئـۆزدەمیر) بانگەشـەی ئەوەشـی دەکـرد، کـە هێـزی دیکـەی تـورك بەڕێوەیـەو دێـت، بەریتانییەکانیش لە شارەکانی هەولێر و سلێمانی و کەرکووك وەدەر دەنـرێن[٨].هـەروەها هـانی هۆزەکانی دەدا، کە هێرش بکەنە سەر ڕێگەکانی گواستنەوە، ئەوەش کاریگەری لەسـەر خـراپ

---

(١) - بیرەوەرییەکانی احمد تەقی....،ل ٦٣ .

(٢) - رۆژی کوردستان"رۆژنامە"، ژ(٨)، سلێمانی، ١٩٢٣/١٠/١٠.

(٣) - العراق "جريدة"،ع(٨٧٦)، الثلاثاء ٣ نيسان ١٩٢٣. بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە چوونی سمکۆ بۆ سـلێمانی و چۆنییەتی پێشوازییکردنی بڕوانە: ڕەفیق حلمی، یادداشت، ب٦، ل ٣٤٣- ٣٤٥" ئاکۆ شوانی، س.پ، ل ل ١٧٨-١٨٩.

(٤)- سەبارەت بە هاتنی ئۆزدەمیر بۆ ڕەواندز بڕوانە: احمد حمەدئەمین، رەواندز...، ل ٥٧ و دواتر.

(٥) - کاپتن لاین، س.پ، ل ل ٩٢ -٩٣.

(٦) - رۆبەرت ئۆلسن، س.پ، ل ٢٨٣.

(٧) - کاپتن لاین، س.پ، ل ٩٣.

(٨)- قاسم خلف عاصي الجميلي، العراق و الحركة الكمالية ١٩١٩ –١٩٢٣، اطروحة دكتورا، كلية الاداب/ جامعة بغداد، ١٩٩٠، ص ١١٧.

بوون و ناسەقامگیری ڕەوشی شاری هەولێر هەبوو. بە تایبەتی، کە ئەوانەی لایەنگری تورك بوون، لە چاوەڕوانی هاتنی توركدا بوون[1].

لەچوارچێوەی هەوڵەکانی بۆ پەیوەندییکردنی بە سەرۆك هۆزەکانی هەولێر لە (٢٦)ی مانگی حوزیرانی ١٩٢٢، لە دوای گەیشتنی بۆ ڕەواندز بە ماوەیەکی کەم، (ئۆزدەمیر) نامەیەکی بۆ (ڕەسول ئاغا)ی دزەیی نارد، لە بەشێکی ئەو نامەیەدا هاتووە: **"سوپاس بۆ خواوەند ئێمە هاتینەوە بۆ ئەو ناوچەیە، تاوکو قاچی هێزە دەرەکییەکان کورت بکەینەوە، کە لێرەدا فەرمانڕەوایی دەکەن. بۆ ئەوەی وڵاتە پیرۆزەکان ڕزگار بکەین بە یارمەتی خوا و بە زوویی دەست بە ڕێکخستنی خەڵك دەکەین، بە مەبەستی بەشداریپیکردن لە ڕاپەڕینێکی گشتیی و سەرتاسەری. ئێستا ئێوە ڕادەسپێرم هەرکە عەمەلیاتەکانمان لە باکوور دەست پێ کرد، ئێوە لە ناوەوە هەڵمەت بکەنە سەر دوژمن، مادام ئێوە سەرۆکی هۆزبن، ئیدی ویلایەتی موسڵ دەخەینە گەڕ. من چاوەڕوانی ئێوەم لە کاتی گونجاودا. یارمەتییەك لە کاتی خۆی دا نەبێ، قازانجی نییە. من لەم بارەیەوە هیچ گفتێکم لە ئێوە ناوێ. پێشنیاز دەکەم لەگەڵ نێردراوەکەمان، کە ئەرکی سەرشانییەتی لە هەر جێگایەك بێ، بێتە خزمەتتان، دابنیشی. ئەو ئامانج و نەخشانەمانت بە درێژی بۆ باس دەکا و ڕوون دەکاتەوە. ئەگەر حەزتان لێ بێ، دەتوانن داوا بکەن لەگەڵ ئێمە لە هەر جێگایەکی بە گونجاوی دەزانی دانیشی**[2].

دیارە هەندێك لە سەرۆك و کەسایەتییەکان ئەوانەی لایەنگری گەڕانەوەی دەسەڵاتی تورك بوون، لە شاری هەولێرەوەو کۆمەك وپێداویستی وەك گەنم و جۆ، هەروەها چاو و شەکر و قوماشیان، کە لە بازاڕەکانی هەولێر و موسڵ و کۆیە کڕیووە ڕەوانەی لای هێزەکەی (ئۆزدەمیر) کردووە لە ڕەواندز[3].

(ئەحمەد پاشا) و (پیرداود ئاغا دزەیی)یش لەو کەسانە بوون، کە پەیوەندییان بە (ئۆزدەمیر)ەوە هەبوو، تەنانەت پەیوەندییان هەبوو بەوانەی، کە هەوڵی دابڕینی هەولێریان دەدا. دوای ئەوەی دەسەڵاتی بەریتانی لە هەولێر لەم بارەیەوە زانیاریی پێ دەگات، دەست

---

(١)- م.ن، ص ١١٩.

(٢) - ڕۆبەرت ئۆلسن، س.پ، ل ل ٢٨٣-٢٨٤.

(3)-Frotnightly Report For Arbil Liwa 1923 , S /48/2/0

م. ح.و. ملفات وزارة الداخلية العراقية، تسلسل ٢٧٢٠

بەجێ لە لایەن (کاپتن لاین) پیلانێك بۆ گرتنیان دادەنرێت، ئیتر لە ڕێگای (ئەحمەد عوسمان)ەوە سەرانی دزەیی بانگهێشتی ئۆفیسی خۆی کرد، کە گەیشتنە ئەوێ، دوادیکەش (ئەحمەد پاشا)و (پیرداود ئاغا دزەیی) دەستگیرکرد و ڕەوانەی موسڵی کردن و لەوێش دوورخرانەوە بۆ فەڵەستین[1].

لە لایەکی تردا، هاتنی (سمکۆ) بۆ باشووری کوردستان (ئۆزدەمیر)ی تووشی دڵەڕاوکێی زۆر کرد، هەربۆیە (ئۆزدەمیر) لەو نامانەی، کە لەگەڵ کۆمەڵەی (کەرکووك مدافعە حقوق جمعیتی)[2] ئاڵوگۆڕی کردووە، مەترسییەکانی (سمکۆ)ی خستۆتەڕوو، ئەوەتا لە یەکێك لە نامەکاندا دەڵێت:

**"ئەو نامانەی، (سمکۆ) بۆ سەرۆك عەشیرەتەکانی کوردی نارد بوو، لە ڕێگە کەوتە دەست ئێمە، بەڕاستی (خیانەت و جینایەت) هەر ئەوەندە ئەبێ (سمکۆ) لەم نامانەدا دەڵێ: بەو هێزەی، کە لە هەولێر و سلێمانی پێکەوەی ئەنێم و پەلاماری تورکەکان (ڕەواندز) ئەدەم، ئێوەش بە خۆتان و عەشائیرتانەوە بە ڕووالەت بۆ کۆمەکی تورکەکان و یارمەتیدانی ئەوان بچنەلای (ئۆزدەمیر) بۆ ڕەواندز و بیگرن، دوای ئێوە منیش بەهێزەکەی خۆمەوە هەڵ دەکوتمە سەر( ڕەواندز) و هەر زابت و عەسکەرێك لەوێ بێ ئەیانکوژین و شارەکە لەتورك پاك ئەبێتەوە"**. بەڵام لێتۆژێك ئاماژەیداوە، کە ئەو نامەیە دەستکردی ئینگلیزەکان بووە، بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوانیان تێك بدەن[3].

لەگەڵ ئەوەشدا بەشێك لە کەسایەتییەکانی هەولێر بە تایبەتی ئەوانەی لایەنگری بەریتانی بوون لە سەرووی هەموویانەوە (مەلافەندی) و (ئەحمەد عوسمان)ی موتەسەڕیف و (خورشید ئاغای دزەیی) و (حوسێنی مەلا)، بە توندی گەڕانەوەی تورکیان بۆ هەولێر ڕەت دەکردەوە، چونکە لایەنگرانی بەریتانی دەیانزانی بە گەڕانەوەی تورك بۆ هەولێر چارەنووسیان دووچاری

(١) - بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت چۆنیەتی دوورخستنەوەیان بڕوانە: کاپتن لاین، س.پ، ل ل ٩٣ -٩٥.

(٢) - کۆمەڵی کەرکووك مدافعە حقوق جمعیتی لە لایەن ئەو کەسانە دامەزرابوو، کە خۆیان بەتورك دانا بوو. ئەمە لەسەر شێوەی کۆمەڵەکانی بەرگری کردن لە ویلایەتەکانی تورکیا بوو، کە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی دامەزران و دواتر بوونە بناغەی دامەزراندنی بزاڤی کەمالی. احمد حەمەد ئەمین، ڕەواندز...، ل ٧٧ .

(٣) -محمد رەسول هاوار ، سمکۆ...، ل٥٩١.

مەترسیی دەبێتەوە[1]. دوای ئەوەی بەریتانییەکان بە تەواوی هەستیان بەمەترسییەکانی (ئۆزدەمیر) کرد لەو ناوچانە، بەتایبەتی کاتێك پەیوەندییەکانی لەگەڵ (شێخ مەحمود) بەهێزببوو و شاندی نێوان هەردوولا سەردانی یەکدیکەیان کردبوو[2]. دوای ئەنجامدانی چەند کۆبوونەوەیەك، لە (١٠)ی نیسانی ساڵی ١٩٢٣دا، هێزێکی زۆر، کە بەشێکیان لەموسڵەوە گەیشتبوونە هەولێر[3]، بە دوو ئاراستە بەرەو ڕەواندز ڕەوانەکران: هێزی یەکەم بەشێوەیەکی سەرەکیی لە سەربازی بەریتانی پێکهاتبوون، لە ژێر فەرماندایەتی (کۆلۆنێل ڤینسینت) بوون، هێزی دووەمیش کە زۆرینەیان هێزی لیڤی بوون[4]، ئەو هێزەش لەژێر فەرماندەیی (عەقید دۆبین- Dobbin) بوون. کە یەکەمیان لە کۆیەوە، ئەوەی دیکەیان لە هەولێرەوە بە ئاراستەی ڕەواندز و بە پاڵپشتی هێزی ئاسمانی هێرشیان برد[5]، لە ئەنجامدا توانییان لە (٢٢)ی نیسانی ١٩٢٣دا ڕەواندز داگیر بکەن. ئەوەش پێش ڕۆژێك لە دەستپێکردنی کۆنگرەی دووەمی لۆزان هات[6]. (ئۆزدەمیر)یش بەبێ ڕووبەڕووبونەوە هەڵات و ڕەواندزی بەجێهێشت، ئیتر (سەید تەها) کرایە قائیمقامی ڕەواندز[7].لە ئەنجامی ئەو پێشهاتانەش گۆڕانێکی ڕیشەیی لە ڕەوشی دەڤەرەکە ڕوویداو هەلومەرجێکی باشدیکەی لە ڕووی ئاسایشیەوە هێنایە دی[8]، بەمەش قۆناغێکی نوێ لە ناوچەکە دەستی پێکرد.

---

(١)- ارنلود ویلسن، م.س، ص١٢١.

(2)- Report On Iraq Administration For The Period 1922 – 1923, P 36

رمزی قەزاز" بزووتنەوەی سیاسی و ڕۆشنبیری کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەمەوە تا ناوەڕاستی چەرخی بیست، ١٩٧١، ل ١٧٩ و دواتر .

(٣) – سەبارەت بە وردەکاری چۆنییەتی ئامادەکردنی هێزەکان بڕوانە: کاپتن لاین، س.پ. ل ١٢٥ و دواتر.

(٤) – کە لە کورد و ئاشووری پێکهاتبوون.لاین، س.پ، ل ١٢٥.

(٥) – جي. براون،م.س، ص ١٠٩.

(٦) – قاسم الجمیلي،م.س،ص ١٢٣" کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەم دا، و: حەمە کەریم عارف،چ٣، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٨٣.

(٧) – العراق"جریدة"،ع(٩٢٣)، الاربعاء ٣٠ ایار ١٩٢٣" لە بارەی ڕەواندز لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی سەید تەها بڕوانە: احمد حەمەدئەمین، ڕەواندز...، ل ٨٤ و دواتر.

(٨) – العراق"جریدة"،ع(٩٢٤)،الخمیس ٣١ ایار ١٩٢٣.

زۆری نەبرد نوێنەری باڵای بەریتانی گەیشتە هەولێر و بــە یــاوەری (لایــن)، بــە مەبەســتی بەسەرکردنەوەی ناوچەکەو لەنزیکەوە ئاگەداربوون لــە ڕەوشــی لیــوای هــەولێر، گەشــتێکی بــۆ ناوچەکانی هەولێر و ڕەواندز دەستپێکرد[1].

(١) - بۆ زانیاری سەبارەت بەم سەردانە بڕوانە: کاپتن لاین، س.پ. ل ل ١٤٥ - ١٥٩

